KARWAN

# کاروان



کۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی و رۆشنبیرییە
وەزارەتی رۆشنبیریی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەری دەکات



خووولی راپەرین

گۆڤارێکی مانگانەی
ئەدەبی و رۆشنبیرییە
وەزارەتی رۆشنبیریی حکومەتی
هەرێمی کوردستان دەری دەکات


# گاروان KARWAN


(١)
خوولی راپەڕین


لەم ژمارەیەدا




سەرنووسەر
شێرکۆ بێکەس

جێگری سەرنووسەر
ئەحمەد سالار

سکرتێری نووسین
کەریم دەشتی

دەستەی نووسەران
کەریم شارەزا
عبدالله قادر گۆران
صلاح عومەر
قوبادی جەلی زادە
خالید جوتیار

سەرپەرشتی هونەری /
نامیق عەلی قادر

ناوونیشان
هەولێر/ وەزارەتی رۆشنبیری
هەرێمی کوردستان

چاپخانەی رۆشنبیری

(ت ٢٢٦٥٨)



# چەمكی ژمارە

خوێنەری ئازیز

● راپەرینە شکۆدارەکەی بەهاری ۱۹۹۱ بۆ هەموو خەڵکی دونیای سەلماند کە گەلانی ژێر دەستەو ستەمدیدە هەرکاتێك تین و ئاوی ئازارو جەزرە بەو راونان زۆریان بۆ هێنابن و تەنگیان پێ هەڵچنی بن، ئەوە لە هێزو برستیان دابووە کەتەخت وتاراجی زۆردار وداگیرکەران تارومار بکەن و ریانبماڵن، ئەمەشیان راستیێکی مێژوویی سەقامگیرە، دەبێ رووبدات، هەر ئەو راپەرینە سەرتاسەریەی خەڵکی کوردستان بوو کە درندەترین سیستەمی داپڵۆساندنی بەغدای راوناو سەرزەمینی کوردستانی لە ئاسەواری ئالاو یان پاك کردەوە، لەراستیدا راپەرینی بەهاری ۱۹۹۱ ئەزموونێکی شۆرشگێری دەگمەنە لە مێژووی خەباتی نەپساوەی میللەتە قارەمانەکەمان دا.

● هەر لە دوای ئەم راپەرینەوە بوو خەباتی سیاسی میللەتەکەمان کەوتەنێو قاوغێکی دیکەی شۆرشگێری، قۆناغی دامەزراندنی دام و دەزگای تازە، دام ودەزگایێك کە دەربڕی ئاوات و ئارەزووەکانی میللەت بێ، لەکەش وهەوای ئازاددا لەدایك ببێ ونەش و نەما بکات، بۆ ئەم مەبەستەش بریاری هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان یەکێکە لە بە جورئەتترین بریاری ئەم سەردەمە لە رۆژهەڵاتی ناوەراست، چونکە لەگەڵ بوونی رژێمێکی درندەی بێ نمونە خەڵکی قارەمانی کوردستان بریاریان دا کە پەرلەمانی خۆیان هەڵبژێرن بۆ ئەم مەبەستەش، گەورە وبچووك، پیرو جحێل بە دەوری سنوقەکانی هەڵبژاردن کۆبوونەوە، کۆبوونەوەیەك کە لە دونیا دا نمونەی نیە، بەمجۆرە کورد گەورەترین وسامناکترین مشتەکۆڵەی نایە تەبەشی رژێم و وردو خاشی کرد.

● دەرچوونی ژمارە (۱)ی خولی راپەرینی گۆڤاری کاروان لە کات وساتێکی ئاوادا و لە بارێکی پر لە ئازادی ئاوادا، دەبێ ئەرك وپەیامەکانی چی بێت بۆ ئەدیب و رۆشنبیرانی کورد؟

ئێمە لەلای خۆمانەوە پێمان وایە پرۆسەی رۆشنبیریی پرۆسەیێکی شارستانی بەهێزە وکاریگەریتی خۆی بەسەر هەموو لایەنەکانی دیکەی ژیان دەسەپێنێ، بۆیە دەبێ ـ کاروان بەردی بناغەی سیستەمێکی رۆشنبیریی ئەبستمۆلۆژی جۆراو جۆر دابرێژێت وخەڵکی لەو بابەتانە رابهێنێت کەوایان لێ بکات قووڵ بیربکەنەوە، بەقووڵی بابەتەکانیان دابرێژن، هۆیەکیش بێت بۆ ریشەکێش کردنی تۆوی پاشاگەردانیی نێو رۆشنبیریی کوردی.

● ئەو بابەتانەی لەمەودوا گۆڤاری کاروان باوەشیان بۆ دەکاتەوە، دەبێ بابەتی جۆراو جۆری بەپێزو بە برشت بن، لە سێبەری بابەتی ئەبستیمی، مەعریفی، ئاوی کەلەپورو فولکلۆرو شیعرو چیرۆك ولێکۆڵینەوەی رۆژگاریان خواردبێتەوە، واتە هەوڵێك بێ لە پرۆژەی دامەزراندنی رۆشنبیریی کوردی.

ئێمە لەلای خۆمانەوە هەوڵ دەدەین گۆڤاری کاروان وەك گۆڤارێکی کلتوری جۆراوجۆر بخەینە بەردەستی ئێوەی ئازیز، پێمان وایە گۆڤارێك کەمانگانە دەربچێت دەبێ



بەهـایـەکی ڕۆشنبیری تێرو تەسەلی تێدابێت بۆ ئەوەی بتوانین بچینە بنج و بناوانی هەموو ئەو بابەتانەی کە دەگمەن و جاویدانن، هەر بۆیەش بایەخ بەوە نادەین کە ئاخۆ بابەتەکە کورتە یاخود درێژە، بە پێوەرێکی دارێژراو لە دیـدگاییکی داهێنەرانەو خوڵقێنەرانە دا مامڵەتیان لە گەڵدا دەکـرێت، لە ئەدەب و ڕۆشنبـیریی کوردیدا زۆر بابـەتی گرینـگ هەبوون دەرگایان لێ نەدەکرایەوە، زۆر بابـەتیش هەن هێشتـاکـە نەکـەوتـوونـەتـە ئاسـۆی بزوتنەوەی ڕۆشنبیری کوردی، جا بۆ ئەوەی گۆڤارەکەمان تەوژمـێکـی پێشـەنـگ ئامێـزو بەرایی دۆزینـەوەی نهێنییەکانی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی بێت. ئەوە دەبێت خۆمان لە قەرەی ئەو جۆرە بابەتانە بدەین، هەر بۆیەش ئەرکی سەرشـانی هەموو نووسەرانە بەشداری بکەن لە مشت و ماڵ کردن و تێروتەسەل کردنی ئەم گۆڤارە.

ئەو بابـەتـەنـانەشن کە ئاو لە بەهای جوانیو دیدگای گەورە دەخـۆنـەوە بزوتنـەوەی ڕۆشنبـیری لە دونیـادا ئێستێکـە لە سنوری شێوازو ناوەڕۆکێکی ئەپستمولۆژی گەورەدا دەجـولێتەوە، کایەکانی پێشوو گۆڕلوەو کایەی مەعـریفیو ئارکیـولۆژیو ئەنثـروپـولوژیو سۆسیـو

ڕۆشنبـیری تازە یرێت ئامێز سەریـان هەڵداوە، دەبێ ئێمەش دوورە پەرێز نەبین و لە دەرەوەی میکانیزمی ئەو ئەقلانیەتە نەوەستین بەڵکو تێکەڵ بە نهێنییەکانیان بین، دەقە ڕۆشنبیرییەکان هەر لە شیعرەوە بگرە تا دوا داهێنانی دەقە سیاسییەکان لە نێو سەرجـەمی ئێستـای ڕۆشنـبـیری کوردی هەن، پێـویـسـتـە دەست بە بڵاوکردنەوەیان بکرێت.

● ئێمە زیاتر بایەخ بە ناوەڕۆکی گۆڤارە کە دەدەین، بۆیە سەبارەت بە ناوی گۆڤاری (کاروان) ئایا هەرگیز خۆی بمێنێتەوە یا خود نا، دەبێ ئەوە بڵێین کەوا گۆڤارو ڕۆژنامەی دونیا هەن لەگەڵ گۆڕانە سیـاسیـەکـانیش دا ناوەکـانیـان هەروەک خۆی ماونەتەوە لەم بارەشەوە نموونەمان زۆرە.

● ئەم ژمـارەیـەی بەردەستـتـان سەرەتـای ڕووەو ئاینـدەمـانە بە هاوکاری ئێوەی ئازیزو خۆشەویست دەگەینە ئاوات و ئارەزووەکانی ڕۆشنبیریمان.

# چۆن لە ڕۆمان بگەین؟

دکتۆر هیوا عمر احمد

کۆڵن ویلسون ئەڵێت: « ئێمە ئەڵێین کە داروین ومارکس و فرۆید، رووی شارستانی رۆژئاوایان گۆری، بەڵام کاریگەری رۆمان بە تەنیا، لە کاریگەری هەر سێکیان پێکەوە گەورەتر بوو»[1]. گەر رۆمان هێندە گرنگ و بەکاربێت ئەبێت قوڵتروفرانتر باس بکرێت وتان و پۆی بکەین. ساڵی (١٩٨٨) بە ساڵی سەر هەڵدانی رۆمانی کوردی ئەزانرێت. گەرچی بەبیروڕای من لەمەوبەر دوو رۆمانی ترمان هەیە، کە بریتین لە «ئاسۆس» کە بەزمانی عەرەبی نوسراوە و بڵاوکراوە تەوە و هەروەها رۆمانی «ژانی گەل» کە پێویستی بە پێناسەنی‌یە، کەواتە هونەری رۆمان نوسین، لە ئەدەبی کوردی دا تەمەنی لاوێکی هەیە نەک ساوایەک ، جگە لەوەی لەبەر هەرچ هۆیەک بێت نوسەری ئەو رومانە دێرینە تاقانانە لە رۆمان نوسین دا بەردەوام نەبوون، ئەشێت ئەمەلای نەوەی نوێ و رۆشنبیرە لاوەکان ئاشکرا نەبێت.

پێش هەموو شتێك ئەبێ ئەوە بڵێم کە جیاوازی نێوان چیرۆك و رۆمان بە کورتی و درێژی‌یەکەی نی‌یە... بۆ نمونە چیرۆکی درێژی چەند سەد لاپەرەیی لە هەموو ئەدەبێك دا هەیە، لای خۆمان با «مەسەلەی ویژدان»ی « احمد مختار جاف»بە نمونە بهێنینەوە، لە هەمان کات دا لە هەموو ئەدەبێك دا رۆمانی وا هەیە لاپەرەکانی لە سەد لاپەرە تێ ناپەرێت، بۆ نمونە رۆمانی « الوشم»ی عبدالرحمن مجید الربیعی کە نزیکەی (٩٠) لاپەرەیەو رۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی (ماتیلدا غالیاردی)، دکتۆرای لە زانکۆی (ڤینیسیا)، لەسەر وەرگرتووە.[2]

هەروەها رۆمانی «سەد ساڵ دابران»ی گابریل مارکیز بەیەکێ لە رۆمانە سەرکەوتووەکانی جیهان دائەنرێت.

بەڵکو جیاوازی نێوان چیرۆك و رۆمان ، لە قوڵ بوونەوە ولایەنە دەروونی و فەلسەفی‌یەکەی دایە «رۆمان بریتی یەلە هەوڵێك بۆ دروست کردنی ئاوێنەیەك، رۆمان نووس خۆی تیا ببینێت و لەبنەرەت دا هەوڵێکە بۆ خوڵقاندنی خۆیەکی»[3] بێ گومان ئەم ئاوێنەیە بریتی‌یە لەوکەلەبەرەی رۆمان نوس،

جیهانی لێوە ئەبینێت و شوێنی خۆی لەم جیهانەدا پێ دیاری ئەکات و لەو ئاوێنەدا خەونەکانیمان بۆ باس ئەکات و ژیانمان بۆشی ئەکاتـەوە، ئەم بوارە فەلسەفی و دەروونی‌یە فراوانە لە چیرۆك دا ناگونجێت.

گەر چیرۆکێـك بخـوێنێتـەوە ئەشێت تا ماوەیـەکی زۆر، پاڵەوانـەکـانی لەگـەڵتا بژین، خۆشت بووێن یان ڕقت لێ یان بێتەوە، بەڵام کە ڕۆمان ـ ێك ئەخوێنیتەوە هەست بە دوو دڵی و هەژان و شادی و خۆشی یان سوکـوارێکی تاڵ ئەکـەیت، گەر بابەتەکە لە ناخەوە هەژاندیتی وشتێکی نوێی پێ گەیاندی یان بڵێم وای لێ کردی هەست بە شتێك بکەیت لەوەو بەر هەستت پێ نەکرد بێت ئەوا، تووشی دڵەڕاوکێ ئەبێت و ئەهەژێت و ئەت خاتەبیرکردنەوەو گەر هێدی وورد وبەتێگەیشتنەوە خوێندبێتەوە ئەوە کار لە دەروون و تێ نوارینـە فەلسـەفیـەکانت ئەکات. هەست ئەکەیت شتێکت تیا گۆڕا، یان ڕەگی بیروباوەڕێکت پتر خۆی لەزەوی ناخت گیر ئەکـات . وەئـەگەر خۆت لە ئاوێنەی ڕۆمانەکەدا دی‌یەوە، ئەوا دوورنی‌یە هەست بە خۆشی‌یەك یان شادی‌یەکی بێ پایان بکەیت، چونکە داوێکت ئەکەوێتە جوڵان و لەرزە کە بەکاتە خۆشەکانی ژیانتەوە ئەبەستێتەوە.

بۆ نمـونـە کە چیرۆکەکانی (غسان کنفانی) ئەخوێنیتەوە، تاماوەیەکی درێژ لەگەڵ پاڵەوانەکانی دا ئەژیت ولەبەر چاوو لە دڵت دا ئەژین، یان لە چیرۆکی کوردی دا، ئەڵێم «١٥» ساڵ ئەبێت چیرۆکی «چای شیرین»ی (حسین عارف) م خوێندۆتەوە، تا ... ئێستاش کە چایەکی تاڵ یا شیرین ئەخۆمەوە ئەو پاڵەوانە پاڵەیەم بیر ئەکەوێتەوە کە چا شیرینەکەی بۆتێ کرا، بەڵام ئەم چیرۆکـەو چیرۆکەکانی (کنفانی) چی‌یان لە بیرو ناخم گۆڕی، ئەتوانم بڵێم هیچ، بەڵام خۆشی‌یەکی کاتی یان درێژ خایەنیان پێ گەیاندم.

بە پێچەوانەوە، کە ڕۆمانێك ئەخوێنیتەوە، هەست ئەکەیت، لەناخەوە شتێکت تیا ئەگۆڕێت، یان ئەهەژێت. بۆ نمونە، ڕۆمانی «ئاسۆس» ئەو خاڵەی بۆ سەلماندم مرۆڤ کاتێك هەست بەنـرخی شتێـك ئەکـات، کەلەدەستی ئەدات یان لێی دوور ئەکەوێتەوە ... وکە مرۆڤ لە زێدەی خۆی هەڵئەکەندرێ، تامی هەمـوو شتێکی لە دەم دا تاڵ ئەبێت و واهـەست ئەکـات لە بۆشایی دا، وەك پنتە تۆزێك بێ شوێن پێ و نامۆیە ولانەوازە. خەوو خۆراکی گەرانـەوەیـە بۆ ئامێـزی گەرمی دایکەزێدەی وبەهەزاران داوی ئەفسانەیی‌وە بە هەموو بەردو کەندو لەندو جۆگەو جۆبارێکەوە بەندەو ڕایئەکێشن.

**لە ڕۆمانی «الحرب والسلام»دا، ئەفرەت لە هەموو جۆرە چەکێك ئەکەیت کە شاران وێران ئەکاو مناڵ هەتیو ئەخاو تەرووشك پێکەوە ئەسوتێنێ و ئەوەشت بۆ دەرئەخات کە جەنـگ چۆن پاش دامەرکانەوەی کلپەکەشی تا چەندەها ساڵ کاریگـەری هەر ئەمێنێ و بەکـورتی لەگـەڵتا هاوار ئەکات بۆ ئاشتی و شکاندنی هەموو چەکێك.**

**ڕۆمـانی (الشیـخ والبحـر)ی هەمـەنگوای ... گەورەیی وەمەزنی ئەم مرۆڤە کورتە بنەیەت بۆ دەرئەخات بەرامبەر دێـوی چەتەوڵی سروشت، مرۆڤ و سروشت گەرچی بێ یەك نایان کرێ، بەڵام هەردەم لە ملمالانێ دان و سەرکەوتن هەر بۆ ئەم مرۆڤە کورتە بنەیەیە.**

**لە ڕۆمـانی (ژیانەوە ـ البعث)ی (تۆلستۆی) دا بڕوا ئەهێنێت کە هەموو شتێك ڕێژەیی یەوشتی ڕەهانی‌یە. چ خۆشی و چ ناخۆشی.**

**هەروەها هەمووشتێك لە مرۆڤ و سروشت دا لایەنی چاکە وبەدکاری تیایە. ئەشێت لایەنێك بەسەر لایەنەکەی تردا زاڵ بێت، بەڵام گەر شوێنکـات لەبـاربێت لایـەنـە ژێـر کەوتووەکە، دەرئەکەوێ و ئەشێت شوێنی لایەنە زاڵەکە بگرێتـەوە مرۆڤێکی بەدکـار گەربـە خۆیدا بچێتـەوە، ئەشێت واز لەبەدکاری بهێنێت وبەرەو چاکە بڕوات.**

**تا ئەم جوداکانەیەی ڕۆمان ئاشکراو سەرکەوتوو بێت،**

**ئەبێت ڕۆمـان نووس قووتابی‌یەکی ماندووی ژیان بێ‌و خۆی بەڕۆشنبیری‌یەکی فراوان چەکدار کردبێت و ئاسۆی بیرو ئەندێشەی فراوان بێت...**

**لەقـاوغی خۆی چوو بێتـە دەرەوە و خۆی لە ئاوێنەی کۆمەلەکەی دا ببینێتەوە. یەکەم هەنگاویش بۆ ئەم کارە «خـۆناسینە»، بەبێ خۆناسین، نەك نووسەر بەڵکو هیچ**

**مرۆڤێك ناتوانێت دوو هەنگاوبە ڕاستی بڕوات ، ئەشێ تا خۆت ئەناسی سەرسم بدمیت، قاچت بەیەك دا بێت ئەشێت بە دوو ساڵ خۆت بناسی یان بمری و خۆت نەناسی و خۆت نەدۆزیتەوە. بەڵام گرنگ ئەومیە پێش ئەوەی بتەوێت خۆت لە ڕۆمانێك دا بە خەڵكی بناسێنیت، خۆت بناسیت و خۆت دۆزیبێتەوە، بزانیت چیت ؟ چیت ئەوێت، هەڵوێستت لە ژیان بوونەوەرو ڕەش و سپی چییە؟ چیت ئەوێت؟ ئەم خۆ دۆزینەومیە وامان لێ ئەکات بە دڵنیایییەوە بڵێین فلان نوسەر خۆی ناسییەوەو ئەتوانێ هەنگاوی سەنگ بنێ و پتەو پێ دانێ و کاروان بەرەو ئێلاخ بەرێت.**

گەر نووسەر خۆی نەناسێ و نەزانێ چییە وچی ئەوێت، تاوانی ئێمە چییە گوێی لێ بگرین، ئەمرۆ بلوێریکمان بۆلێ داوسبەی دەف. باخۆی بناسێ ئەوسا گەر بە هەموو بوونیشمەوە لەگەڵی نەبم وبەیەك نەگەینەوە، ئەوا گوێی لێ ئەگرم.

مرۆڤ کە خۆی دۆزیەوە واتە کۆمەڵەکەی دۆزییەوە، ئەمەش لەوانەیە بە جۆرێك بیهەژێنێت بیەوێت جیهان برمێنێ و سەرلەنوێ دروستی بکاتەوە، بێ گومان ئەمە بۆ (سۆپەرمان) یش ناکرێت، بۆیە دێت ئەم زیندەخەونەی کەئەشێت زیندە خەونی زۆری وەك خۆی بێت ، لە ڕومانێك دا دابرێژێت... تا ئێمەش خۆمان لە ڕۆمانەکەدا بدۆزینەوەو بهێنێتە دڵ و دەروونمانەوە.

لەم پێودانگەوە هەموو بابەتێك بۆ ڕۆمان ئەشێت، چونکە ڕووداو گەرچی بەلایەنێکی گرنگی ڕۆمان دائەنرێت، من وای بۆ ئەچم نووسەری سەرکەوتوو ئەتوانێت لە ڕووداوێکی بچوکەوە، فەلسەفەی خۆی مان پێ بگەیەنێت وبمان کاتە دۆستی خۆی، بۆ نمونەی ئەم وتەیەم ئەڵێم گەرلایەنە فەلسەفیەکە لە ڕۆمانی زۆربەناوبانگی «زۆربا» ی کازانزاکی جیا بکەینەوە، چی لێ ئەمێنێتەوە، بابزانین، ئەمەش چیرۆکی ڕۆمانەکەیە « خوێنەوارێکی شاری، ئەکەوێتە گەشتێك بۆ لادێ یەك، کە زەوی وزاری خۆی تیا هەیە، لە بەندەرێکی سەرڕێگادا بە کرێکارێکی قۆشمەو زۆر بلێ ئەگات، ئەم کرێکارە ئەبێتە ڕابەری چونکە خەڵك و شارەزای ناوچەکەیە، بۆ مانەوەی ئەچنە لای بێوەژنێکی بە ساڵاچووی دڵتەڕ ... پەیوندییان لە نێوان دا دروست ئەبێت ... پاشان ئەچنە سەر زەوییەکە وکابرای قۆشمە پرۆژەیەکی ئەندێشەیی بۆ ئەنێتەوە، لەولاشەوە هەوڵ ئەدات، خوێنەوارە شارییەکە بێوەژنێکی ناوچەکەی بهێنێتەدڵەوە. دەرەنجام کابرای شاری چی هەیەونییەتی لە کیسی ئەچێ و بێوەژنەکەش ئەکوژرێ و بێوەژنی دڵتەڕ ئەمرێ ... ئەکەوێتە سەرساجی عەلی، هیچی بۆ نامێنێتەوە لەوپەستی و سوگوارەدا وەك کابرای قۆشمە بکەوێتە سەما»

لەوانەیە هەریەکێك لە ئێمە زۆر چیرۆکی لەمە سەیرتر ببیستین بەڵام هەر بە چیرۆکی ئەمێنێتەوە، گەر ئەم چیرۆکە لە زمانی « کازانزاکی» وە ببیستین کە نیمچە فەیلە سوفێکە وزانستی (لاهوت) ی تەواو کردووە و خۆی زۆر بەفەلسەفەو دەروونزانییەوە خەریك کردووە ... بەجۆرێك ئەمان هەژێنێت گەر «زۆربا»ت تەواو کردو ئەو شوێنەگری گرت تیایدا دانیشتووی هەوڵی کوژانەوەی ئەدەیت بەڵام گەر چیت هەیە ونییە سوتاو بوو بەخۆڵەمێش، دوورنییە، لە جیاتی پەستی و هاواروبیری ڕەش ، بکەویتە سەماکردن.

فەلسەفەی ئەو ڕۆما نەم لەوەدایە کە هەموو هەوڵ و کۆششی مرۆڤ بۆ ئازادی و سەربەستییە، ئازادی لە هەموو ڕوکارێکی ژیان ، ئەم ئازادییەشمان لە (سەما) کردن دا بۆ دەرئەخات، کەبە پۆپەی دەربڕینی هەژانی ناخی مرۆڤ دائەنرێت. لەگەڵ خۆت دا ڕۆمانی مەزنی «دایك» بەم شێوەیە، لەلایەنە فەلسەفیەکەی دابڕە، ئەبینی چیرۆکێکی زۆر ئاسایی لێ ئەمێنێتەوە، گەر لە ڕۆژنامەیەك دا بیبینی ، ئەیخوێنیتەوە. بەڵام کە لە زمانی «گۆرکی» یەوە ئەیبیستی، لەسەری هەڵناسی تا تەوای نەکەیت کە تەواویشت کرد ئەگەیتە ئەو بڕوایەی، گەر بیەوێت پەنگوینیش (بطریق) ئەفرێت.

ئەم لایەنی ئاوێزانی فەلسەفەو تینوارین و چیرۆکە ڕومان ـ یش هەروا بە ئاسانی ناخولقێت بەڵکو پێویستی بە تاقی کردنەوەی زۆرو قاڵ بوونە لە ژیان دا کۆلن و یلسن ئەڵێت ؛ «لەبەر ئەوەی کە تاقی کردنەوە باشترین ڕێگەی شت زانینە، ئەبێت توانامان بۆ شت زانین بەو شتانە فراوان بکەین کەتاقی ئەکرێتەوەو بەڕاستی ئەزمونی لەسەر ئەکرێت»[٤]

بۆ نمونە ڕۆمان نوسێك ناتوانێت بەسەرکەوتوویی باسی مردنی مرۆڤێك ـ مان بۆ بکات چونکە، نەخۆی مردووەو زیندوو

ـیوەتـەوە نەکەسیش باسی ئەم تاقی کردنەوەیەی بۆ کردووە،
ـیەـن نووس ئەتوانێت بەسەرکەوتوویی باسی هەموولایەنێکی
ـیـن و باسی هەموو تاقی کردنەوەیەکمان بۆ بکات، دووان نەبێت
ـیت (ا.م. فورستـەر Forster [٥])ئەڵێت:« تەنیا مرۆڤ لە دوو
تـقی کردنەوەی ژیان دا نە شارەزایە، هەر لەبەر ئەمەیە کەلە
ـۆمـان یش دا بە کاڵ و کرچی ئەخـرێتـە روو، یەکـەم تاقی
کردنەوەی لە دایک بوون (Birth) چونکە کە مرۆڤ لە دایک ئەبێت
هێندە هۆشی نییە، تا زمان ئەگرێت لەبیری بێت چۆن لە دایک
بوو، هەستی بەچی کرد. دووەم تاقی کردنەوەی مردن ، چونکە
ئەو مرۆڤەی ئەمرێت، ئەبێتە لاشەیەکی ساردو زیندوو نابێتەوە،
ت پێمان بڵێت چۆن مرد، هەستی بەچی کرد، چی بەسەرهات؟»

هەر لەبەر ئەوەیە کە نابێت رۆماننوس خۆی لە بابەت و تاقی کردنەوەیەك نەدات، کە بە پانی و درێژی تیانە ژیابێ یان ئـی ئاگادارنەبێت.

بۆ نمونە نوسەرێکی ئافرەت ئەتوانێت باسی هەست و نەستی دایـك یان دەزگیران یان کچ یان ژنی سەربازێکمان بۆ بکات بەڵام هەرگیز ناتوانێت بەدروستی باسی بارو دۆخی سەربازی و جەنگمان بۆ بکات.

هەر لەبـەر ئەم خاڵەیـە «کە ناتوانرێت بەتەواوی لە نوسینێك بکۆڵرێتەوە تا لە بیرو باوەرو بۆ چوونی نوسەرەکە نەگەین» [٦] چونکە وەك باسکرا، رۆماننوس باسی بۆ چوون وتێنوارینەکانی خۆیمان لە رۆمان دا بۆ ئەکات و خۆی لە ئاوێنەی رۆمانەکەدا ئەدۆزێتەوە.

## شێوازی هونەری رۆمان:

زۆر لە رۆمـان نوسـە جیهـانییەکان ئەم لایەنە بە گرنگ نازانن، گەرچی نوسـەر ئەتـوانێت لایەنی بیروکەیی خۆی پێ بەهێـز بکـات و والەخـوێنـەر بکات پاش هەموو پەرەگرافێك، چاوەروانی پەرەگـرافێکی تر بێت و پاڵەوانـەکـان بە تەواوی بناسێت چ لە رەنگ و روویان لە بۆ چوون و بیرکردنەوەدا.

ئەم لایـەنـەش بە هاوکێشـەیـەکی ما تمـاتیکییـەوە نابە ستـرێتەوە، بەڵکو نوسەرو خوێنەر سەرەنجامی خوێندنەوەی زۆر رومان، هەستی پێ ئەکەن و لەگەڵی دا رادێن.

چونکە کە نوسەر دەست بەنوسین ئەکات نازانێت بە تەواوی چیرۆکێك ئەنوسێت یان رۆمانێك تا بێت نەخشەی بەشەکانی رۆمـانـەکە بکێشێ و شوێنی گێرانەوە، باس کردن، ووتوویژ ، مونولوجی ناوەکی .....هتد دوایی وەك نەخشەیەکی ئەندازەیی رەنگ بکێشێ و پاشان بێت دیوارو دەرگاو پەنجەرەی رۆمانەکەی لەسەر بەرزبکاتەوە.

وەك «ئیدوارد بلشن» ئەڵێت [٧] «تەنیا رۆماننوسی بێ توانا، هەموو جوڵەو هەست ونەست و وردو درشتی چیرۆکەکەی ئەزانێت پێش دەست پێ کردنی» بەمە پاڵەوانی رۆماننوسی بێ توانا دیلن و ئازادنـین، ناتـوانن چۆن بیـانەوێت بژین بۆیە رۆمانە کاڵ و کرچـەکـانـ سەرنجی خوێنـەرو رەخنـەگر راناکێشن و زوو گەواهی کاڵ و کرچی خۆیان ئەدەن.

لەم رۆمانانەدا وا هەست ئەکەیت کە پاڵەوانەکە ناژی بەڵکو بوکە شوشـەیەکی بێ گیانی سەر شانۆیە نوسەرەکە بە ئارەزووی خۆی ئەیجـوڵێنێت. وا هەست ئەکـەیت نوسەرەکە بەزەقی بە تێلایەکەوە بەسەر پاڵەوانەکانییەوە وەستاوەو قوڵاغیان پیشان ئەدات. بەپێچەوانەشەوە گەریادگاری رۆمان نوسە مەزنەکان بخوێنیتەوە بۆت دەرئەکەوێت، کە یەکەم جار نوسەر ئەکەوێتە هەڵرشتنی هەست و نەسـتیو دەست ئەکـات بە نوسـین، لەوانەیە بیەوێت یادگارێك یان بیرێکی راگوزاری تۆمار بکات یان کورتـە چیرۆکی یان چیرۆکێك بنوسێت. بەڵام پاڵەوانەکان لێی یاخی ئەبن وەك مرۆڤی ناو ژیان، سەربەستانە دێن و ئەچن و هەڵس و کەوت ئەکەن و رووداوەکان وەك زنجیرەیەکی پەتەو یەك یەکتـر تەواو ئەکەن و واهەست ئەکەین لە کونی دیوارێکەوە سەیری دەرەوە ئەکەین و رووداوەکانت لەبەر چاوادێن و ئەچن. لێرەدا ناڵێین کە نووسەر تەنیا تەماشا کەرێکە بەڵکو خۆی لە پاڵەوانێـك دا ئەدۆزێتـەوەو سەربەستی بە هاوژیانەکانی ناو رۆمـانـەکـە ئەدات چۆنیـان ئەوێت بدوێن، بخـۆن، بخەون، خۆشەویستی بکەن، تورەبن ئەگەر ژیانیان تەواو بوو بمرن.

بۆ نمونە دیستوفسکی لە رۆمانی (برایانی کارامازۆڤ) دا، نایـەت پاڵەوانـەکان بکوژێت، گەر بیەوێ بیان کوژێت لە دەستی یاخی ئەبن، چونکە هێشتا پەیامی ژیانی خۆیان تەواو نەکردووەو ئاوات بە ژیانێکی درێژترەوە ئەخوازن و ئازادی یان ئەوێـت. (دیـسـتـوفسکی) لەم رۆمـانـەدا لە یەکێـك لە پاڵەوانـەکانیدا ئەناسرێتەوەو لەگەڵ براکانیدا ئەژی نەك بە

کوتەکێکەوە بەسەر براکانی‌یەوە ڕاوەستابێت و قۆناغیان پیشان بدات و گەر نەمردن، کوتەکێك بدات بەسەریان دا بیان کوژێت. ئەم یاخی بوونی پاڵەوانە وا لە نووسەری سەرکەوتوو ئەکات کە بە دوای پاڵەوانەکەی‌دا ڕابکات و بکەوێ‌و هەڵبستێتەوە، تا کاتێك بە خۆی ئەزانێت، ئەو بۆ نووسینی چیرۆکێ دانیشتووە. بەڵام پاڵەوانەکانی هێندە گرۆڵ و بزێون ناچاری ئەکەن هەموو شارەزایی و کارامەیی‌و بۆ چوونی لە ڕۆمانەکەدا هەڵبرێژێت و هەنگوینێکی پوختەمان پێش کەش بکات.

تەنانەت لە کەڵە ڕۆمانەکان دا، ئەشێت شێوازێکی ڕۆمان بەسەر شێوازە هونەری‌یەکانی تردا زاڵ بێت و ئەوانی تر بشارێتەوە بۆ نمونە «ریچاردسن» ڕۆمانی «کلاریسا»ی لە شێوەی نامەونامە گورینەوەدا نوسیوە، یان زۆربەی ڕۆمانەکانی (تولستۆی) شێوازی گێڕانەوەی بەسەردا زاڵە[8] یان شێوازی ڕۆمانی «اله المتاهة»ی کۆلن ویلسن، نوسینەوەی یادگاری ڕۆژانەیە.

ئەشێت لایەنی شێوازی هونەری ڕۆمان بەسەر لایەنێکی تردا زاڵ بێت ئەمەش ئەوەمان بۆ ئاشکرا ئەکات کە ڕۆمان بە هاوکێشەیەکی ماتماتیکی‌یەوە گیرنادرێ وەك بووترێت ئەبێت «٢٠» لاپەڕەی گێڕانەوە، «٢٠» لاپەڕەی باس کردن و «٢٠٠» ووتووێژو (٢٠) جار بیرکردنەرەی تیا بێت، ئەوە ڕۆمانێکی سەرکەوتووە.

بەڵکو بابەت و ڕووداوو پاڵەوانی ڕۆمانەکە شێوازە زاڵەکە دەست نیشان ئەکەن بۆ نمونە گەر ڕۆمانێك باسی مرۆڤێکی دەروون نەخۆش بکات، زۆربەی بە باس کردنی لایەنی دەرەوەو ناوەوەی پاڵەوانەکەو بە شێکی‌تری بە «مۆنۆلوجی ناوەکی» یان «قسە هاتنەگوێ»وە تەواو ئەکرێت.

گەر ڕۆمانەکە باسی جەنگ و پاڵەوانێتی بکات، ئەوا بەگێڕانەوەوباس کردن و ووتووێژەوە تەواو ئەکرێت، ئەمەش یاسایەکی ڕەهانی‌یە ئەشێت لە جەنگێك دا سەربازێك ببورێتەوە یان بکەوێتە نیمچە هۆشی‌و ژیانی خۆی بە (فلاش باك) بێتەوە یاد یان سەربازێك بگێردرێ‌و پاڵەوانی‌یەکەی بەوە دەربخرێت، لێی بکۆڵنەوەو ڕۆمانەکە بە ووتووێژ تەواو بکرێت.

نوسەری شارەزا چ شێوازی بەکاربێنێت ئەتوانێت تاقی کردنەوەکانی مرۆڤ بە شارەزایی بگوێزێتەوە ناو ڕۆمانەکەی، ژیانی تیا بخولقێنێ. بۆ نمونە هەموومان ئەزانین تورەبین یان تورەبوونمان لەیەکێکی ترەوە دیوە بەڵام نوسەری کارامە ئەتوانێت چێژێکیمان باتێ لەم تورەبوونە ئەمەش بەوەی چەند لایەنێکی تورە بوونەکەمان بۆ دەربخات کە ئێمەی مرۆڤی ئاسایی لەکاتی تورەبوون دا هەستی پێ نەکەین.

واتە ئەبێت ڕۆمان نووس شوێنی زۆر هەستمان بۆ بگرێتەوە کە ئێمە بەکاری ناهێنین یان نازانین بەکاری بهێنین. ئەوەش بەوەی هەست بەلایەنی جوانی‌و ناشیرینی‌و چاکی و بەدی شتەکان بکات. چاوی ڕۆماننوس و ئەندێشەی ئەبێت هێندە فراوان بێت، ئەوشتانە ببینێت کە ئێمە لە هەموو کاتێك دا هەستی پێ ناکەین.

(ئینیشتاین) ئەڵێت[9] «دانیشتوانی شار لە پشووی هەفتانەدا ڕوو ئەکەنە شاخەکان، چونکە ئاسۆی فراوان هەستی ئازادی یان پێ ئەبەخشێت». بەڵێ، ڕۆمان نوس دەستمان ئەگرێ ولە قەرەباڵغی‌و سەرقاڵی شارەوە ئەمانباتە چۆڵ و هەردێ کە ئاسۆی بەر فراوانی لێوە دیار بێت و زۆر شت لەو ئاسۆ فراوانەدا ببینین‌کە دیوارو قەرەباڵغی و سەر قاڵی شاری ژیانمان ناهێڵێت ببینین... بەمە هەست بە ئازادی یەك ئەکەین، کەوەك باڵندە، حەز لە فرین ئەکەین بەرەو ئاسۆی بەر فراوان.

هەر ئەمەیە وامان لێ بکات پاڵەوانی چیرۆك وەك برادەرێك دابنێین کە ساڵی جارێك ئەیبینین، نازانین لەو ساڵەدا چی کردووەو چۆن ژیاوەو چی خواردووەو چی بەسەرهاتووە. بەڵام پاڵەوانی ڕۆمان وەکو مرۆڤێك وایە هەردەم لەگەڵمان دا بژی، بزانین کەی سەری دێشێ‌و کەی حەزی لە چایە و کەی تورە بوو، کەی پێ کەنی‌و تا ئاستێك هەموو هەڵس و کەوت و بگرەو بەردەیەکی بزانین. هەروەها پاڵەوانی ڕۆمان وەك مرۆڤی ناوژیان ئەژی ، لە خەو هەستا ، وەك من و تۆ باویشکێکی بۆ ئەداو کەمێك خۆی ئەکێشێتەوەو بەرچایی ئەکاو ئەچێتە سەرکاری خۆی و پیوەی خەریك ئەبێت واتە بە پانی‌و درێژی ژیان دا ئەژی. جیاوازی‌یەکی تری پاڵەوانی ڕۆمان لەوەدایە ئەشێت چەند پاڵەوانێکی سەرەکی ولاوەکی تیابێت و هەریەکەیان شوێنی خۆیان لە ژیانی ڕۆمانەکەدا ئەزانن و

شوێن پەنجەیان دیارە.اله چیرۆك دا مەودایەکی وات نییە لە ..ەوانێ زیاتر بکە یتە سەرەکی و ببێتە برادەستی نوسەرو خوێنەر.

جیاوازییەکی تری رۆمان و چیرۆك لەوەدایە، رودواوێك لە چیرۆکێك دا پاڵەوانەکان ئەجولێنی تا ئەگاتە پۆپەو وردە وردە خاو ئەبێتەوە. بەڵام رۆمان پێویستیی بەزنجیرە روودواوێکە، کە زۆر بە توونـدی پێکـەوە بەندن و لێك ناپچرن و واله خوێنەر ئەکـات لەگـەڵ روداوی یەکـەم دا بهـەژێو بە پەرۆشییـەوە چاوەرێی رووداوی دووەم یان ئەڵقـەی دووەمی رووداوەکـە بکات، کاتێ وا خوێنەرت راکێشاو لە ئەڵقەی یەکەمەوە پەڕانتەوە بۆ ئەڵقـەی دووەمـی زنـجـیرە رووداوەکـە هەست ئەکـات قورسییـەکەی سەرسنگیت لابرد، هەناسەیەکی پێدا دێتەوەو هەست بە سەربـەستی ئەکات، تا ئەکەوێتەوە بەر هەژاندنی ئەڵقـە یەکی تری رووداوەکە. گەر روداوی لاوەکی تێ کەوت ئەبێت پەیوەستی ئەڵقە سەرەکییەکان بەهێزتر بکات نەك تەنیا لق و پۆپ پێ دەرکـردن بێت بێ ئەوەی خزمەتێکی کارە ساتە رەسـەنـەکـە بکـات، دەنـا لێرەدا ئەبـێـتـە چیرۆکێك کە کارەساتێکی سەرەکی تیایەو بە چەندکارە ساتێکی پچـرپچـر ئاخن دراوەو ناوی لێ نراوە رۆمان. لێرەدا ئەتوانین بڵێین لە رۆمان دا وەك چیرۆك تەنیا گرێیەکت نییە بکرێتەوە بەڵکو وەك ووتمان لە زنجیرە گرێیان رووداوێك پێك دێت، یەك یەك ئەکـەنەوە یان راستتر بڵێین تا پۆپەی زنجیرەگرێکە یەك یەکتر گرێ ئەدەن و لەولا کە یەکێکیان کرایەوە رێ خۆش ئەکات بۆ کردنـەوەی ئەوەی پاش خۆی. گەر گرێ یەکی تا کۆتـایی رۆمانەکە نەکرایەوە، ئەمەبێ توانایی رۆمان نوسەکە دەرناخات بەڵکـو هەروەك ژیـانی رۆژانـە زۆر گرێ هەیـە بێ کردنەوە ئەمێنێتەوە، گرنگ ئەوەیە کە رۆمانەکە رێمان بۆ خۆش بکات بۆ کردنەوەی گرێکە.

زمانی گێرانەوەی رۆمان ئەبێت پاراوو شیرین و بێ گرێ بێت هەمـوو بەشـەکانی رۆمانەکە پێکەوە گرێ بدات و ببێتە بەشێك لەتان و پۆی رۆمانەکە کە سەرەنجامی جوڵەی پاڵەوان و چرکـەی کات و کارەسـاتـەکـان دا لە شوێنی رۆمـانـەکەدا ئەخولقێت... ئەبێت باس (وصف)ی ناو نوسینەکە بەزمانێکی شیعری، وێنەی هونراوەیی باسی پاڵەوان و شوێن و کاتە کە بکـات. ئەم زمـانە پاراوەیە ئەشێت وا لەخوێنەر بکات چاو لە لایـەنێکی لاوازی نوسینـەکـە بنـوقێنێ کە هەست بە چێژی مۆسیقای زمانەکەی ئەکات.

**دوا وشەم لەم بابەتەدا بیروڕای (کۆلن ویلسن)ە دەربارەی رۆمان:[10]**

ئامـانجی رۆمـان خولقـاندنی هۆشیاریەکی بەربڵاوە، چونکـە هۆشیـاری ژیـانی رۆژانـە بەرتەسکە،رۆمان بەیەکێ لەوشتـە گەورەو مەزنـە خۆشـانەدا ئەنرێت کە مرۆڤ توانی بیخـولقێنێ تا عەوێـزای ئەم بەرتـەسکییـە بداتەوە. رۆمان هاوسـەنگی تاقی کردنـەوەیـە، هەمـوومـان حەزمان لە تاقی کردنـەوەیـەکی بەر بڵاوترە لەوەی ژیانمان بواری پێ ئەدات. رۆمان ئەتوانێ تا ئاستێك ئەمەمان بۆ بهێنێتەدیو ئەتوانێ زۆر جۆر تاقی کردنەوەمان پێش کەش بکات کە لە ژیانی رۆژانەما دا ناشێ. بۆیـە ئەڵێـین کە رۆمان شێوەیەکە لە تاقی کردنەوە بیرییەکان و ئامانجی وەك تاقی کردنەوە بیرییە فەلسەفییەکان ئەوەیـە شتێکمـان دەربـارەی جیهـانی راستەقینە فێربکات. رۆمـانی کاڵ و کرچیش لە تاقی کردنـەوەیەکی بیرانە ئەچێت نەتـوانرابێت بە دروستی دەرببرێت یان لە کارێکی ژمێریاری ئەچێت دەرەنجـامـەکـەی هەڵەبێت یان لەتاقی کردنەوەیەکی تاقیگا ئەچێت، تاقی کار هەڵەیەکی کوشندەی کردبێت.

## پەراوێزەکان:

١-بروانە لاپەرە (٩)ی (فن الروایة- کولن ولسن - دار المامون - ١٩٨٦)
٢- بروانە لاپەرە (١٦-١٧)ی (اصوات و خطوات - عبدالرحمن مجید الربیعی- ١٩٨٤) المؤسسة العربیة للدراسات و النشر
٣- بروانە لاپەرە (٢٥٩)ی سەرچاوەی یەکەم.
٤- بروانە لاپەرە (٢٦٢)ی (اللامنتمي- کولن ولسن طبعة ثالثە ١٩٦٣)
٥- بروانە لاپەرە (٧٨)ی کتێبی . Aspects of novel A.M Forster 1978
٦- بروانە لاپەرە (٢٥٠)ی (فن الادب الروائي عند تولستوی- ادینوف -١٩٨٦)
٧- بروانە سەرچاوەی دووەم (ل ٢١).
٨- بروانە سەرچاوەی شەش (٩)
٩- بروانە سەرچاوەی یەکەم (ل ٢٦٠)
١٠- بروانە سەرچاوەی یەکەم (ل ٩٦-٩٧)

# رۆمانی «هیچ» له ڕوانگەی فەلسەفەی هیچ دا

● نجات عەبدوڵڵا ●

هیچ

رۆمان

ئەندازیار
خوسرەو جاف

چاپخانەی الحوادث..
بغداد - ١٩٩١

«هیــچ» دوای «کـۆردەرە» دووەمین رۆمانی ئەندازیار خوسرەو جافه، ئەگەر بڵێ «کۆردەرە» بەمولکی خەسرەو جاف بزانین، ئەگەر چی کۆردەرە وەرگێڕان بوو بەڵام هەر هیــچ نەبێ لەرووی بیرا سەر بەقـوتابخانەی ریالیستی بوو، بەڵام بە پێچەوانەوە «هیچ» وەك بەناوەکەی دیارە سەر بەهیــچ قوتــابخانەیەکی فەلسەفی‌یەو لە دونیای فەلســەفـەی هیــچ دا دەخولێتەوە، من تێ ناگەم چلۆن دەکـرێ نووســەرێك لە رۆمانێکی پێشتری لەدیدگایەکی ریـالیستیـانــە بنۆڕێتە ژیان، کەچی بەپێچەوانەوە هەر دوای یەك دووساڵێك بەرەو هەڵدێری بێمانایی‌و هیچی ژیــان هەنـگــاو هەڵێـنــێ، ئەگــەر «کــۆردەرە» موڵکــی نووســەرێکــی ریــالیــستی گەورەی وەك عەلی ئەشرەفی دەروێــشیــان بوو هەر خوا بکــا «هــیـــچ»ەکــەی هی نووسەرێکی بێهودە نەبی هەرباشە!!

بەتــاســەوە رۆمــانی هیچیم خوێنـدەوە، بێ لێبـڕان زۆر هەڵوەدای رووداو کارەسات و کەسانی نێو رۆمانەکە بووم، ئەو هێنــدە تاڵە دەزووی رووداوو کارەســاتــەکانم بەیەکەوە گرێ دەدا، هەرگیز بەخەیاڵم دا نەدەهات کەش و هەوای رۆمانەکە کوردی بێ، کەســانی رۆمــانــەکە هەریەکەیان بەدروستی لە جێگای خۆیان دا تەوزیف نەکراون و نووسەر خۆی وەکو بووکە شووشــە یاریبــە پاڵەوانەکان دەکا، ئەگەر لەرووی هونەری رۆمان نووسین لە هیچ بنوا‌ڕین، دیارە زۆر لاوازو بودەڵە وەبەر چاوان دەکەوێ‌و زێتر لە هەقایەت و سەربووردە دەچێ. بابەتی رۆمــانــەکە زۆر پەرش و بڵاوەو سەرەتا رۆماننوس لە ناوچەی «گــەرمیــان» دەست وێ دەکــا، کات سەردەمی داگــیرکردنی ئینگلیــزەو مستــەر «لاین»ە، بەو پێیــەبێ دەبێ سەردەمی رۆمانەکە لەدەوری ساڵانی سی‌یەکان بێ، نووسەر ئیشارە بۆ هیچ گوندێکی دیاریکراو ناکا تەنها پاڵەوانێکی دزو جەردەی گونـدەکــە نەبێ کە دزی‌و تالانکەر بووەتە پیشەیان. نووسەر خۆی لەقەرەی کێشەی چینایەتی جووتێران وژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی گونـدنشــین نەداوەو تەنهــا لەڕوانگــەی فەلســەفەی بەدبینی‌و هەرەس هێنانی ژیان دا نەبێ، کە چەند پاڵەوانێکی رۆمانەکە هەر خەریکی دزی‌و جەردەیین، وەك ئەوەی ئەو خەڵکە تەنهــا بەدزی‌و وەڕێــوە بچن. تانووسەر یەك لە پاڵەوانەکانی رۆمانە کە (مـحە) دوای تۆبەکردن و خەڵوەت کێشان دووبارە تووشی دزی‌و دزیکــاری‌و تاڵانکــردنی دەکــاتــەوەو تەنــانەت «پوزە»ی خێزانی داوا لە (مـحە) دەکا تا دزی بۆ بکا، تا دەگاتە ئەوەی «پوزە»ی ئافرەتی ناو ئەوگەرمیانەی ساڵانی سی‌یەکان بە مێردەکەی بڵێ «ئەمە چی‌یە مێرخاس تۆبەی کردووە، تۆبەم لە قورە رەشەی چوار زەوەرکێشا.. ئاوا، قورئان بەهەقت بەمانات هەوڵێك نەدەی، هەر ئێمشەو چوار چەکی لێ ئەکەم بە داراو، دەرۆم بۆ دزی، خۆتۆ غیرەتت بۆ نەماوەتەوە. هیچ لا:١٢»

من نازانم لە کام سوچی کوردستانا ئافرەتی کورد واهێندە بەپەرۆشی دزی بووەو تا هەرەشە بکا ئەگەر مێردەکەی دزی نەکا ئەوا خۆی قۆڵی لێ هەڵدەکاو دزی دەکا، ئەوەی ئافرەتی کوردی

نەسیبێ قسەی وای ناچێ بەمێشك دا، ئافرەتی کورد ڕووسوورانە هەر چەندە چەرمەسەریو برسێتییان دیبێ، بەڵام ڕێگای دزیو کاری دزێویان نەگرتۆتەبەر، ئافرەتی لادێیو ـزی کردن لەو سەردەمەی کۆمەڵگای کوردەواریو هەڵوێستی ئاوا کارێکی نەشیاوەو مەگەر تەنها لە فەلسەفە هیچەکەی کاك خوسرەودا هەبن. نووسەر هەر تەنها ئەوەندە پێویستی بەناوچەی گەرمیان هەیە تا یەك دوو سێ پاڵەوانی هیچی لێ دروست دەکاو ئیتر ببرای ببرای بەلای هیچ کام لەکێشەو خەون و مەسەلە سەرەکییەکانی خەڵکی ئەو ناوچەیە ناکەوێ و عەودالی ئەو «هیچ»ەیە کە ژیان لە دیدگای ئەودا هەر «هیچ»ە، لە هەمووی سەیرتر ئەو پاڵەوانە «اصطناعی»یە خەیاڵییە، «ڕەجەب» برین پێچێکی عەرەبە، «قسەی قۆڕ مەکە، ڕەجەب بێگانەیە، بێگانە هەتاوەکو زمانی یەکتر نازانن، هیچ لا:٥٣».

هاتووە لەو گوندەی ناوچەی گەرمیان دا لەنەخۆشخانەدا برین پێچە، سەردەم سالانی سییەکانە، زۆر بێ پەروا «گوڵچین»ی خوشکی «حەمە» حەز لە «ڕەجەب» دەکاو کارەکە زۆر ئاسایی بەرێوە دەچێ، وەك ئەوەی کوردستانی ساڵانی سییەکان وڵاتی سویدی ئێستاکە بێ ئاوا حەزلێك دەکەن ئەوەتا «گوڵچین»ی کچە لادێییەکی نەخوێندەواری ساڵانی سیئەم ناوچەی گەرمیانە زۆر بێ پەرواو بێپێچ و پەنا دەڵێ «ناوانییە، زمانی یەکتر دەزانین، تەنها گوناهمان ئەوەیە، هاوزمان نین؟ لف چییەو گۆبەنی چییە؟ حەز لەیەکتر دەکەین و تەواو، ئیتر ئەم بیگرەو دەری مەکەی ناوێت. هات و وتیو کاڵەکاڵی بۆچییە، مەگەر حەز لەیەکتر کردن تاوانە؟ هیچ لا:٥٢». لە هیچ جێگایەکی کوردستان تا ڕۆژی ئێستا کچانی کورد ئەگەر حەزیان لە کوردێکی هاوزمانیشیان کردبێ ئاوا نەوێراون بەسەربەستی قسەبکەن، چ جای بۆ کچێکی لادێی ساڵانی سییەکان. تا دەگاتە ئەو رادەیەی «بەناخێری گیانم دوێ شەو چووم تەنتریۆن بێنم، پای حەمەی پەریخان گاسن بریندرای کردبوو، چوومەسەرا، گوڵچین و ڕەجەبی برین پێچ ئالا بوون بەیەکدا، ناڵەو نووزەیان چو دێڵەو با دوو گوریس دەڕۆیشت.

دوابراوە کەمنی دی نەپەشوکا، وەك هیچ نەبووبێت، ئارام کەفەڵی لەباوەش ڕەجەب دەرهێناو لەسەرخۆ خۆی پۆشتە کردەوە. هیچ لا:٤٣».

ئەمە چ پێوانەیەکە بۆ کچێکی کوردی لادێی بەنیوەی شەو بتوانێ دەگەڵ برین پێچێکی عەرەب وا بەسەربەستی رابوێرن و کەبەسەریشیان دابچن، شەرمیش دا نەگرن. ئەمە شتێکە هەرگیز لە فەرهەنگی ژیانی کچانی کورد ناوەشێتەوە! نازانم کاك خوسرەو جاف چلۆن ڕێگەی بەخۆی داوە ئەم کارە کرێتانە بۆ کچانی ڕووسووری کورد هەڵبەستێ، وەك لە دوایش دا دەردەکەوێ «گوڵچین» نە سۆزانییەو نەئەشقیایە، کچێکی ڕوو سووری کوردە، بەڵام تۆ بڵێی لەم گوندە هیچ کورە کوردێك نەبووبێ «گوڵچین» بەدڵیا بچێ، بەڵام نووسەر بە ئانقەست ئەم نەخشەی بۆ گوڵچین داناوە تا دواتر بیکا بە پاڵەوانی ڕۆمانەکەو ڕۆمانەکەی پێ تەواو بکا. سێکس یا ڕاستتر بڵێین «بەڕەڵڵایی» سێ چواریەکی ڕۆمانەکەی داگرتووە، ڕاستە تەوزیف کردنی سێکس لە ڕۆمان دا زۆربەجێیە، بەڵام بەگوێرەی واقیعیەتی ژیان نەوەکا وەك بەڕەڵڵایی وەکاری بێنین من نازانم ئەگەر سێکس و ڕابواردن و هەوەسبازی لە ڕۆمانەکە دەربکەین چەند لاپەرەی لێ دەمینێتەوە. تەوەری ڕۆمانەکە لە دەوری گوڵچین دا خول دەخواتەوە. ڕەجەب دەگواسترێتەوە «بەغدا» کە دیارە خەڵکی بەغدایە، ئیتر بێ هیچ پێچ و پەنایەك «گوڵچین» هەر بەکچی ڕەدووی «ڕەجەبی» عەرەبی بەغدایی دەکەوێ نازانم چۆن ئەم خۆشەویستییە وا زوو لە نێوان برین پێچێکی عەرەب و کچێکی کورد دا دروست بوو، تا وای لێهات گوڵچین ماڵ و وڵاتی کوردەواری خۆی بەجێبیەڵێو ڕەدووی ڕەجەبی عارەب بکەوێ و تەنانەت پێش مارەکردنیش چەند جاران بەیەکەوە رابوێرن. ڕەجەب کەسێکی بەڕەڵڵایە، مرۆڤێکە هیچ ئیلتیزامێك و ئەخلاقێکی نییە، تەنانەت بەبەرچاوی ئەوەوە «حمدیە»یەی خوشکی لەسەر کۆشی «حازمی مێردی دادەنیشێو «مەشروب»

دەخواتەوەو تا بەڕەڵڵایی دەگاتە ئەوەی کە ڕەجەب بۆ پارە گوڵچینی خۆشەویست و هاوسەری خۆی ئارەق خواردوو بکات و بیداتە دەست حازمی زاوایان بەخۆییو بە «حمدیە»ی خوشکی پێکەوە «گوڵچین» بەسەرخۆشی بۆ «حازم» ڕووت بکەنەوەو حازمی گورگ و درندەو چڵێسی لە تیرەی مرۆ بەدەریش بە هەوەسی ئاژەڵانەی خۆی خەریکی کاری ئاژەڵانەی خۆی بێو

«ڕەجەب» یش دەگەڵ هەر لە قتەیەکا وێنەیەکی «حازم» و «گوڵچین» بەرووتی بگرێ، ئەمە چ بەرڵلایی‌یەکە!!!

سەر لەبەری ڕۆمانی هیچ لێواو لێوی پاڵەوانی بەرەڵلاو ساختەچی‌و هەوەسبازو سۆزانین و لەڕوانگەی هیچێکی ژیان دا سەریان لێشێواوە. کە گوڵچین و ڕەجەب دەچنە بەغدا ئیتر ڕۆماننووس هیچ پێوەندی‌یەکی بە ناوچەی گەرمیان نامێنێ‌و لێرەدا ڕەجەب لە پێناو پارەدا کەرامەت و شەرەف و نامووسی خۆی دەفرۆشێ‌و گوڵچینی خێزان و خۆشەویست و هاوسەری خۆی‌و حمدیەی خوشکی دەداتە دەست «حازم»ی گورگە بۆری چڵیسی هەوەسباز، دواجار گوڵچین بەناچاری دەبێتە سۆزانی‌و پێکی ڕابواردنی پیاوان و کاربەدەستانی ئینگلیز و ڕەجەبیش مەلوول دەبێ‌و لەم دادەبڕێ. دواجار گوڵچین خۆی دەکوژێ‌و هەموو شتێك کۆتایی دێ، وای لێدێ کە هەموو شتێك لە ژیان دا هیچ بێ‌و هەموو شتە پیرۆزەکانی ژیان خەبات و قوربانی‌و ئەخلاق و داب و نەریت پوولێك نەیەنن و مرۆڤ هەرتەنها یاری یەك بێ بەدەست «هیچ»و هیچ شتێکیش لە جیهان دا مانای نەبێ، بەو مانایە کە ژیان ئەرکی کۆمەڵایەتی خۆی لەدەست بداو مرۆڤ لە دنیای هیچی هەواو هەوەسی ئاژەڵی نیزیك بێتەوە.

دواجار زۆر دەترسم ئەم ڕۆمانە کوردی نەبێ‌و وەکو «کۆردەمرە» کورداندرابێ، چونکێ هەر چەند تێی وورد دەبمەوە لەکەش و هەوای کوردەواری ناچێ‌و ئێستا مرۆڤ نازانێ خوسرەو جاف سەر بەقوتابخانەی بیری ڕیالیستی‌یە یا فەلسەفەی هیچ و بەبینی، یان سەر بە هیچیان نی‌یەو ئەو تەنها بەرگی کوردەواری یان بەبەردا دەکا. دواجار شتێك ماوە بیڵێم کە بەهەق زمانی کوردی ڕۆمانەکە وەکو زمان زۆر پاراو کوردانەیەو نموونەی کەمە، هەر چۆنێك بێ پیرۆزبایی لە کاك خوسرەو جاف دەکەم بۆ ئەم ڕۆمانە نوێیەو ئەم نووسینەی منیش ناچێتە خانەی ڕەخنەو ڕەخنەکاری بەڵکو تەنها سرنج و تێڕوانینی خۆمەو بەس.

●

# لەش لە نێ<br>خاتوو چا<br>بەراوردێکی

## سەرەتای یەکەم:

لەش یان خائینە یا دۆست، یان ڕزگارت دەکا یان دەتخنکێنێ، یە هودایە یاخود مەسیح .. نادیارێکە لە جەستەی ئەبستیمیمان دا لە دایك نەبووە، پانتاییەکە کە وەبیرهێنانەوەی کردەومیەکی پڕ مەترسی‌یە، بزواندنی لە هەمان کات دا بزواندنی هەموو ئەو تارماییە وخێوو هێزە شەڕانگیزانەیەکە هەزاران ساڵە مۆرفینیان لێ دەدرێ، پانتایی لەش ئەو پانتاییە سڕەیەکە ووریا کردنەوەو دواندنی دەشێت ڕاچڵەکاندنی هێزێك بێت کە ببێتە مایەی کوشتنی گەلێك خورافات و کێشەی وەهمی و ڕاستەوخۆ سروشتی نامۆی لەش و تێ ئاوارە بوونی مرۆڤ وەکو یەکەمین و دواهەمین پرسیار بهێنێتەوە یادمان، فەرامۆش کردنی لەش بە مانای ونبوونی نایەت وەلاخستنی لەش لەوەی ناوەندی پرسیارێکی شارستانی گەورەبێت ئامادەگی لەش لە ناوەڕاستی هەموو پرسیارەکان دا لا نابات لە ڕۆشنبیری ئێمەدا سەیرکردنمان بۆ جەستە وەکو ناوەندێکی هەڵگر بۆ کۆمەڵێك توانای دی زاڵە بەسەر سەیرکردنمان دا بۆ جەستە وەکو ناوەندی کۆمەڵێك پرسیارو کێشەی تایبەت بە خۆی، تا ئێستا ئەو سەیرکردنەمان بۆ لەش کە قەوارمیەکی هەڵگرە بۆ (عەقڵ) و (سۆز) باڵا دەستە بەسەر سەیرکردنمان بۆ لەش وەکو

# ...وان «دۆستی ...ەرلی» و «ەیم» ...ایکۆ سۆسیۆلۆژی دا

نووسینی: بەختیار عەلی

**ئەو رووبەرە ئۆرگانی‌یە گرنگەی شوێنی «دیسپلین کردن» و «کۆدیتا گیرانیشە بەسەر دیسپلین» دا.**

لە رۆشنبیری ئێمەدا سۆز لەشی کوشتووە، لیرکی‌یەت «غنائیە» لەبری ئەوەی هەڵقوڵاوی پانتایی‌یە زیندوو و یاخی بووەکانی لەش بێت ئاوێنەی هەست و غەریزە کپ کراوەکانە، بەمجۆرە لەش وەکو کێشـەیەکی ئەبستیمی و پرسیارێکی ستاتیکی و ئەخـلاقی لە هەناوی رۆشنبیری کوردی دا ونە، لەشی مرۆڤی کورد پانتـایی‌یـەکی نەخـوێنـدراوەیـە، هەمیشـە لەش لە دەرئـەنجامە گشتی‌یەکان دا وەکو شوێنی ئەو هێزو توانایانە سەیر کراوە کە لە رێگایەوە «تاك ـ فەرد» هەوڵ دەدات گۆرانێك بۆ «کۆ» وەدەست بهێنێ، بەواتا لەش ئەگەرچی تا بیەتمەندترین بەشی تاکە هەمیشە وەکو هۆکارێك بەدەست کۆوە (جەماعەتەوە) سەیرکراوە.

تیرۆریستیەت و داپڵۆسینی لەسەر جەستە بەرادەیەك توندوتیژ بووە کە هەمیشە پرسیار لە جەستە خۆی پرسیارێك بووە کە نەکـردن و دواخستنی حەتمی بووە، یان هەمیشـە رۆشنبیرە نیمچە خوێندەوارەکان سەریان لە قاندووەو وتوویانە :ـ «ئێستا کاتی ئەوەنی‌یـە» هەمیشـە کات کاتی جەستە نەبووە، چونکە بەهەرەس هێنانی دیسپلین کردنی جەستە ئۆرگانی ترین بەشی دیسپلین کردن و تیرۆرکردنی مرۆڤ و چەوساندنەوەی هەرەس دەهێنێ، لەبەر ئەوەی تاك «فەرد» یا لە ئامادەگی و هەست کردن بە لەشی خۆی دا لە دایـك دەبێ یان ئەوەتـا لە دایك نابێت، لەیادبردنەوەی لەش لە هەمان کات دا لە یادبردنەوەی مرۆڤ بووە لە پێنـاوی تواندنـەوەی لە نێـو بونیادە گەورەکان دا، سەربـڕینی سـتـراتیـژی‌یەتی ئازادی بووە لەبەردەم کۆمەڵێك سـتـراتیـژی ئایـدیـۆلۆژیکی دا (بەو مانایەی کە ئایدیۆلۆژیا هاوتای درۆزنە هۆشمەندی‌یە) قسە لە رۆشنبیری کوردی دا هەمیشـە لە کۆمـەڵێکە بەدەر لە فەرد ـ تاك ، کۆمەڵێك ماناو ئامادەگی فەردی تیا مردووە، لێرەوە زۆربەی هەرە زۆری ئەو «رۆشنبیرانەی» لە پنتە تاریك و پانتایی‌یە شەوە زەنگی‌یەکانی ئەم رۆشنبیری‌یەدا سوڕاونەتەوە، پرۆژەی ئازادی و پێشکەوتنی کۆمەلایە تی‌یان جیاواز بینیوە لە دروست بوونی «فەردی ئازاد»، تێراونینیـان بۆ کۆمەڵگای نمونەیی ئەوە بووە کە تا چ ئاستێك دیسپلینی تاك ـ فەرد دەکات لە بونیادی خۆی دا ، تێروانینیان بۆ فەردی نمـونـەیی ئەوە بووە کە تاچ ئەنـدازەیـەك لەگـەڵ کۆمەڵگادا تەبایە.

لێرەوە لەش وەکـو پانتـاییـەك کە دەشێت زۆر پەیمانی نێوان (فـەرد) لەلایـەك و (کـۆمـەڵ) لەلایەکی ترەوە تیا بشکێت .. دەبـووایـە بمـردایە .. جەستە وەکو ئەو جێگایەی کە پێوەرە ستاتیکی و ئەخلاقی‌یەکانی تیا دەشکێت دەبووایە فەرامۆش بکرایە، هەر بە هەمان ماناش دەشێت (لەش) لە ساتەوەختە راستەقینەکانی تازەگەری دا بێتەوە پێش.

چونکە تەنها تازەگەری ئەو ساتە ئەبستیمیەیە کە لەش زیندوو دەکاتەوە بەمەبەستی شکاندنی بەهاکانی پێش خۆی، چونکە ئەگـەر فەرمـانی سەرەکی و گرنگی تازەگـەری ئەوە بێت کە دەستی بگـاتـە ئەو رووبـەرانـەی لەوەوبـەر بیرکـردنـەوە نەیگـەیشتـوێتێ، ئەوا پرسیـارکـردن لە جەستـە یەکێکە لەو رووبـەرانـە کە دەستی بیرکـردنـەوەی ئێمە نەیگەیشتوێتێ، جەستـە قەوارەیەکی ئاشکراو هێزێکی دیار بووە کە هەمیشە گۆردراوە بۆ نادیـار، پانتاییەکی دیاربووە بە پەردەکانی دیکە شاردراوەتـەوە. لێرەدا عەقڵیەتی رۆشنبیری ئێمە درێژکراوەی عەقـڵیـەتی خێڵەکی و غەیبـانی سەرەتـایی بووە، لەرووی مامـەڵەکـردنـەوە لەگـەڵ «لەش» دا سەیـرکـردنی زۆربـەی

رۆشنبیرانی ئێمە جیا نەبۆتەوە لە سەیرکردنی دوا کەوتووترین ئاستەکانی عەقڵیەتی کۆمەڵایەتی کە پاڵپشت بە غەیبیانیەت و ئایین قسەیان کردووە.

ئەگەر ئەخلاقی کۆمەڵایەتی هەمیشە روو لە داپۆشینی لەش و قایمکـردنی بێت لە پشت بەهـا ئەخـڵاقیـیـەکانەوە بەردەوام ویستبێتی جەستە بە جل داپۆشێ، ئەوا ئەخلاقی رۆشنبیریمان جەستەی بە ئایدۆلۆژیاو ئایین داپۆشیوە.

بە ئایـدۆلۆژی کردنی جەستە سروشتی جەستەی کوشتووە، لێرەوە لە نێـوان کێشـەی لەش و پرسیـارەکانی دا لەلایەك و سێکسیالیەت و ئایرۆسیەتی لەش دا لەلایەکەی دیکەدا تێکەڵ بوون و بەیـەکدا چوونێکی نائەبستیمی دروست بووە. کورت کردنـەوەی مانـای لەش بۆ غەریـزە یەکێکـە لەو دیـاردانـە، بەئـەنـدازەیەك تا ئێستا لە خەیاڵی زۆر کەس دا مانای لەش یەکسـانە بە مانای سێکس یاخود لە روویەکی ترەوە جەستە وەکو قەوارەیەکی بەتاڵ لە چێژو لە سێکسی سەیر کراوە ، بایەخ نەدان بە غەریزییەتی لەش و چەمکە سروشتی‌یەکانی لەسەر حیسـابی سەیـرکـردنی جەستە بووە وەکو هەڵگرێکی رووتی (لۆگۆس)، یاخود وەك لە بەریانە لاهووتی‌یەکان و رۆحانی‌یەکان دا دەبینین لەش هەمیشە وەکو ئەو قەوارە ماددی‌یە سەیرکراوە کە (روح) دەشـارێتـەوە (لەشیعـری کلاسیکی کوردی دا دەتوانین دەیەها نمونە بدۆزینەوە). لای ئەو بەریانە ژیانی روح لەسـەر مەرگی جەستـە وەستـاوە، تا ئەو ساتەی کە جەستە زینـدووە رۆح ناگـات بە موتڵەق، لای بەریـانە ئایدۆلۆژی‌یە دۆگماتیەکانیش هەمان شێوە، دوا پرۆژەو دوا خەون لەسەر دوا هەنـاسـەی جەسـتـە بونیـاد دەنـرێ، ئەگـەر لەش لای غەیبیانی‌یەکان پرۆژەی فەنابوون بێت، خۆراکێك بێت «سۆفی» دەیـدات بۆ یەکگـرتنـەوە لەتـەك موتڵەق دا لای دۆگمـاتی‌یە ئایدۆلۆژی‌یەکان لەش پرۆژەی شەهادەت بووە، دەبێ بمرێ تا یۆتـۆپیـا ئایـدلۆژی‌یەکان بەرقەرار بن، بەرقەراری تێروانینە ئایـدۆلۆژی‌یەکان بۆ جەستە بە رادەیەك بووە کە نەوەك تەنیا قەوارەی لەش و کێشەکانی فەرامۆش کراوە بەڵکو هەموو ئەو تێروانین و فەلسەفەو بەریانە فیکریانەی کە لەش چەقی تێروانین وبـیرکـردنـەوەیـان بووە فەرامۆش‌کراوە، لێرەوە وەکو بەزەقی دەبینین «باقلۆفیەت» وەکو بەریانێکی تایبەت بەشیکـردنـەوەی فیـزیۆلۆژی دەماغ وئیشکردنی وەك ئەلتەر ناتیفی ئەبستیمی «فـرۆیـدییـەت» سەیـرکراوە کە بەریانێکە لەسەر چۆنیەتی دیسپلین کردن و چەپاندن و چارەنووسی غەریزە جەستەیی‌یەکان دەدوێ. بەخشینی لەش بە موتڵەقێکی غەیبی و بەخشینی بە ئایـدۆلۆژیـا رووبـەری گەورەی تێروانینمانی داگـیرکـردووە سەبـارەت بە لەش .. (فـەنـابـوون لە خوادا شەهادەت) ئەو دوو پەندە میتا فیزیکی و ئەخلاقی‌یە بوون کە بەردەوام زیندوێتی جەستەیان لە یاد بردۆتەوە، لێرەوە ئەگەر لە زۆربەی ساتەوەختەکانی پێشوودا لەش بۆ ئامانجەکانی دیکە ژیا بێت ، مەرجی یەکەمی دروستکردنی ژیارێکی راستەقینە سەرهـەڵدانی لە شێکە لە پێناوی مەسەلەی خۆی دا بژی و فەنابێ و شەهیدبێ، چونکە تەنها تێ نەگەیشتن لە سیستمی دیسپلین کردنی لەش وا دەکات پرۆژەی لە دایك بوونی لەش لە پرۆژەکانی دیکە داببرێت، چەقی تازەبوونەوەی هەموو ژیارێکی چەپێنەرو تیرۆریست لە سەرەتاوە تا دوایی دەکات بە ئیشکردن لەناو رام کردنی لەش و لادانی لەش و مراندنی لەش دا .. لێرەوە ئەم بەراوردکـاری‌یـە پرۆژەی دۆزینەوەی سەرەتایەکە لەتەك چەند وتارێکی بڵاونەکراوەی دیکەدا، هەندێکیان بەزمانی عەرەبی، لەژێـر ناوونیشـانی « دوانـدنی لەش ـ استنـطاق الجسد» بە ئومێدی ئەوەی بتوانین کەم تا زۆر پێ بخەینە ناو ئەو پانتاییە پڕ لە سیحرو ئاڵۆزی و نهێنی‌یەوە.

## سەرەتای دووەم

هەمیشـە سەیـرکـردنی جەستـە خەڵەتێنەرو درۆزنانەیە، بینینی فیـزیکیـانـەی دواهـەمـین بینـین نی‌یـە، راستـە دەرکـەوتووترین سروشتی لەش، سروشتی ئامادەگیەکەیەتی، ئامادەبوونی لێرەدا و لەبەر دەممان دا یان لە تەنیشتمانەوە یان لە هەر پانتاییەکی دیکەی ئەو دونیایەی کە تیا دەژین، بەڵام لێکچوونی لەش و ئەو یەکسانی‌یەی کە سروشتی ئامادەبوون و بەرچـاو بوونـی دەیسـەپێنێ، لێکچـوونێکی رووگـەش و سەرەتایی‌یە، ئەگەر پشکنینمان بۆ جەستە لە ئاستی بینین و لە ئاستی دەست لێدانەوە نەپەرێتەوە بۆ پشکنینی ئەبستیمیانەی لەش ، تێگـەیشتنی بەراوردکـاریـانـە لە لەش تێگەیشتنێکی

مەحــاڵە، لەبــەر ئەوە بەراوردکــردنــی لەش بە لەش و دەرەنجامەکانی ئەو بەراودە تەجریدیە بێ گومان بە ئەندازەی بەراوردکردنی دوو لەش لەدوو جێگای دەست نیشان کراودا سوودبەخش نابێت، ئەوەی کە ئێستا بەڵگە نەویستەو فیکری نوێ تاوو توێی کردووەو دەیکـات ئەوەیە کە لەش لە هەموو ژیـارەکـانی ئەمـڕۆدا لەشێکی سروشتی نییە، لەشێك نییە ڕەفتاری خۆی، مانای خۆی، جوڵاندنەوەی خۆی لە سروشتی خۆیــەوە وەرگــرتبێت، بەڵکـو جەسـتـەی ئیمـڕۆ جەسـتـەیەکە وردتـرین ڕەفتارو ماناو جوڵاندنەوەی لە ژێر زەبری دیسپلین کردن دا لە دایـك دەبێت، لێرەوە هەمیشە بەراوردکردنی دوو لەش دەبێتــە بەراوردکــردنی دوو ژینگــە، ئەو بەراوردە لەوە دەردەچێت بەراوردی دوو بایــۆلۆژیــا بێت. بەڵکــو دەبێ بە بەراورد کردنی نێوان دوو پێکهاتووی سایکۆ ـ سۆسیۆلۆژی ، یاخـود بە مانـایـەکی دیکە بەراورد کردنی جەستە، بەراورد کردنی چۆنیــەتی غەریـزەکــان نییــە، بەڵکـو بەراورد کردنی چارەنـووسی غەریزەکانە، بەراورد کردنی ئەو هێزانە نییە کە لەناو هەر جەستەیەکدا ئیش دەکەن ، بەڵکو بەراورد کردنی ئەو جیهـانبینییــەیــە کە حوکمی ئەو هێـزانــە دەکـات، بەتــەنیا بەراوردکــردنی ئەو خەونـانە نییە کە جەستەکان دەیانبینن، بەڵکو بەراوردکردنی چارەنووسی یۆتۆبیاکانی لەشە، لێرەوەیە کە دەڵێین یۆتۆبیای لەش ڕەنگە لە زۆر ڕووەوە نیشانەی هەرەسی یۆتۆبیای شارستــانیــەکان و قۆناغە کۆمەڵایەتییەکان بێت ، بۆیە جارێکی دی دەتوانین بڵێین بەراوردکردنی لەش بەتەنها بەراورد کردنی نێوان دوو پانتاییی سایکۆلۆژی ـ سۆسیۆلۆژی جیاوازیش نییە، بەڵکو لە هەمان کات دا بەراورد کردنی هەموو ئەو پانتـاییــیـە ئەلتــەرنـاتیفانەی «بدائل»ی لەشە لەناو ئەو هەرەسەدا، لەش چەندە ڕووبەرێکی دیسپلین کراوە هێندەش شیــاوە ببێتە تەرمۆمەتری تێکشکاندنی ئەو دیسپلینە، چەندە پتر شارستانیەت هەرەس بهێنێ و بەرەو ڕێگاو دەرگای داخراو بڕوات بوار لەبەر دەمی لەشی ڕاستەقینەدا پتر دەبێت یۆتۆبیای خۆی وەك جێگــیری هەرەسی پرۆژەکــانی دەرەوە دابــڕێــژێ، تایبــەتمــەندێتی لەش پتر لەو ساتانەدا دەردەکەوێ کە دوای هەرەســە گەورەکــان و دوای دیسپلینــە گەورەکــان و دوای تێکشکــانـدنی پرۆژە ڕادیکـالە کۆمەڵایەتییەکان پتر ڕوو لە بونیـادنـانی ئەلتەرناتیفی خۆی دەکات، ڕەسەنی و دروستی جەستە پابەندە بەوەی تا چ ئەندازەیەك مل کەچی ڕام کردن و دەستەمۆبوون نابێت، جەستەی ڕاستەقینە ئەوجەستەیەیە کە دیسپلین ناکــرێ ، هەمــوو هەوڵ دانــەکـانی ڕام کردنی لە شاردراوەترین هەوڵ دانەوە کە ئەخلاقە تاوەکو ئاشکراترینیان کە سزاو قامچی و ئەشکەنجەیە بێ سوودە لەگەڵ سەرکێشی و مل نەدانە بەردەوامەکەی دا.

لەبەر ئەو ڕاستیانەیە کە دەڵێین لەش لە بەراوردا بەتەنیا دەرناکەوێت، کاتێکیش کە دەردەکەوێ هەموو ئەو هێزانەش لەو دیویەوە دەردەکەون کە دەیانەوێت دەستەمۆی بکەن، هەموو توانــای جەستــەشی لەتــەکدا دەردەکــەوێ بۆ هەڵهـاتن لە دەستەمۆبوون .. واتە بەراورد کردنی جەستە لە هەمان کات دا بەراوردکــردنی هەمــوو ئەو هێـزە دژانەیە کە لەناو ڕووبەری جەستــەدا بەیــەکدا دەچن و شەڕ دەکەن وەکو «سروشت و کۆمــەڵ» و «ئایدیۆلۆژیاو یۆتۆبیا»، «عەقلانیەت و غەریزە»، واقیع و خەون » ، « ئایین و سێکس»، «ئەخلاق و ئازادی» لێرەوە سوڕاندنەوە لە بواری جەستەدا سوڕاندنەوەیە لە بەرینترین زەمینی سۆسیــۆلۆژی و سایکــۆلۆژی دا، هەر ئەو تێکچــڕانە گەورەیەشە وا دەکات بەگژدا چوونەوەی پرسیارو کێشەکانی جەستــە، گرنگتــرین و پڕ مەتــرسی ترین بوار بێت کە عەقــڵی ئەبستیمی داهاتوومان بەگژیا بچێ.

## «دۆستی خاتوو چاتەرلی» و «میم»

ئاشکرایە لەش ناوەندی سەرەکی ناو فەلسەفەو بیرکردنەوەی « دی . ئیچ . لۆرانس»ە ، بەلام ناتوانین بڵێین ناوەندی هەموو بیرکـردنــەوەو جیهــانبینی «شێرزاد» حەسەن»ە، لە ڕۆمانی « دۆستی خاتوو چاتەرلی» دا لەش حوکم دەکات، لەش بە هەردوو شێوەکەی لەشی خائین و لەشی دۆست، لەشی یە هوودایی و لەشی مەسیح، جەستەیەکی ئیفلیج لەتەك جەستەیەکی زیندووەوە، جەستــەیــەکی مردوو کە جەستــەی «کیلفــۆرد»ە ، لەتــەك دەستەیەکدا کە خۆی نوقمی لەزەت دەکات و بەهەموو توانا و وزەی خۆیەوە ڕوو لە ژیان دەکات . لە چیرۆکی «میم» یشدا دوو جەستە هەیە، جەستەیەکی ئیفلیج و جەستەیەکی پڕ لە ئارەزوو

-مەیان ڕووکەشی هەردوو دەقەکەیە. ئاستی یەکەمی دابەش بوونی جەستەکان ئەو پۆڵینە سادەیەمان دەخاتە بەردەست، پۆڵینێك کەلەسەر ئاستی «دال» ەکان وەستاوەو ناگات بە شیکردنەوەی جیاوازی‌یە دەلالیەکان، لەش خۆی «داڵە» واتە سروشتی جەستە لە ئاستە سیمیائیەکەی دا دالی جەستەیە، بێ گومان چاکتر وابوو دالێکی داخراوو نەگۆڕ بێت چونکێ هەمەرەنگی دەلالەتەکانی لەش نیشانەی هەمەرەنگی دوورکەوتنەوەی لەشە لە سروشتی خۆیەوە.. لەش لە دەرەوەی ژینگە شارستانیەکانی ئەم ساتەدا (داڵە)، بەڵام ئێستاو لەناو شارستانیەکانی ئەمرودا مانا جیاوازەکانی خۆی لەو پانتایی‌یەوە وەردەگرێ کە تیایدا سیفەتە سروشتی‌یەکانی لەش دەگۆڕێت بۆ سیفەتە پەککەوتەکانی لەش. بوونی لەش لەناو ژینگە پیشەسازی‌یە بەرخۆری‌یەکانی «ئیستهلاکی‌یەکانی» ئەمڕۆدا هەموو مۆرکێکی سروشتی لێ زەوت دەکات، بە ئەندازەیەك دەتوانین بڵێین لە هیچ بوارێکدا کاریگەر نوشوستی سروشت لەبەردەم سیستمە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان دا وەکو بواری «لەش» بەرجەستە نابێ، دەتوانین بە دڵنیایشەوە بڵێین کە مێژووی لەش پابەندە بە مێژووی تەسك بوونەوەو چوونەوەیەکی ژیانی سروشتی لەش، ئەوەندەی بایۆلۆژیاو فەرمانە بایۆلۆژی‌یەکانی لەش بکەونە ژێر ڕکێفی سۆسیۆلۆژیاو زەبرە دەروونی‌یەکانەوە هێندە بەرەو زەمینی مەدلوولەکانی جەستە دەڕۆین و لە زەمینەی (دال)یەتی لەش دوور دەکەوینەوە لە لەش دا بایۆلۆژیا داڵە، دالێکە پانتایی‌یە سۆسیۆلۆژی و مێژووییەکان دەلالەتی دەدەنێ، لێرەوە یەکەمین تێرامان لەلەش هەر چوار پاڵەوانە سەرەکیەکەی «دۆستی خاتوو چاتەرلی» و «میم» دا چوار گۆشەیەکمان دەداتێ کە نیشاندەرەوەی سروشتی «دالەکانە» وەکو دروستبوونی بایۆلۆژی:

| لەشە تەندروستەکان | | لەشە ئیفلیجەکان |
|---|---|---|
| کۆنستاس | کلیفۆرد | |
| کولناز | ئەمین | |

هێلکاری -١-

بەڵام بێ گومان هەموو وەستانێك لەسەر ئەو دەرەنجامە وەستانە لەسەر ئاستە ڕووکەشەکانی هەردوو دەقەکەو وەستانە لە ئامێزی بەراوردی ئەو لێکچوونە فیزیکیەی کە پاڵەوانەکان لەیەکدی نزیك دەکاتەوە بەدەر لە هەموو ئەو ڕووبەڕو پانتاییانەی لەناوی دا لە یەکتر جیا دەبنەوە .. کۆتایی هێنانە بە لەش لە پنتی بایۆلۆژیادا، وێنەگرتنی لەشە بە تەنها دوور لەو دەلاقانەی‌کەفری‌دراوەتە ناوی وێنە گرتنی جەستەیە بە جیاکردنەوەی لە سینۆگرافیای ئەو شوێنەوارانەی تیا دەژی.

بەڵام وەستان لەسەر ئاستی دالەکانیشدا بێ سوود نی‌یە، بەڵکو هەموو (دالێك) دەستەڵاتی خۆی هەیەو فەرمانرەوایی خۆی هەیە لە کاتێکدا کە تەنها وەکو «دال» یش دەچێتە دۆخێکی بەراوردکاری‌یەوە لە تەك «دال» ەکانی تردا، لە هەردوو دەقەکەدا ناکۆکی‌یەکی گەورە هەیە کە دژایەتی نێوان «ئیفلیجی» و «تەندروستی»یە ئەم دژایەتی‌یە لە ئاستە سەرەتاییەکەی دا دژایەتی دوو.
(داڵە) کە بەجەستەی هەردوو دەقەکەدا چۆتە خوارەوە، بەڵکو ململانێی ڕووکەشی ناو هەردوو دەقەکەیەو لە زۆرکاتدا پانتایی مەد. لوولە قووڵەکان و بونیادی ڕاستەقینەی دژایەتی‌یەکانمان لا ون دەکات، دەقەکان لەبەر چاومان کورت دەکاتەوە بۆ ناکۆکی نێوان لەشێکی ئیفلیج لەبەرامبەر لەشێکی ساغدا.

لە هەردوو دەقەکەدا لە ئاستی بایۆلۆژیادا لە نێوان بونیادی لەشەکان دا لێکچوون هەیە ، بایۆلۆژیای جەستەکان بەیەکسانی لە نێوان «میم» و «دۆستی خاتوو چاتەرلی» دا دابەش بووە، بەڵام لەش بەتەنها بایۆلۆژیا نی‌یە، لەزەت پابەند نی‌یە بە ئاناتۆمی جەستەوە، لەم دوو دەقەدا شەڕێکی گەورە لە نێوان ئیفلیجی و لەزەت دا هەیە، یاخود بڵێین لە نێوان مردن لەلایەك و سێکس لەلایەکی دیکەوە، جەستەیەك هەیە دەمرێ و جەستەیەك هەیە سێکس دەکا، لەشێك هەیە دەتوانێت سێکس بکات و لە شێك هەیە ناتوانێ، لە هەر دوو چیرۆکەکەش دا ڕۆمانەی «لۆرانس» و چیرۆکەکەی « شێرزاد »دا ئەو جەستەیەی کە تەندروستی‌یە»یان بڵێین «ئازادە» ئافرەتە، ئەو جەستەیەی

که ئیفلیجه جەستەی نێره. نێرایەتی یەکی خەسیو لەبەرامبەر مێیـایـەتیەکی بزێو (کەلەدوا بەشی ئەم باسەدا دەگەڕێینەوە سەر دەلالەتەکانی) بەلام وەکو دەبینین تا ئێستا لەسەر زەمینی دالەکان دا دەسووڕێینەوە، هەموو ئەو قووڵ بوونەوەیەشمان قووڵبـوونـەوەیە لە پنتی بایۆلۆژیادا، داوا لە خوێنەر دەکەین سەرنجی هەرسێ ئاستە سەرەکییەکانی ناو ئەو دالانە بدات (١) ئیفلیجی ـ تەندروستی (٢) بێ سێکسی ـ سێکسی (٣) پیاو ـ ئافرەت

| | ا | پ |
|---|---|---|
| ١) | ئیفلجی | تەندروستی |
| ٢) | بێ سێکس | سێکسی |
| ٣) | پیاو | ئافرەت |

٢

هەرسێ دژایەتییەکە سێ ئاستی جیاوازن لە جیاوازی بایلۆژی هەر چەنـد دالەکـان یەك یەکتـری ڕاناکێشن،
واتە ئەگەر لە ئاستی ئاسۆیی (١،٢،٣) دا پەیوەندی دالەکان دژایەتی بێت ئەوا پەیوەندی دالەکان لەسەر ئاستی ستوونی پەیـوەنـدییەکی لاوازەو بۆندی پەیوەستن بۆندێکی کزە، واتە بایـۆلۆژیـا وەکـو یەك یەکـە ناتوانێ ئەوە لێك بداتەوە کە بۆ [نێرایەتی = بێسێکی] یابۆ [ئیفلیجی = بێ سێکسی] یان بۆ [نێرایەتی = ئیفلیجی] چونکێ وەکو دەبینین ئەو پەیوەندی یانە پەیوەندی بایۆلۆژی نین، بەڵکو کۆمەڵێك پەیوەندین.. دەقەکان (هـەردوو دەقـەکـە) هەریـەك بەسـەربـەخـۆو بەپێی یاسا ناوخۆییەکانی خۆیان خوڵقاندوویانە.
لەبەر ئەوە بەبێ گەڕانەوە بۆسەر دابەش بوونی ڕووبەرەکانی ئەو
دوو دەقـە ناتـوانـین کلیلی کردنەوەی دونیای «مەدلوولەکان» بخـەینـەکار. لەهەر یەکێك لەو دوو دەقەدا دوو جەستە هەیە یەکێك «ئیفلیج» و یەکێك «تەندروست» ، بەلام هەر یەکێك لەو دوو دەقە بە جەوهەر دەقی جەستەیەکە بەتەنها، لای «لۆرانس» لەشی خاتوو (کۆنستانس) لەشی سەرەکییەو لەشی «کلیفۆرد» لە پەراوێـزی لەشی «کـۆنستـانس» دایە، لە دەقی «میم» دا بە پێچەوانەوە پانتایی سەرەکی پانتایی «ئەمین»ەو لەشی «گوڵناز» لەشی پەراوێـزیی ناو دەقـەکـەیـە .. هەر ئەم جیـاکـارییە سەرەتایەش دەبێتە دەروازە بۆ جیابوونەوەی تەواوەتی هەردوو دەقـەکـە، لێرەوە هەر دەقـەیـان بەرەو دونیـایـەکی تایبەتیو سەربـەخـۆ سەر هەڵدەگرن، پانتایی سەرەکی «میم» پانتایی ئیفلیجییـە، لە کاتێکـدا پانتـایی «دۆستی خاتـوو چاتەرلی» جەستەیەکی تەندروستەو چەق و ناوەند لە چیرۆکی «میم» دا پیاوێکی خەسیوە، لە کاتێکدا «سێکس کردن» زۆربەی زۆری ڕووبـەرەکـانی چیرۆکەکەی «لۆرانس»ی گرتۆتەوە، لێرەوە ئەو دابـەش بوونـە سەرەتاییەی کە لە چوار گۆشەی یەکەم دا بەرچـاومان کەوت تێك دەشکێ و دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ڕووبەری دابەش بوونی (دالەکان) لەناو دوو دەقەکەدا چوون یەك نییـە، بەڵکـو هەریەك لەو دوو دەقە ڕوو لە خوێندنەوەو سەرنج دانی لە شێك دەکات پێچەوانەو دژی تەرزو شێوازی جەستەکەی ترە، بۆیە هەموو بەیەك شوبها ندنێك لە نێوان ئەم دوو دەقـەدا هەتا ئەگەر لە ئاستی بونیادی ڕووکەشی (البنیة السـطحیـة)ی دوو دەقـەکـەش بێت، بەیـەك شوبهاندنێکی هەڵەیەو بۆ چوونێکی سەرەتایی و سادەیە،
چۆنیەتی جیا بوونەوەی ئەو دوو دەقە لە ڕووی دابەش بوونی جەستەکانەوە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

دۆستی خاتوو چاتەرلی

| پانتایی ئیفلیجی | کلیفۆرد | کۆنستانس | پانتایی تەندروستی |
|---|---|---|---|
| | ئەمین | گوڵناز | |

میم

هێلکاری ـ٢ـ

واتە ئەم دوو دەقە لە بنەڕەتەوە دوو دەقی جیاوازن ، دوو جۆر جەستـەی جیـاوازی تیا دەژی و لێکچوونە سەرەتاییەکەی یەکەم جار دەرمنجامێکی کەم خایەن و بێ تەمەنە.. «لۆرانس» ڕوو لە لەشێکی بێ غەوش و بێ نوقسانی دەکات، لە کاتێکدا «شێرزاد» بەرەو ئەناتۆمی کردنی ژیانی ئیفلیجی هەنگاو دەنێ

، لۆرانس بایـۆلۆژیـای ساغ و تەندروست دەکاتە سەنگەری خۆی بۆ هێرش بردنە سەر دونیاو گەیاندنی ئەو جیهانبینی یە نەهەلستی یەی، لە کاتێکدا شێرزاد ئیفلیجی دەکاتە دەروازەی هەجوکردنی ئەو دونیایەی مەبەستیەتی، ئەم جیابوونەوەیە بە هەمـوو دەرەنجـامـە جیاوازەکانی یەوە ئەو دوو دەقە دەخاتە ئەمبەرو ئەوبـەری یەکترو تا ئەندازەیەکیش ئەوە بەرجەستە دەکات کە دوو دەقی دژن نەوەکو تەبا، سروشتی بەیەکدا چوونی «دۆسـتـی خاتـوو چاتـەرلی» لە «مـیـم» دا سروشـتـێکی شەرانگێـزانەیە، واتە شێرزاد لە لۆرانس نزیك دەبێتەوە تا بە جۆرێکی بەرفـراوان لێی دوور بکـەوێتـەوە، هەنـدێـك لە ڕەگەزەکانی نزیك دەخاتەوە تا لە جیهانبینی دا لێی جیا بێتەوە، لێرەوەیـە کە لۆرانسیـەتی شێرزاد لۆرانسیـەتێکی کاتی یـە، ساتەوەختی لۆرانس لای شێرزاد ساتەوەختێکی کورتە کە دواتر دەکاتە ڕادەی دژایەتی و هەناوی سیستمی ڕەگەزەکان و ڕێك خستنیان دا، لە ڕێکخستنی فەرمانی یەکە سەردیەکان دا ئەو دژایـەتـی یـە تەواو بەرجـەسـتـە دەبـێـت .. بەڵام ئەم شیکـردنەوەیەمان تایبەتە بەو جیاوازیانەی کەلە سەیرکردن و هەڵسەنگاندنی جەستەدا هەیە لە نێوان هەردوو نووسراوەکەدا لێرەدا باسمان لەو مەدلوولە جیاوازانەیە کە هەریەك لە (لەش ـ سێکس ـ ئیفلیجی) وەری دەگرن و دەستەڵاتی ئەو مەدلولانە لەسەر جوڵاندنەوەی پاڵەوانەکان، هەر لە ڕوانگەی باوەڕهێنان بەوەی کە (خـوێندنەوەی دەق/ خوێندنەوەی دونیا) ئەمبەرو ئەوبـەری یەك هاوکێشـەن بە ئەنـدازەی جودایی دەقـەکان جودایی جیهانەکان دەبینین و بە ئەندازەی جودایی جیهانەکان جودایی جیهان بینیەکان دەست نیشان دەکەین. بەوەدا کە خوێندنەوەمان.

خوێندنەوەیەکی بەراوردکاریە .. لەسەرەتاوە دەڵێین لەناو کەلێك پانتایی گرنگی جەستەدا ـ

١) ئاراستەی جوڵاندنەوەی جەستە سەرەکی یەکان (ئەمین کۆنستانس) بەراورد دەکەین.

٢) ئەو جیـاوازیـانـەی «سروشـتـی سێـکس» لە دوو نووسراوەکـەدا لەیـەك جیـا دەکاتەوە .. واتە پشکنینی ئاکاری سێکسیانەی « گوڵناز ـ کۆنستانس » یش دەخەینە ژێر بەراوردەوە.

٣) دەگـەڕێـین بە دوای دەلالەتەکانی ئیفلیجی دا .. بە بەراوردکردنی «ئەمین ـ کلیفۆرد» لە چیرۆکەکەو لە ڕۆمانەکەدا.

## ئاراستەی لەش «بەرەو مەرگ»، «بەرەو ژیانەوە»

کە باس لە ئاراستەو جوڵاندنەوەی لەش دەکەین مەبەستمان جۆرێکـە لە جوڵانـدنـەوە کە ئەزمـوونێکی تایبەتی بۆ جەستە دەخـوڵقێنێ جیـاواز لەو ئەزمـوونـانـەی کە زۆربـەی زۆری جەستەکانی دیکە لە ناوی دا دەژین .. مەبەستمان جووڵەیەکە هەوڵ دەدات پێچەوانەی ئەو تەوژمانە بڕوات کە جەستەکانی دیکـە لەگـەڵ خۆیدا دەبـات، واتـە جەسـتـەو گواستنەوەی جەسـتـەیە لە ناوەندێکەوە بۆ ناوەندێکی تر، لە ڕستێك زنجیرە پەیوەندی یەوە بۆ ڕستێك زنجیرە پەیوەندی دیکە، بەومانایەش جوڵاندنەوەیەك لەش دەبێتە جوڵاندنەوەیەکی چارەنووس ساز،

، هەر جوڵاندنەوەیەك لە «جەستە» دا کە ڕەنگ دانەوەی هەڵبـژاردنێکی و جودی قووڵ نەبێ کە ببێتە پەنتی ستراتیژی مان و نەمـانی مرۆڤ .. هەر جووڵەیەك بەشێك بوو لە دەورە کۆمەڵایەتی و جینسی یە ئاسایی یەکانی فەرد (نەوەك دەرچوون بێت لە دەورە دیسپلین کراوەکان) بە جووڵەیەکی ڕاستەقینەی لە قەڵەم نادەین. جوڵاندنەوەی «کلیفۆرد» بە دەوری ئەو دونیایە دایە کە خولقاوە، بەڵام جوڵاندنەوەی (ئەمین) بەرەو دەرەوەی ئەو دونیایەیە، واتە بەرەو خوڵقاندنە نەوەکو «خوڵقاو»دا لەشی سڕ لەشێکە لەناو خولقاو دەمێنێتەوە، بەڵام جەستەی ڕاچەنیو هەتا ئەگـەر لەسـەر ئاستی (خەون) یش دا بێت بەرەو «خوڵقان» دەڕوات .. بۆیە سەد دەر سەد ئەومافە دەبەخشینە خۆمان کە بڵێـین (واقیعی بوون) سروشتی جەستـە سڕو مردارەکـانن، (یـۆتـۆپیـا) سروشتی جەستە ڕاچەنیوەکانە، (واقیعی بوون) مانەوەو ژیان و هەناسەدانە لە ناو ئامێرێکی کۆك کراودا، واتە بوونە برغویەکی ئۆرگانی یە لە سیستمێکی نەگۆڕدا، (واقیعی بوون) سیمـای (عەقڵیانەی) سروشتی جەستە سڕەکانە .. لە کاتێکـا (یـۆتـۆپیا) خەونێکە جەستەیەکی ڕاچەنیو لە عەقڵ و خەیـاڵ و ڕۆحی دا پەروەردەی دەکـات بۆ گواستنـەوەی لە ڕووبـەرو پانتـایی یـەکانی خەیاڵەوە بەرەو دەرەوە .. بۆیە لە

(فەنتازیا) دا دەشێ پەرینەوەی گەورە لە خولقاوەوە بەرەو خولقان بەدی بکەین، گواستنەوەیەکی زۆریش لە دیسپلین کردنەوە بۆ دەرەوە ببینین. ئەو راستی‌یە وا دەکات هەست بە موفارەقەیەکی گەورە بکەین تا ئەو رادەیەی بڵێین خەونێك لە خەونەکانی ئەمین پتر بارگەی جوڵاندنەوەی هەڵگرتووە لەهەموو سێکساندنە واقیعی‌یەکانی گوڵنار،

لێرەوە (واقیع سڕبوون) لەلایەك هۆکری‌یەك دروست دەکەن، (خەون - جوڵاندنەوە)ش هۆکری‌یەکی پێچەوانەو دژی ئەوی دیکە دروست دەکەن لەم بەراوردەدا کە (کونستانس)و ئەمین بەراورد دەکەین لەبەر ئەوە نی‌یە کە پاڵەوانی سەرەکی دەقەکانن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە بوونە پاڵەوانیان دەرەنجامی ئەوەیە کە بکەری فەرمانێکن ڕووبەری سەرەکی دەقەکان دادەپۆشێ .. کە فەرمانی (دۆزینەوەی ئاراستە)یە .. کیلفۆرد تەنێکی وەستاوە، گوڵنازیش جوڵاندنەوەیەکی چارەنووس سازی نی‌یە، جگە لەوە جوڵاندنەوەکانیشی بابەتی سەرەکی دەقی (میم) نین .. گوڵنازیش کە بەراوردی دەکەین لەتەك ئەو جوڵاندنەوە گەورەیەو ئەو وزە شاردراوەیەدا کە «ئەمین» و «کۆنستانس» پیشانی دەدەن وەکو تەنێکی وەستاو دیارە، مێیەکە لە ناو مێیایەتێکی ئەندازەکراوو خەسێنراودا دەژی، سروشتی ژیانی (وەکو دوایی ڕوونی دەکەینەوە) سروشتێکە ئەندازەکاری نێرەکان کێشاویەتی ، بۆیە لەم بەشەدا پتر قسەمان لەسەر ئاراستەی لەشی «ئەمین» و «کۆنستانس»ە .. چونکە چارەنووسیان دەرەنجامی هەڵبژاردنێکی چارەنووس سازە، هەڵبژاردنێك کە تەواوی لەش و تەواوی چارەنووس دەگۆڕێت. بەڵام لای پاڵەوانێکی وەکو (کلیفۆرد) لەش خاڵی سەرەکی و دەرەنجامی سەرەکی نی‌یە. جیابوونەوە لە سەیرکردنی جەستەدا، لە هەمان کاتدا جیابوونەوەیە لە سەیرکردنی جیهان دا، ئەوانەی کە دەشێت لەسەر یەك تێڕوانین بۆ «جیهان» یەك بگرنەوە، چ «لۆرانس» و چ «شێرزاد» دوو جەستە دەهێنن و هەر جەستەیەکیش جیهانبینی‌یەك لە تەك خۆی دا کێش دەکات ..لە سادەترین سەرنج دا نزیکی جیهانبینی « ئەمین» و «ک. نستانس» زیاتر دەبینین لە نزیکی‌یەکانی دیکە.. بەڵام ج. هەری جیابوونەوە لەوە دایە کە

ئەو جیهانبینی‌یەی لای «لۆرانس» جەستەیەکی ساغ هەیەتی ، لای شێرزاد جەستەیەکی ئیفلیج هەلیگرتووە... لێرەوە قەیرانی دوو پاڵەوانەکە جیا دەبێتەوەو قەیرانی دوو دەقەکەش لەیەك دەترازێت .. دۆزینەوەی مەدلوولی ئەو جیابوونەوەیە دۆزینەوەی مانای هەموو سیستم و زنجیرە ماناکانی ئەو دوو دەقەیە لە بەرامبەر ئەم دوو دەقەدا لەبەردەم پرۆژەی تێك شکاندنێکی نمونەیی بەیەکدا چوونی دوو دەق دا دەژین، ئەگەر ڕوونتر قسە بکەین دەڵێین دەقێك دێت کە «میم»ە لە ئەستی کارکردنی خۆیی و پرۆسیسی خولقانی‌دا دەقێکی دیکە دەکاتەوەو لە حاڵەتی نائامادەوە دەیخاتە سەر حاڵەتی ئامادەکە دەقی « دۆستی خاتوو چاتەرلی»یە، لە هەوڵی دا بۆ دووبارە بەرهەم هێنانەوەی ئەو دەقە لە ساتەوەختێکی ئەبستیمی جیاوازدا دەقی دروست بوو لەبری ئەوەی بهێتە دۆخێك لەو دۆخانەی کە دەشێ دەقە سەرەکی‌یەکە رابکێشێتە ناو ساتەوەختی ئەبستیمانەوە دەقێکی دژ بە دەقە سەرەکی‌یەکە دەخولقێنێ ، واتە دەرەنجامی پرۆسیسی «تناص - بەناویەکداچوونی دەقەکان» لە نێوان ئەم دوو دەقەدا لەبری «دەقێکی هاوشان» بەرهەم بهێنێ بەدەقی خواستراو «دەقێکی دژ» بەرهەم دەهێنێ لەم دۆخەدا «تناص» کردنی دەق لەگەڵ پانتایی سۆسیۆلۆژی خۆی دا دەشێ بەرفراوانتر بێ لەگەڵ «تناص» کردنی دا لەگەڵ دەقێکی خواستراودا.. بەڵام با لەناو دەقەکان دا ئەو پرۆسیسە ببینین .. لەلای «لۆرانس» لەش لای پاڵەوانێکی وەك «کلیفۆرد» هۆکارە «وسیلة» کە دەشێت هەر شتێکی تر پڕی بکاتەوە، هەتا لەکاتی ئیفلیجی و بێ سێکسی دا دەشێت لە شێکی تر لەبری ئەو سێکس بکات و لەبری ئەو منداڵێك لە کونکوڵی خاتوونی ئەودا بچێنێ، بەڵام لەش لای «کۆنستانس» غایەتەو یەکێکە لە هەرە زمانە گرنگەکانی مرۆڤ، لێرەوە لای «کۆنستانس» هەموو شتەکانی تر پردن بۆ گەیشتنەوە بە لەش . «لەش» لەم حاڵەتەدا تەنها ئاراستەی خۆی دیاری ناکات ، بەڵکو شووناسی شتەکانی‌ووروبەریش دیار دەکات، ئاراستەی جوڵاندنەوەی لەشی (کۆنستانس) بەرەو گەرانەوەیە بۆ سروشتی لەش ئەم جوڵاندنەوەیە کارێکی کردووە کێشەی دەقەکەی لۆرانس کێشەیەکی ئەخلاقی نەبێت لە نێوان کردنی سێکس و نەکردنی

دا، لە نێوان سێکسی شەرعی‌و سێکس نا شەرعی دا بەڵکو کێشەکە لە نێوان لەشێکی تێ ئاوارەو لە شێکی سروشتی دا بێت..

لەنێوان «لەش» و «کۆمەڵ و مێژوو» دا بێت ، بۆ خۆ داماڵین لە هەمـوو ئەو پانتـاییـیـانـەی جەستـەیەکی سروشتی دەکاتە جەستەیەکی دەستەمۆ ئاراستە وەرگرتنی لەشی (کۆنستانس) بە تەنها شکاندنی چوارچێوەکانی ئەخلاق نی‌یە، بەڵکو لادانی کۆی سیستمێکە. لەشی «کۆنستانس» بەوە ئازاد نابێ کە لەگەڵ «میلۆرز» دا بنوێ و لەگەڵ «کلیفۆر» دا بژی، بەڵکو بەوە ئازاد دەبێت لەسـەرجـەمی ئەو دونیـایە بچێتە دەرەوە کە «کیلفۆر دەکان» بونیادیان ناوە .. واتە لەگەڵ « میلۆرز» دا بنوێ و لەگەڵ میلۆرز ـ دا بژی . جوڵانـدنـەوەی لەشی «کـۆنستـانس» لە ژینگەیەکی شارستانیەوەیە بەرەو «سروشت» ... بەوەدا کەلەشی «کۆنستانس» لێوان لێوە لە ئارەزوو و لەزەت و زیندەگی و لە ژینگـەیـەکی نیمچـە لیبرالی دا دەژی، پرۆژەی یاخی بوونی پرۆژەیـەکـە بوارەکـانی هاتنـەدی و بەرهەم هێنانی کراوەیە، ڕۆمانەکەی «لۆرانس» گرفتێکی داخراو ناخاتە ڕوو، چونکە لای لۆرانس یەك ئەخلاق هەیە ئەویش ئەخلاقی «ئازادی» یە لای لۆرانس گۆڕیـنی جێگـای لەش لە هەمـوو شتـەکـانی تر بایـەخـدارتـرە بە جوڵانـدنیشی بۆ لەش نایـەوێ بونیـادە کۆمەڵایەتی‌یەکان تێك بشکێنێ هێندەی کە مەبەستیەتی لەش ئەلتـەرنـاتیفی خۆی بهێنێتـە دی لای لۆرانس لە بونیـادی کۆمەڵگای پیشەسازی دا پانتایی پاك نەماوە، تەنیا ئەلتەرناتیف، ئەوەیە کە لەش دووبارە خۆی بدۆزێتەوەو لە جەرمیانی هەموو ئاراستە لە قاڵب دراوەکانی «لیبدۆ» کە شارستانیەت و تیرۆری کۆمـەڵایـەتی و ئەکلیرۆسیـانە دەست نیشانی دەکات بڕواتە دەرێ، هێنـانـەدی ئەو کردارەش پابـەنـدی ئەو بابەتەیە کە «لیبـدۆ»ی ئاراستە دەکرێ.. ئازادی «کۆنستاس» یانە مانای سەنـدنـەوەی لیبدۆ نی‌یە لەو بابەتانەی ژینگەی کۆمەڵایەتی دەیخـاتـە بەردەمی بۆ گێڕانـەوەی ڕووەو جەستـە خۆی، جوڵانـدنـەوەیـەك نی‌یـە لە بابـەتێکی هەڵەو دژوارەوە بەرەو (نـەرسیسیـەت) هێنـدە، دۆزینـەوەی بابـەتێکەکە لەش لە نەرسیسیەتێکی باسیۆلۆز ڕزگار دەکات ، بابەتیش لە ڕێگای ئەو پەیوەندی‌یەوە لە سیف ، شارستانیەکانی دەبێتەوە. لێرەوە جوڵاندنەوەی (لیبدۆ) لە جەستەی «کۆنستانس» دا لە بابەتە هەڵەکەوە کە «کلیفۆرد» ە نی‌یە بۆ ناوەوە .. لە دەرەوە نی‌یە بۆ (نەرسیسیەت) ، بەڵکو هاوشان بە گواستنەوە لەش

لە «کلیفۆرد»ەوە بۆ «میلۆرز» لیبدۆ لە پەیوەندی خۆی بە بابەتە شارستانی‌یەکانەوە دەپەڕێتەوە بۆ چەسپ بوون لەسەربابەتێك کە لە سروشت دا تەبایە بە جەوهەری لەش و سێکیس خۆی، بۆیە بوونی بکەرێکی زیندوو لەناو دەقەکەی لۆرانس دا یەکێکە لە پێویستی‌یە سەرەکی‌یە گەورەکانی ئەو دەقە، بەڵام بکەر لە «میم»دا ئیفلیجە، بکەری لۆرانس زیندوویکە لە ئیفلجێك جیا دەبـێتـەوە، بەڵام بکـەری شێرزاد ئیفلیجێکـە لە ساغێـك دادەبڕێت، بێگومان جیابوونەوەی شووناسی بکەرەکانیش زۆر لە شووناسی کردارەکان و چارە نووسیان دیاری دەکات.

لە «میم»دا پۆلی ئیجابی‌و سەلبی هاوکێشەکان هەڵدەگەڕێتەوە بۆیە چارەنووسی«لەش» لەنێو دوو دەقەکەدا پێچەوانە دەکەوێتەوە.

لەشی ئەمین لەبەر ئەوەی خاوەنی وزەی (سێکسی)نی‌یە ناتوانێ ببێ بە کۆدیتا گێڕێکی سێکسیانە،«کۆنستانس» شۆڕشی خۆی بەسێکس بەرپا دەکات، بەڵام ئەمین چونکە پیاوێکی بێ چووکە (بلاقضیب) لە یەکێك لە هەرە گرنکترین چەکەکانی خۆی بووە، نەمـانی «چـووك» جەستە دەخاتە ناو قەیرانێکی کوشندەوە. هەڵەی‌گەورە لەوەدایە کە لەشی ئیفلیج و بێ چووك بە لەشێکی بێ ئایـرۆسی بزانـین ، لەشی ئەمـین ناتوانێ لیبدۆ لە ئەندامە وسێکسیـەکـانی‌دا چڕ بکاتەوە، بەڵام بەستنی ئەو ئەندامانە نبوونی لیبدۆ ناگەیەنێت (بەڵکو لە گۆشەنیگایەکەوە دەشێت ئەو سەخـاوەتە لە ڕادەبەدەرەی ئەمین وەك سێبەری چەقبەستنی لبیدۆ لە قۆناغی کۆمی‌دا ببینین (المرحلة الشرجية)، کەسیەتی ئەمـین ـ یش بە جۆرێکە لەتەرزی کۆمی « النمط الشرجي»لە قەڵەم بدەین، هەر چۆنێـك بێت لە دوا جاردا ئەمـین پیاوێکە ئەگەرچی خۆی هەستی سێکسی نەماوە، بەڵام دیکتاتۆرییەتی لۆگـۆس نەیـکـوشتـووە، تێگـەیشتنیشی لەلەش لە بۆتـەی سەیـرکـردنی ئایـرۆسیـانە دەرنەچووە (ئەگەرچی هێشتا بە بەراوردکـردنـی بە کیـلفـۆرد تارمـایـی هەمـوو خێـوە ڕۆژهـەڵاتی‌یـەکـان لە دەروونی دا دەبینینـەوە) ئەگـەرچی جەستەی ئەمین لە مەرگدا پرۆژەی خۆی بەدی دەهێنێ ، بەڵام

دەروونێکی مەرگ دۆست «نیکرۆفیل» لەو دیوی‌یەوە نی‌یە .. مەرگ لە «میم» دا درێژکراوەی ژیانە، لە هەمان کاتدا بلندکردنەوەو کۆتایی پێ هینانیشیەتی... لەشی کۆنستانس لەناو ژیان دا دەمێنێتەوە، گواستنەوەکانی گواستنەوەیە لە «شوێن» دا، بەلام ئاراستەی لەشی ئەمین لە ژیانەوەیە بۆ مەرگ، واتە لە ئاستێکی کەینوونی‌یەوەی بۆ ئاستێکی دی .. لە (بوون) موەیە بۆ (نەبوون) ، بەم جۆرە لەگەڵ ئەو چرکەیەدا کە جەستەکان ئاراستەی خۆیان وەردەگرن دەقەکان پتر لە یەکتری جیا دەبنەوەو ئەو چوار گۆشەیەی رابردوو بەمجۆرەی لێ دێ




بەلام ئەو پرسیارەی کە لێرەدا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەوەیە: وزەی کاری ئەو دوو جولاندنەوەیە چی‌یە؟ تەنیا وەلام لە هەردوو حالەتەکەدا «ئایرۆسیەتە» ئاشکرایە ئەم وەلامە بۆ کۆنستانس هیچ کێشەیەکی لەسەر نی‌یە، چونکێ لەشی کۆنستانس بە درێژایی هەموو رۆمانەکە لەناو سرووتە لەزەتاوی‌یەکانی خۆی دا نوقمە، بەئاسانی دەتوانین هەست بەو راستی‌یە بکەین کە لای کۆنستانس هەستان بە سێکس کردن هاوشانی زیندوو بوونەوەو پاک بوونەوە کۆنستانس لەزەت لە شەریعەتی بەرنامە ریزکراوی ئەرستۆ براتیکەوە رزگار دەکات بۆ لەزەتی سروشتی، ئایرۆسیەتێکی سەرچڵ دەخاتە کار بۆ خۆ راپسکاندن لە هەموو بەها ئەخلاقی‌یەکانی ئەرستۆکراتیەت و موحافەزەت کاران، سێکس رێگاو غایەتی ئەو پەرینەوەیە، واتا تەکتیک و دەرەنجامیشیەتی.. بەلام لەشی «ئەمین» لەشێکی بێ سێکسە.. بەواتا ئایرۆسیەتی.ئەو جەستەیە یەکێك لە بوارە سەرەکی‌یەکانی بەرجەستە بوونی دۆڕاندووە. لەشی ئەمین لەشی نێرێکی خەسیوە، جەستەیەکی بێ چووکەو جەستەی بێ چووکیش مانای جەستەیەکی بێ پەیوەندی سێکسی، جەستەی بێ پەیوەندیش مانای لەشێك شووناسی خۆی لە پەیوەندی نێوان ئافرەت و پیاودا بەدەست ناهێنێ، زۆربەی پالەوانەکانی شێرزاد بەر لە ئەمین دەبانەوێ بگەنە لەشێك، بگەنە ئافرەتێك کە خۆشیان دەوێ، بەلام ئەمین لە دونیای نێو چیرۆکەکانی «شێرزاد» دا پالەوانێکی دەگمەنە کە لەگەڵ ئافرەت دا گرفتی نەماوە.. ئەویش بە «خەسان» کێشەی ئەمین لە رووە کۆمەلایەتی‌کەدا ئەوەیە کە ژیانی سێکسیانەی گولناز لە زیندەگی ئیفلیجیانەی ئەم نابێتەوە لەشێکە گوناهی سێکساندنی لە شێکی تر هەلدەگرێ.

بێ سێکسێکە لە ناو ئاکاری سێکساندنی ئاسایی دا دەژی، لیبدۆی ئەمین لە هەموو بابەتە ژنانەکان و هەلبژاردنەکانی لە رەگەزی مێ دابراوە، لە مەرگ و فەنتازیادا جارێکی تر خۆی نیشان دەداتەوە، ئایرۆسیەتی ئەمین ئایرۆسیەتێکی ناوازەیەو لە دوا چرکەی دەقەکەدا سروشتێکی یونفرسیالیانە وەردەگرێ... قەیرانی ئەو ئایروسیەتە لەوەدایە کە ناتوانێ لە رێگەی جەستەوەو لە نێوەندی ژیانەوە شۆرشی خۆی بەرپا بکات.. ناتوانێ بە لەش لە چین و لە لەشە چکۆلەکان و شێوازی پەیوەندی‌یەکان دەربچێ لەبەر ئەوە تەنیا بوار بۆ چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە بازدانێکی کەینوونی‌یە لە ئاستێکی بوونەوە بۆ ئاستێکی دی.. لە ژیانەوە بۆ مەرگ. قەیرانی ئەو ئایروسیەتە لەوەدایە کە ناتوانێ بابەتی سروشتی خۆی بدۆزێتەوە چونکێ رووبەری سەرەکی سروشتی و شادەماری کە سێکسە کوژراوە، ناشتوانێ لەگەڵ شووناسی ئەو ساتەی خۆی دا تەبا بێت چونکە شووناسی ئیفلیجی هەر ئیفلیجی‌یە تەنها بواری جوولە لەبەردەمی دا مەرگە، بۆیە لە ژمارەیەکی بێ شوومار فەنتازیاو خەیاڵ، خەیالی مەرگ کۆتایی بە چیرۆکەکە دەهێنێ (بێ گومان مەرگ لە «میم» دا مەرگێکی بایۆلۆژی نی‌یە هێندەی فەنتازیایە مۆتەکەیەکە... خەونی پیاوێکی ماندووە) مەرگ تەنیا چارەی ئایروسیەتێکە کەنە بابەتی هەیەو نە دەتوانێت وەکو جۆرێك لە نەرسیسیەتیش دەرکەوێت، ئایرۆسیەتی لەشێکی بێ سێکس تەنها بە تواندنەوە لەناو لەشێکی گەردوونی دا و بەیەککگرتنەوە لەگەڵ گەردوون دا رزگاری دەبێت، **لێرەوە مەرگ خۆی وەکو جۆرێك لە سێکساندنی لێ دێ لەگەڵ گەردوون دا، سێکساندنێك لەبری ئەوەی ئەندامە سێکسی‌یە خەساوەکان پێی هەستن، هەموو لەش پێی هەلدەستێت.** چوونە ناو گۆر

دەشوبهێت بە چوونە ناوەوەی چووك بۆ لەشی ئافرەت ئەمین ئەندامێکی خەسیوی هەیە، بەڵام لەش و خەونەکانی نەخەسیون.

داینەمۆی جوڵاندنەوەی ئەم لەشە لە ژیانەوە بۆ مەرگ فەنتازیایە، فەنتازیای یەکگرتنەوە لەگەڵ زەوی داو تواندنەوەی وەك نوتفەیەکی شەهوەت لە خاك دا ڕووەو گەڕانەوەو دووبارە بوونەوە لە ڕێگای بوونەوەرەکانی ترەوە.. بۆیە دەتوانین بڵێین چارەسازی لۆرانس بۆ کێشەکەی خۆی چارەسازی‌یە لەسەر ئاستی «واقیع» چارەسازی شێرزاد چارەسازی‌یە لەسەر ئاستی فەنتازیا ئەم جیابوونەوەیەش
جیابوونەوەیە لەسەر ئاستی جومگە سەرەکی‌یەکانی سەیرکردن و جیهانبینی.

لەراستی دا ئەو مەرگە فەنتازی‌یە چەندە چارەسەری قەیرانێکی ئایروسیە هێندەش چارەسەری قەیرانێکی فیکری‌یە، ئەو فەنتازیایەی کە لە دواهەمین بەشی «میم» دا دەیبینین دواهەمین هاواری شکاندنی ئەو میمەیە کە بەژیانەوە دەلکێت، «ژیانم» کوشتنی ئەو میمەیە کە بە لەشەوە دەلکێت «لەشم» ، ئەمین لە دژایەتی دا بۆ خاوەندارێتی بەرەو ئەو پەری دەروات، خاوەندارێتی لەسەر لەش و ژیانیش لادەبات، بەڵام لە سنووری دەستەڵاتی خۆشی دەیکاتە دەرێ و نایخاتە سنووری دەستەڵاتی هیچ چین و هیچ تاقمێك بەڵکو ڕاستەوخۆ بەرەو ناوەندی یەکگرتنەوە بەکەینوونەوە دەروات خودێکە لە ئاستی فەلسەفی دا دەیەوێ ئەنتۆلۆژیایەکی تایبەت بۆ خۆی دابمەزرێنێ، بەڵکو بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین تەنها پاڵەوانێکە لە ئەدەبی کوردی دا کە ئەگەر لە ڕوانگەیەکی «هیدگەر» یەوە سەیری بکەین لە «کائن»ەوە دەروات و دەپەڕێتەوە بۆ «کەینوونە»، لە کاتێك دا ئاراستەی لەشی «کۆنستانس» تەواو بە پێچەوانەوەیە ، ژیانی «کۆنستانس» لەتەك «کیلفۆرد» دا ژیانی خۆی نی‌یە، لەشیشی لەشێکە دەژی وەك هەموو لەشەکانی دیکە.. بالآم لەتەك «میلۆرز» دا «کۆنستانس» ژیان و لەشی دەبنە ژیان و لەشێکی تایبەت بە خۆی، ژیانی دەبێتە «ژیانم» و لەشی دەبێتە «لەشم» بەو جۆرە سەفەری ئەمین سەفەری ونکردنی هەموو میمەکان و تواندنەوەیانە لە گەردوون دا، بەڵام سەفەری «کۆنستانس» بەدەست هێنانەوەی ئەو میمانەیە کە ژیانی ئەرستۆکراتیانە لێی سەندوێتەوە .. هەر بۆیە هیچ یەکێك لە ئەمین و کۆنستانس دوو سۆشیالیستی تەقلیدی نین کۆنستانس بە دژایەتی کردنی بۆ موڵکدارەکان بەرگری لەو پانتاییانە دەکات کە تایبەتە بە خۆی و خۆی خاوەنیانەو ڕاپەڕینەکەشی ڕەگێکی واقیعی هەیە، بەڵام ڕاپەڕینی لەشی ئەمین دوو ڕەگی جیاوازی هەیە.

۱) ڕەگێکی سۆفیانە ـ بێ گومان سۆفیەت بە مانای یەکگرتنەوە لەگەڵ هێزێکی گەردوونی دا و تواندنەوە لە ناوی دا .

۲) ڕەگێکی نەهەلستیانە ـ نەهەلستیەتی ڕەتکردنەوەی هەموو بەهاکانی خاوەندارییەتی بەرادەیەك دەتوانین بڵێین ئاراستەی جوڵاندنەوەی لەشی ئەمین لە یاخی بوونێکی کۆمەڵایەتی بچووك و سەرنەکەوتووەوە دەروات بەرەو یاخی بوونێکی میتافیزیکی کۆنستانس هەموو شێوەکانی خاوەنداری دەکاتە قوربانی خاوەندارێتی لەشی خۆی ... لە کاتێك دا ئەمین دەست لە هەموو شێوەکانی خاوەندارێتی بەردەدات بۆ یەکگرتنەوەیەکی سۆفیانە لەگەڵ گەردوون دا.

ئەمین ناڕوانێتە مردن و جیابوونەوە لە ژیان و سەرچاوە گەردوونی‌یەکانی بەڵکو دەڕوانێتە مردن و یەکگرتنەوە لەگەڵ کانگا سافەکانی ژیان دا مردن و هەستانەوە، نەوەکو مردن و خەفەبوون، ئەوەیە ئەو فەنتازیا موستەحیلەی کە کارێك دەکات

ئەمین لە ساتە وەختی مردن دا لەبری ئەوەی بکەوێت هەڵدەستێتەوە.. لەبری تەواو کردنی بازنەکانی ئیفلیجی لە ئیفلیجی دەر دەچێت ئەگەر چیرۆکەکەی لۆرانس لەسەر خانەی پەرستنی لەش و بەلاهوتی کردنی لەزەت و جۆرێك لە هیدۆنیزم ی ئاراستە کراو و پاکژ کراو وەستا بێت، چیرۆکی میم لەسەر ژیان و بینینەوەی چەمکە کەونیەکانی وەستاوە چ کۆنستانس و چ ئەمین بەدوای فریادرەسێك دا «منقذ» دەگەڕێن بیانباتە بەهەشت، بەهەشت لای کۆنستانس چەقەکەی دەکەوێتە ناو لەشەوە، لە کاتێك دا لای ئەمین دەکەوێتە ناو یەکگرتنەوە لەتەك هێزو تاقی ژیان دا، بۆیە دەتوانین بڵێین دواجار

**ڕەگێکی سۆفیـانە لەناو ئەچو فەنتازیایەدا بەرقەرارە کە جەستەی ئەمین لە بوونەوە بەرەو نەبوون دەبات.**

## «سێکس» دۆزینەوەی بابەت و ونکردنی

کاتێك بمانەوێ لە دوای شووناسی پاڵەوانەکان بگەڕێین بیر لە جەستەیان بکەینەوە، کاتێك سەیری جەستە دەکەین.. ڕوانینە ئاکـاری سێکسیو ڕەفتـاری سێکسیـانـەی جەستـەکـان پانتاییەکی گرنگی ئەو نەخشەیەیە کە دەبێت لێی بڕوانین، لەم دوو دەقـەدا هیـچ پاڵەوانێـك لە پاڵەوانـە سەرەکییەیان تێڕوانینێکی حوجرەیی یا خود ئەکلیرۆسی‌نی‌یە بۆ سێکس، لەگەڵ ئەوەشدا سێکساوی ترین پاڵەوان کە «کۆنستانس»ەسێکس لە گۆشـە نیگـایەکی ئەخلاقی‌یەوە سەیر دەکات.. ڕزگار کردنی سێکس لە عەقلیەتی ئەکلیرۆسی وگێرانەوەی بۆ ناو هاوکێشەی ئەخـلاق و دامـەزرانـدنی وەکو پنتێك لە پنتە سەرەکیەکانی ئەخلاق دەبێت ستراتیژی هەموو ستراتیژیەکانی جەستە بێت، ئەوەش تەنها بە جیاکردنەوەی ئەخلاق دەبێ لە هەموو تەرزە ڕۆژهەلاتیو ڕۆژئاواییەکانی عەقلیەتی لاهوتیو دینی، واتا لە حاڵەتی ئاوەژووکـردنی هاوکێشـە دێرینەکان دا بەدی دێت، ئەوەژوو کردنەوەی ئەوحاڵەتەی کە. ڕەفتاری سێکسیانە لەسەر تیشکی پێداویستی‌یە تیرۆریستیەکانی ئەخلاق دا دابڕێژێ بۆ دارشـتـنـی ئەخـلاق لەسـەر تیـشـکـی پێـداویستی‌یـە سروشتی‌یەکانی لەش.. پەسەندی یەکەم هەمیشە بۆ جەستەیە نەوەك بۆ ئەخلاق. لەم دوو دەقەدا جەستەی دوو ئافرەتی بزێو لە بەرامبەر دوو نێری خەسیوو بێ چووك دا دەجوڵێنەوە، بەوەدا کە «ئـەمـین» و «کـلیـفـۆرد» دوو جەستـەی بێ سێکسن شیکـردنـەوەی ڕەفتـاری سێکسیـانەیان ئەستەمە، بۆیە لەم بەشەدا تەنیا «کۆنستانس» و «گوڵنان» بەرامبەر یەك دەمێننەوە کە دوولەشن دابین کردن و تێرکردنی سێکسیانەی لەش لەلایان لە دابین کردنەکانی تر گرنگترە، هەردووکیان دووژیانی سێکسی جەنجـاڵیـان هەیـە (لەبـەر ئەوەی کە گوڵنـاز کەسێتیـەکی نائـامـادەیـەو تەنیـا لە ڕێگـایژیانی « ئەمین»ەوە دەیبینین.. ناچـارین لە هەڵسـەنگاندنماندا ئەو دیمەنە ڕەچاو بکەین کە «ئـەمـین» دەیگـەیەنێ) لێرەدا سیفەتی هاوبەشی هەردووکیان سەیـرکـردنی سێکسیـانـەیـە بۆ ژیان، واتە «سێکس» خاڵی یەکـگـرتنـەوەیـە لەلایـان، بەڵام لەهـەمـان کاتـدا خاڵی جیـابـوونەوەشە، گوڵناز تەبایە بەوەی کە وەکو کۆنستانس لە دەرەوەی ژن و مێردایەتیدا پەیوەندی دەبەستێت بەڵام هەر ئەو تەبابوونەش لە یەکتریان جیا دەکاتەوەو دەیانکاتە دوو نموونەی پێچەوانە لە مامەڵەکردن لەگەڵ لەش دا.. بەڵام ئەگەر ئەو دوو جەستـەیە لەوەدا تەبابن کە پراکتیکی ئایرۆ سیانەی جەستە فەرامۆش نەکەن، تەوەرەی جیابوونەوەکان لە کوێ دایە..؟

**لە سەرەتاوە لە هەردوو چیرۆکەکەدا سێ شێوەی جیاوازی سێکس کردن دەبینین کە بەم جۆرەی خوارەوە پۆلینیان دەکەین:**

**١) سێکسی شەرعی.**
**٢) سێکسی ناشەرعی.**
**٣) سێکسی سروشتی.**

**سێکسی شەرعی**: لەناوەندی خێزان و پەیوەندی ژن و مێرد ـدا بەر قەرارە، جۆرە سێکسێکـە کە هەمـوو یاسـاکانی زەمین و ئاسمان بە دڵیانەو هەوڵ دەدەن هەموو ئاکاری سێکسیانەی مرۆڤ لە ناوەندیا بەند بێت، بەڵام ئەم جۆرە سێکساندنە لە ناو ژن و مێردەکانی ئەم دوو دەقەدا ئەستەمە، لەبەر ئیفلیجی نێرەکان.

**سێکسی ناشـەرعی**: سێکسێکـە لە دەرەوەی پەیوەندی ژن و مێردایـەتی بەڵام بەشێکـە لەسەرجەمی ئاکاری سێکسیانەی کۆمـەڵگـا، لەسەر گۆڕینی بابەت و پەیوەندی ڕاگوزەر بەندە، بەشـە نهێنی‌یـەکـەی ژیـانی سێکسی کۆمەڵگایە بەڵام بەشی سەرەکیو ئۆرگانی ترین ڕووبەرێتی، سێکسێکە بەقەد سێکسی شەرعی نامـۆیە چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکان دا لە خزمەتی مانـەوەی ئەو بونیـادانـەدا کار دەکـات کە سێکسی شەرعی ڕادەگرن .. لە ئیفلیجی نێرەکان دا، هەر دوومێی چیرۆکەکان پەنای دەبەنە بەر.

سێکسی سروشتی: کە تەنهـا شێـوازی سێکسـانـدنە تیایدا جەستـە لە دەرەوەی هەمـوو شەرعیـەت و ناشـەرعیـەتێکی ئەخلاقیو کۆمەڵایەتی بابەتی ڕاستەقینەی خۆی دەدۆزێتەوەو خۆی خۆبەخۆ ڕەفتارێکە ملکەچی سۆسیۆلۆژیای لەش نی‌یە لە ژیاری پیشەسازی ـ ئیستهلاکیدا.

پاڵەوانێکی وەکو کۆنستانس بە هەرسێ شێوە جیاوازەکەی سێکساندن دا تێ دەپەڕێت، بەڵام دەرەنجام هەردوو شێوازی سێکسی شەرعیو ناشەرعی بەجێ دەهێڵێو دەپەڕێتەوە، بۆ سێکسی سروشتی و پاکژ لە هەموو پەیوەندیەك جگە لە پەیوەندی لبیدۆیانەی ئازاد. کۆنستانس بەهۆی ئیلفیج بوونی کێلفۆردەوە لە سێکسی شەرعی دەبێت.. بەڵام پرسیاری گەورە ئەوەیە بۆ کۆنستانس بە پراکتێك کردن و هەستانی بەردەوام بە سێکسی ناشەرعی دابین نابێت؟ سێکسی ناشەرعی جۆرێکە لە «سێکس»، جەستە لەناو پەیوەندی‌یەکانی ئەرستۆکراتیەت دا دەهێڵێتەوەو لەش بەرەو دەرەوەی بونیادەکان ناجوڵێنێ هێندەی لە ڕووبەری پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکاندا دیلی دەکات و یارمەتی دەدات بەرهەم هێنەوەی هەمیشەیی ئەخلاقە نەگۆڕەکان بێت.. لە وەرسیو ڕۆتینی ناو سێکسی شەرعی ئازادی دەکات ، بەڵام ڕێگای سروشت ودەروازەی ئازادبوونی لێ دەگرێت، کۆنستانس بەر لە میلورز پەیوەندی ناشەرعی هەیە، بەڵام هەست دەکات پەیوەندی پیاوو ئافرەت لەناو ئەرستۆکراتەکان دا پچراوە، لێرەوە هیچ لە یەکتری گەیشتنێك نی‌یە لە نێوان جەستەکان دا، تەنها گەڕانەوەیەك بۆ سروشتی لەش لە ڕێگەی گەڕانەوەوە بۆ سێکساندن لەگەڵ پیاوانی دەرەوەی ئەو چینە بە دەست دێت.. دۆزینەوەی بابەتێك کە مۆرکی ئەرستۆکراتیەتی پێوە نی‌یە ئەوەیە لەشی کۆنستانس بەرەو دەرەوەی بونیادی کۆمەڵگای بریتانی دەجووڵێنێ، نەوەکو سێکساندنی ناشەرعی لە پشت پەردەکانی ئەو بونیادەوە.. بێ گومان کلیفورد بەڕوونی لە گرنگی بەستنی پەیوەندی ناشەرعیانە گەیشتووە، بۆیە ئازادی‌یەکی تەواو دەداتە کۆنستانس لەو بوارەدا، نەوەکو تەنیا بۆ ئەوەی منداڵێکی ببێت، بەڵکو بۆ ئەوەی جەستەی ئەو لە جەستەی ئەرستۆکراتیەت جیا نەبێتەوە. بەو شێوەیە کۆنستانس ڕێگەی سێکسی سروشتی هەڵدەبژێرێ کە ڕاستەوخۆ بەرەو دەرەوەی دونیای کیلفۆردی دەبات. بەڵام لای «گوڵناز» سنووری جوڵاندنەوەی ئەو خانمە ڕۆژهەڵاتی‌یە خانەدانە، لە ئامێزی سێکسی ناشەرعی دەرناچێ، سێکس دەبێتە ئامرازی پەیوەندی نێوان لەشی گوڵنازو دونیای بازرگان و مولکدارو ئەنتجلنسیای چەواشە لە (بازرگان ، زەرەنگەر، خاوەن کۆگا، چیرۆکنووس) سێکس لای کۆنستانس ئامرازی جیابوونەوەیە لە مولکدارو پیشەسازو ئەنتجلنسیای چەواشە.. بەڵام لای گوڵناز ئامرازی جیابوونەوەیە لە ئەنتجلنسیایەکی پڕ لە خەون وتۆباوی وەکو «ئەمین». لێرەدا ئەو ڕاستی‌یە گرنگە دێتەوە بەردەممان کە هەموو ئاکاری سێکسیانە لەسەر دۆزینەوەی «بابەت»ی جەستەو ونکردنی‌بەندە ۆشووناسی بابەت، شووناسی ئەخلاقیانەی سێکسو لەش دیاری دەکات،کۆنستانس و گوڵناز لەوەدا تەبان کە بە دوای تێربوونی لەشدا دەگەڕێن،بەڵام لەوەدا ناتەبان کە شووناسی بابەت لای گولناز بایەخی نی‌یەو لای کۆنستانس جەوهەری سێکساندن دروست دەکات، نەمانی گرنگی شووناسی بابەت نیشانەی سەرەکی سێکساندنی ناشەرعی‌یە، لە سێکسی ناشەرعی‌دا گرنگ نی‌یە لەگەڵ کێدا سێکس دەکەیت
بەڵکو گرنگ ئەوەیە سێکس بکەیت. بەڵام لە سێکسی سروشتی دا گرنگ نی‌یە سێکس بکەیت ، بەڵکو گرنگ ئەوەیە لەگەڵ کێدا دەیکەیت لای کۆنستانس سێکس دۆزینەوەی بابەتێکی ڕاستەقینەیە بۆ جەستە،بەڵام لای گوڵناز سێکس ونکردنی بەردەوامی بابەتە بۆ بابەتێکی دیکە چەندە جەستە بابەتی سروشتی و ڕاستەقینەی خۆی دۆزیبێتەوە هێندە لە تێ ئاوارە بوون دوور دەکەوێتەوە، چەندە جەستە بابەتەکانی خۆی بگۆڕێت و گۆڕینی بابەت ببێتە ستراتیژی هێندە تێ ئاوارە دەبێت.. بایەخ دان بە شووناسی بابەت لای کۆنستانس کارێك دەکات سێکس لە ئاستێکی جەستەیی ڕووتەوە دەگوازێتەوە بۆ ئاستێکی سۆسیۆلۆژی قووڵ چونکە لای کۆنستانس هیچ پیاوێکی ئەرستۆکراتی ئینگلیز وەکو بابەتی سێکساندن قبووڵ نی‌یە (لێرەدا دەشێ ئاماژەیەکی خێرا بۆ کاریگەری لۆرانس بکەین لەسەر عەقڵیەتی بزوتنەوەی لاوان و قوتابیانی ڕۆژئاوا.. بەتایبەتی لە جوڵاندنەوەی فەرەنسای ساڵی(٦٨) شەست و هەشت بەودیوداو داخوازی‌یەکانی سێکس بۆڵ) کۆنستانس لە ئەنجامی هەڵبژاردنیەوە بۆ سێکسی سروشتی دەبێتە ئافرەتێکی ئازاد، لە کاتێکدا کە گوڵناز دەبێتە سۆزانی سێکسی گوڵناز سێکسێکە لەناو بابەتەکانی نامۆ بوون دا ماوەتەوەو بەدترین ناوەندی ئەو یاسایانەی گرتووە لە کاتێکدا لەشی کۆنستانس یاساکان دەشکێنێت و هەرێمێکی نوێ داگیر دەکات، واتا هەناسەیەکی کودیتایی «ئینقلاب» لە سێکساندنی کۆنستانس

ـدا هەیە کە لە دونیای گوڵنازدا ونە، لەرووی پەیوەندیشەوە بە بابـەتـە سێکسیـەکـەوە لەشی کۆنستـانس لە پەیوەندی‌یەکی هاوسـەنـگ دایە لەتەك بابەتەکەدا، واتا [«میلورز» ـ بابەت] نابێتـە هۆی نامـۆکـردنی جەستـە، هێنـدەی دەبێتـە هۆی ئازادکـردنی جەستـە، واتا نابێتە دەستەڵات هێندەی دەبێتە پۆلێکی یەکسـان، لە کاتێکـدا سێکس گوڵناز دەخاتەوە سەر دۆخی مێ‌یەکی ئاسایی لە کۆمەڵگایەکدا کە نێرەکان تیایدا باڵادەستن.

لای گوڵناز سێکس شوێنی خوونکردنە شوێنی ژیانەوەی لەش نی‌یە، بەڵکو شوێنی یاری‌کردنە بە لەش، لە کاتێکدا سێکس لای کۆنستـانس مایـەی گەشانەوەی هەموو لەشە بە ئاستە فیکری و ئاستە رۆحی و ئاستە حسی‌یەکانەوە لێرەدا بۆ زیاتر دەست نیشـانکـردنی جیاوازی‌یەکان و پتر ئاسان کردنی بۆ خوێنەر ئەم هێڵکاری‌یە دەخەینە روو:ـ.




هێڵکاری ـ٤ـ

## ئیفلیجی لەش یان ئیفلیجی ئەرستۆ کراتیەت و ئەنتجلنسیا

بۆچی ئیفلیجی سیفـەتی نێرەکـانی ئەم دوو چیرۆکـەیـە؟ بۆ ئافرەتەکان لەم چیرۆکانەدا روو لە سێکس سروشت و جەستە دەکـەن..؟ بێ گومـان ئافرەت ئۆرگانی ترین بەشی دیسپلینە کۆمەڵایەتی‌یەکان نی‌یە، کۆمەڵگای نێر کۆمەڵگایەکە کە ئافرەت تیایدا لە حاڵەتی پەراوێزی دا دەژی، نێرەکان هەمیشە بەشی گرنگ و زیندووی پانتایی‌یە سۆسیۆلۆژیەکانن.. بەلام مێ‌یەکان ـدابەمۆی بەرێوە بردنی ئەو کۆمەڵگایانە نین، عەقڵی بزوێنەرو ئاوێنەی گۆڕانکاری‌یە ناوەکیەکان نین، چەندە گرنگی و بایەخی کۆمەڵایەتیان کەمتر بێتەوە ئەوەندە لە جەستەو لە سروشت نزیك دەبنـەوە، لە کاتێك دا دەبینین لەش لای هەریەك لە ئەمین و کیلفۆرد سروشت نی‌یە، دوو جەستەن سروشتیان دۆڕاندووە، بەلام دەشێت درامـای جەستە بەو سەختی‌یە نەبێت، ئەگەر ئیفلیجی حاڵەتی جەستـەیـەك بێت لە بونیـادێکی مرۆڤـانەو زیندوودا بژی، بەلام ئەودوو جەستەیە کە سروشت دەدۆڕێنن ئیفلیجیان هاوشانی ئیفلیجی‌یەکی دیکەیە. خەسیوی‌ی «ئەمین ـ کیلفـۆرد» خەسیـوی‌ی دوو پانتـایی لە خۆیـان گەورەترە، ئیفلیجی لە هەردوو چیرۆکەکەدا ئاماژەنی‌یە بۆ کێشەی تەنها لەشێك ئەوەندەی کە ئاماژەیە بۆ لەشێکی گەورەتر، لای لۆرانس ئیفلیجی کیلفۆرد هاوشانی ئیفلیجی ئەرستۆکراتیەتی ئینگلیزی‌یە.

لەشی کیلفـۆرد بەرجـەستـەکردنی لەشی ئەرستۆکراتیەتە.. لە «میم» دا هەرچەند «ئەمین» حاڵەتی خۆی وەکو حاڵەتێکی تاکە کەس دەبینێت و ئیفلیجی‌یـەکـەی بەمەسەلەیەکی تایبەت بە خۆی دەزانێت .. بەلام جەستـەی ئەمـین بەراستـەوخـۆو ناراستـەوخـۆ بەرجـەستـەکـردنی جەستەی ئەنتجلنسیایەو ئیفلیجی یەکـەشی ئیفلیجی ئەنتجلنسیـایـە (ئـەنتجلنسیـای کوردی) ـ (شـوونـاسی ئەنتجلنسیا شووناسی هەموو پاڵەوانە سەرەکی‌یەکانی شێرزاد ـ ە و ئەو شووناسە زاڵە بەسەر هەموو ئینیما کۆمەڵایەتیەکانی دیکەیان دا) لێرەدا بەئاسانی هەست بەو راستی‌یـە دەکـەین کە سەفەری لەشی ئەمین و ئەو کۆچە (سەندبادی) یەی لە راستی‌دا سەفەری ئەنتجلنسیایە بەناو هەمـوو پانتـایی‌یـە سۆسیۆلۆژی‌یەکەی دا، سەفەرێکەکە بە تراژیـدیـایەکی خەمبار دوایی دێت، لەشی ئەمین درێژکراوەی لەشی ئەنتجلنسیـایـە (جیـابـوونـەوەی ئەمین لە خێزانەکەی رەنگـدانـەوەی جیـابـوونـەوەی ئەنتجلنسیـایـە لە ژینگـە کۆمـەلایـەتی‌یـەکـەی خۆی)، شەوانی بێ رابـواردنی ئەمین لەلایـەن دەوڵەمـەنـدەکـانـەوە نیشـانـەی ئەو دیـوارەیە کە عەقـڵانیـەتی ئەنتجلنسیـاو عەقـڵانیـەتی بۆرژوازی جیـا دەکاتەوە)، (فەرامۆش کردن و بەجێ هێشتنی ئەمین لە ماڵێکی چۆڵدا نیشـانـەی حاڵەتی پەراوێـزی‌ی ئەنتجلنسیـایـە)، (نـەگـەرانەوەی پیرەژنی کارەکەر ئاماژەیە بۆ ئەو دیوارەی کە ئەنتجلنسیـا لە چینـەکـانی خوارەوە دادەبرێ) ، (دابران لە گەرەکی میللی کۆن و ونبـوونی لە بێ دەنگی و کپی گەرەکـە خواپێـداوەکـان دا دابـرانی ئەنتجلنسیـایـە لە سەرچـاوە

میللی‌یەکەی) بەوجۆرە جەستەی ئەمین ئیفلیجەکە لەناو ئیفلیجیا، درامای لەشی ئەمین دوو درامایە درامای ئیفلیجی خۆی وەکو بایۆلۆژیایەك کە ئاستی ڕووکەشی ئیفلیجیەکەیە، درامای دووەم ئیفلیجی ئەو پانتایی‌یە سۆسیۆلۆژی‌یە کە نیشتمای بۆ دەکات ، لای لۆرانس ئیفلیجی کیلفۆرد و ئەرستۆکراتیەت لەوەدایە کە ئەرستۆکراتیەت توانای نوێ بوونەوەی نی‌یە، ئەو ژیارەی بونیادی ناوە ژیارێکی ئیفلیج و تاریکە، لە ڕوانگەی لۆرانس ـ ەوە ئیفلیجی ئەرستۆکراتیەت لەوەدایە کە بونیادێکی تایبەتی دروست کردووەو نایەوێت گۆڕان و نوێ بوونەوەی تیا بەرپا بکات دەستەڵاتدارە بەڵام ئەخلاقێکی بەربەریانەی هەیە، کیلفۆرد دەیەوێت بونیادەکەی بەرقەرار بێت لەبەر ئەوە دەیەوێت خۆی و هەموو شتەکانی دەوروبەری لە حاڵەتی وەستان دا بن.. لەکاتێك دا ئیفلیجی ئەنتجلنسیا لەوەدایە کە ناتوانێت هیچ بینا بکات، ناتوانێت پرۆژەکانی خۆی بهێنێتەدی، ناتوانێ کەس لە ناوەڕۆکی خەونەکانی خۆی ئاگادار بکات، شوێنی لە کۆمەڵگا شوێنێکی پەراوێزی‌یە، ئیفلیجی کیلفۆرد لەتەك خۆی دا ئاماژە بۆ ئیفلیجی هەموو ئەو شارستانیەتەش دەکات کە بونیاد نراوە لەبەر ئەوە تەنها ئەلتەرناتیفی میلۆرز ـ و دارستانە بەڵام ئەنتجلنسیای شێرزاد ئیفلیجی‌یەکەی لەوەدایە کە ناتوانێت ببێتە چەقی هیچ گۆڕانکاری‌یەك.

گۆڕانکاری لای لۆرانس گەڕانەوەیە بۆ سروشت، بەڵام لە «میم» ، داخەوێکی فەنتازیایە کە لە مەرگ دا دێتە دی.. ئازارەکانی کیلفۆرد دوورە لە هەموو لیریکی‌یەتێك، چونکە ئەگەر وردتر قسە بکەین ئیفلیجی کیلفۆرد ئیفلیجی‌یەکی پراگماتی‌یە کە درێژکراوەی پراگماتیزمیەتی هەموو ئەرستۆکراتیەتە، هەر بۆیە هیچ لیریکی‌یەتێك «غنائی‌یەت و شاعیری‌یەت» لە دونیای کیلفۆردو ئازارەکانی دا نی‌یە، بەڵام گرفتی ئەو ئەنتجلنسیایەی کە شێرزاد باسی دەکات ئەوەیە کە خاوەنی هەستێکی لە رادەبەدەریشە بەڵکو ئەنتجلنسیایە کە تووشی هەوکردن و ئوسائدن بووە لە هەست دا (حس) چونکە ـ ١) عەقڵانیەتی نەگەیشتۆتە پلەیەکی باڵا لە شیکردنەوەو تەجریدی زانستیانەدا ٢) پراکتیکی سفرە لێرە لە ناوەندی نەبوونی عەقڵانیەت و نەبوونی پراکتیك دا هەست گەورە دەبێت و گەشەیەکی ناسروشتی دەکات ، شێرزاد دەزانێت لەگەڵ ئەنتجلنسیایەك دا مامەڵە دەکات کە هەموو گیانی هەستی ڕووتە، لێرەوە بۆ دروستکردنی ڕاچڵەکاندنێکی تراژیدی هەستی پاڵەوانەکان بریندار دەکات، هەتا زانستی ترین پاڵەوانی شێرزاد لە چیرۆکی «من و قالەو سەگەکەی پافلۆف» دا بە هەست (واتا لەڕێگەی حسی‌یەوە) دەرەنجامە زانستی‌یەکان دیاری دەکات و دەیگۆڕێ، ئەزموونی هەستیارانە قیبلەنومایەتی نەوەکو عەقڵانیەتی زانستی بونیادی ئیفلیجی لای لۆرانس هیچ لیریکیەتێك دروست ناکات ، بەڵام لای شێرزاد وەك دەبینین لیریکی‌یەت زمانی سەرەکی قسەکردنی پاڵەوانەکانە.. ئەوەش خۆ بەخۆ ڕەنگدانەوەی جیهانبینی ئەنتجلنسیایە بەڵام ئیفلیجی ئەو دەستەیە کارێك دەکات پرۆژەکانی لەئاستی یۆتۆپیادا بسوورێتەوە، چونکە یۆتۆبیا تەنیا پەرچەکرداری مومکینە لە بارودۆخێکدا کە پراکتیك سفرە (بیرکردنەوە لە نەهێشتنی خاوەنداریتی ـ تێك دانی گۆڕستانە) کە دوو کرداری سەرەکی زیندەگی و مەرگی ئەمین ـ ن، دوو هەڵوێستی یۆتۆبین کە ئەوە دەسەلمێنێ چوونی ئەمین بەرەو مەرگ خۆی لە خۆی دا درێژە پێدانی هەمان ئەو یۆتۆبیایە کەلە ژیانەوە دەستی پێکردووە، ئەو یۆتۆبیایەی لە ژیان دا هەوڵی داوە بەشێکی لێ بهێنێتەدی، لەمەرگ دا دەگاتە ئەوپەڕی، واتا کۆتایی چیرۆکەکە درێژکراوەی یۆتۆبیایە کە دەخرێتە بری ئیفلیجی و پەرچەکردارێکی گەورەیە بۆ جیابوونەوە لە ئیفلیجی.... بێ گومان گەلێك دەرەنجامی تری گرنگ هەیە کە بیخەینە ڕوو، بەڵام لێرەدا کە ئاستی بەراوردکردنی جەستەکان بوەستێنین، بەڵام دوا جار ئەم هێڵکاری‌یە لە جیاوازی نێوان ئیفلیجی «ئەمین» و «کیلفۆرد» دا دەخەینە ڕوو کە لە بنەڕەت دا جیاوازی نێوان هەردوو دەقەکەش لەخۆ دەگرن:





## چیرۆکنووسی گەورە

# محەمەد مەولوودی «مەم»

مارف خەزنەدار

پێشەکی

مردنی گەورە پیاوی داهێنەر کارەساتی نەتەوەیە، چونکە لە بەرهەم هێنان دەکەوێ، دیارە هەر چەندە نووسینی داهێنراو لە مێژووی ڕۆشنبیری نەتەوەدا زۆر بێ، بنج وبناوانی ئەدگاری نەتەوایەتی بە هێزتر دەبێ.

محەمەد مەولوود دەبوو تەمەنی درێژتربێ، بۆ ئەوەی گەنجینەی ئەدەبی‌ی زیاتر بخاتە سەر سامانی نەتەوایەتی‌یەوە، بەڵام بە داخەوە زۆر نەژیا، خۆی دەیووت نەخۆشی‌ی برسیەتی سەردەمی منداڵی و مێرد منداڵی هەیە، تێر بوونی لە تەمەنی گەورەیی دا نەکەوتە فریای، هەمیشە خۆی هەر بە برسی دەزانی، با لە شەقڵاوەی جووانیش ژیا بێ، لەقەدپاڵی سەفینی سەوزو چیمەنی تەڕ و دارو دەوەنی تێرئاو پەروەردە بوو بێ، لە سێبەری نزار و گوڵزاری بۆندارو میوەی خۆش دا زیندەگانی کرد بێ.

### پەنجا فلس

ساڵی ۱۹۵۷ ساڵێکی پڕ جموجۆڵی بوو لە ژیانم دا، لەو ساڵەدا بۆ یەکەم جار ناوی «محەمەد مەولوود» م نەبیست، تەنیا ئەو هەواڵە کۆی ڕووداوەکانی ژیانم نەبوو، بەڵکو گەلێ بەسەرهات و کردەوە و گۆڕان لە ئاسۆی ژیانی نیشتمان و ژیانی تایبەتیم دا هەڵات بوو.

★ بەهاری ئەو ساڵە گەلێ بەڕەونەق و بەبەها بوو، لە ڕۆژی نەورۆزەکەی دا لەگەڵ هاوسەرم داماڵێکی تازەی کوردیمان دروست کرد.

★ یانەی سەرکەوتنی کوردان خەریك بوو خۆی ئامادە دەکرد بۆ دەرکردنی کۆوارێکی مانگانە بە ناوی «هیوا» بڕیاریان دابوو من بەڕیوەبەری بم، بەڵام من دەبوو کەرکووك بکەم بە مەڵبەندی ژیانی دووا ڕۆژی نزیکم.

★ تەواوکردنی خوێندن لە کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای بەغدا

ز دامەزرانم لەیەکێ لە قوتابخانە ناوەندییەکانی شاری کەرکوک.

★ لافاوەکەی سلێمانی کە کامەران موکری کرد بوو بە شاعیرێك لە سەرپێ بوەستێ و لە دووایی‌دا برووسکە شیعرییەکانی بۆ «شەفەق» بنێرێ.

★ خۆ ئامادە کردن بۆ بڵاو کردنەوەی کۆواری «شەفەق = الشفق» لە لایەن دەستەیێك لە ڕۆشنبیری کوردەوە کە لە کەرکووك دا دەژیان.

★ دەمێك بوو ئەوەم بە خۆمەوە نەدی بوو کە هەفتەیێك لە سلێمانی و هەفتەکەی تر لە هەولێر خەریکی یاد کردنەوەی بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیم ببم، لە سلێمانی هاوڕێ نووسەرو شاعیرەکانم بەسەر بکەمەوە ڕۆژگارێکی خۆش بوو لەگەڵ بلەو قالە و مالە لە کەرکووك، شاعیر و نووسەران لە سلێمانی، بیرەوەرییەکان لە هەولێر.

★ «پەنجا فلس» لە پێشان دا «پەنجا فلس» (تشرینی یەکەم ١٩٥٧) خۆیم دۆزییەوە، وەکو بەرهەمێکی ئەدەبی، واتە خۆی دروشمێك بوو، ئەوەندە بیرم لە خاوەنەکەی نەدەکردەوە. لە دووای شەش حەوت مانگ ڕووداێکی تری لەم بابەتە سەری هەڵدایەوە ئەمەیان خۆم شایەتی بووم بەوەی ئەندامێك بووم لە دەستەی نووسەرانی شەفەق، ئەویش لە چیرۆکی کوردیدا بوو بە دروشمێکی تر «چای شیرین» (حەزیران ١٩٥٨) ئەگەر چی بۆ من و بۆ هەموو خوێندەوارانی کورد «پەنجا فلس» پێش چای شیرین کەوت بەڵام من حسین عارف ـ ی ـ خاوەنی چای شیرین ـ م ـ پێش محمد مولودی خاوەن «پەنجا فلس» ناسی حسین عارف لە پاش تەمموزی ١٩٥٨ هاتە لامان بۆ کەرکووك بۆ وەرگرتنی پاداشی سەرکەوتنی چیرۆکەکەی کە لە گرەوی چیرۆکی کوردی یەکەمی وەرگرت. گرەوەکە کۆواری شەفەق سازی کردبوو لام ئاشکرا بوو کە خاوەنی «پەنجا فلس» لە دووا ڕۆژدا گۆی هونەر دەباتەوە و دەبێ بە چیرۆك نووسێکی دیاری کورد ناسینی ئەم چیرۆك نووسە ئامانجی گەورەم بوو، بەڵام زوو بۆم نەهاتە دی، لەبەر کاری دەرزووتنەوە لە کەرکووك، بەیانیان و ئێواران. ئنجا ئەرکی شەفەق، لە پاشانیش دا شۆڕشەکەی تەمووزی ١٩٥٨.

## عەسیدە و ڕۆژ = (العصیدة والشمس)

کە ڕووم کردە ووڵاتی ڕووس بۆ خوێندن هێشتا ناسیاویم لەگەڵ مەم دا پەیدا نەکرد بوو. ئەو سەردەمە هەرمتی جموجەوڵی محەمەد مەولوود بوو، چیرۆکەکانی لە کۆوارە کوردییەکان دا بڵاو دەکردەوە، زۆربەی ئەو چاپەمەنی یانەمان لە مۆسکۆ و لینینگراد (ئێستا بۆتەوە بە سانت پیتر سبورگ) بە دەست دەگەیشت لە سەرەتای شەستەکان دا دوو دەزگای گەورەی زانستی لە لینینگراد: ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسیی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیەت لەگەڵ زانستگای لینینگراد پرۆژەی گۆڕینی چیرۆکی ڕۆژهەڵاتیان بە ناوی «چیرۆکی هاوچەرخی ڕۆژهەڵات» وە بۆ زمانی ڕووسی دانابوو، ئەلقەیێك لەم زنجیرەیە بە ناوی «عەسیدە و ڕۆژەی چیرۆك نووسی عیراقی غایب توعمە فەرمان بوو.

دەرکردنی ئەم ئەلقەیەی چیرۆکی عیراقی بە کارگەری زانستی بەشی عەرەبی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسی لینینگراد سفیتلانە باتسیێڤا (١٩٢٨ ـ ١٩٨٢) سپێررا بوو، لە ساڵی ١٩٦٤ دا دەستی کرد بە ئامادە کردنی ئەلقەکە.

سڤیتلانا ژنێکی چاك و خوێندەوارێکی باش بوو، لە عەرەبناسیی ووڵاتی ئەو سەردەمەی سۆڤیەت دا دیار بوو، باوەڕنامەی لە پێشەکیی ئیبنی خەلدوون وەرگرت بوو، عیراقی‌یانی خۆش دەویست و ماوەیێکیش لە بەغداو سامەرادا کاری کردبوو، عەرەبی‌یەکەی بە قسە کردن و نووسینی خراپ نەبوو.

بۆ مەسەلەی ئامادە کردنی چیرۆکی چیرۆك نووسە عیراقی‌یەکان پێوەندیی لەگەڵ من دا کرد، بۆ گۆڕینی چیرۆکە کوردییەکان، بەلای ئەوەوە من کارەکە بکەم باشترە، بەڵام من بەڵێنم دا هەموو یارمەتی یێك لە ئامادە کردنی کەرستەو سەرچاوە و دیاری کردنی ئەو کەسەی چیرۆکەکان دەگۆڕێتە سەر زمانی ڕووسی و یارمەتی دانی لە گۆڕین دا پێشکێش بکەم.

لە پێشانا بڕیارم دابوو سێ چیرۆکی سێ چیرۆك نووسی کورد هەلبژێرم، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆم بە تەما بووم لە دووا ڕۆژێکی نزیك دا پرۆژەی ئەلقەی چیرۆکی نووسەرانی کورد لەو زنجیرەدا پێشکێش بکەم، بۆیە وام بەباش زانی سێ چیرۆکی یەك

چیرۆك نووسی کورد هەڵبـژێـرم ئەو چیرۆك نووسـە محـەمەد مەولوودی مەم بوو بۆ گۆرینی چیرۆکەکانیش کارگەری بەشی کوردی ئاموزگای رۆژهەڵاتناسی زاری یووسف دیاری کرا، ئەم کچـە پسپـۆری زمـانی کوردی بوو (دیـالێکتی کرمـانجیی خواروو)، لە کوردەکانی شاری تفلیسی پایتەختی گورجستانی سۆڤیەت بوو. سێ چیرۆکەکەی «مەم» یش ئەمانە بوون «پەنجا فلس» (١٩٥٧) ، « ئاوەرەکان» (١٩٦١) «بێ ووڵات نیم» ١٩٦١).

ئەم چیرۆکانەی مەم بە زمانی رووسی لەم ئەلقەیەدا لە ناو رێزی چیرۆکەکانی تر بوون کە لە عەرەبی‌یەوە گۆرابوونە سەر زمانی رووسی محـەمـەد مەولوود لەگەڵ غایب تۆعمە فەرمان، فوئاد ئەتتـەکـرلی، عەبدو لمەلیك نووری، ئەدمۆن سەبری ، شاکیر خەسباك، عەلی سوهەیل و محەمەد کامیل عارف دا نموونەی جووانی چیرۆکی عێراقی‌یـان خستبـووە روو کە لە کوردی و عەرەبی‌یەوە گۆرابوونە سەر زمانی رووسی تیراژی کتێبەکە سی هەزار دانە بوو، بەڵام بۆ ووڵاتی سۆڤیەتی یان و بەرین کەم بووە لەبـەر ئەوە بە چەنـد سەعاتێك دانەی نەما، دیارە بۆ هەموو شوێنێکیش نەنێررا بوو، تەنیا پایتەختەکان و شاری لینینگرادی گەورە نەبێ.

هـێشتا لەگەڵ محەمەد مەولوود یەکتریمان نەناسی بوو، من هەر لە خۆمـەوە وام دەزانی مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی‌یە، نەمـدەزانی ئەم زانیـاری‌یـە سەرچـاوەی چی‌یـەو لە کوێوە هاتووەو لە مێشکم دا چەسپیوە! هەموو زانیاری‌یەکەم ئەوە بوو کە خەڵکی شەقـلاوەیـەو بە پیشـە مامـۆستـای قوتابخانەی سەرەتـایی‌یە، ئەوی راستیش بێ ئەوەیە کە ئەگەر بەراستی خەڵکی شەقلاوە بوو بێ، مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی هەر راست نەبوو

بینینی مەم

بەهاری ١٩٦٨ ی بەغدا تەرو ئاودار بوو، دەمێك بوو شارەکە بارانی وای بە خۆیـەوە نەدی بوو، زۆرمان لە بیرمانە باران و لافـاوەکەی نیسانی ئەو ساڵە بە دەگمەن لە مێژووی شاری بەغدادا رووی دابوو، بەڵام من و مەم لە دەورو بەری نەورۆزدا بۆ یەکـەم جار چاومـان بەیەکتری کەوت. بەیانی‌یێکی مانگی نەورۆز بوو، بەهار هەموو شتێکی بەغدای گوڵاو پژێن کردبوو، بەڵام دیمـەن و سەوزایی نەبـوو، چونکـە بەهـار لەم شارە گەورانەدا ناتووانێ بخزێتە ناوەوە بە خۆی و گیاو گوڵی‌یەوە. لەم بەیـانی‌یـە ئەفسـوناوی‌یەدا کەوتمە رێ بەرەو سەروو لە سارادا تەنکە سەوزایی‌یێکی بەهار، ئنجا شاخ و هەرد و گوڵ و موڵ لێرەدا تەنیا بۆن نەبوو، بەڵکو دیمەنیش خۆی دەنووان، وەکو حەزرەتی نالی دەڵێ زەمین بوو بە سەماوات.

نیوەرۆ لە هەولێر بووم، پاش نیوەرۆ هەژاری شاعیر و زانا وەکـو خدری زیندە دەرکەوت، کابرایێکی باڵا ناوەنجی‌و لەش ووردی رەشتاڵەی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو ووتی: من بۆ جاری دووەم دەڵێم بە خێر بێ‌یەوە، ئەمەش مامە «مەم»ە، بە دیاری بۆتم هێناوە، جا کامەشتان زیاتر موشتاقە ئەویتر ببینی ئەوە خۆتان دەیزانن! لە پاشانا رووی کردە براژنم و ووتی: دە زوو دیژلەمەیێکم بۆ تێکە، چونکە من کارم هەیە و سەفەری بەغدام بە دەستەوەیە.. دووا جار رووی لە من کردو ووتی: لە بەغدا دەگـەینـەوە یەکتـری‌و باسی هەمـوو شتێك دەکەین هەر لەو دانیشتنەدا بۆم دەرکەوت کە محەمەد مەولوود زۆر حەز بەوە دەکا بزانێ راستە سێ چیرۆکی کراوەتە رووسی و بڵاوکراوەتەوە، خۆ ئەگەر دانەییکیش پێشکێشی بکرێ ئەوە باشتر. لەمە دڵنیام کردو ووتم: دانەی خۆت وا لە بەغدایە لە پاش ماڵ رێك خستن دەگاتە دەستت.

یەکەم بینین لە پاشانا خۆی بوو بە بیرەوەری، کەژی بەهارو هەشت ساڵ دوور کەوتنەوە لە مەڵبەند لەگەڵ ناسینی محەمەد مەولوود تێکەڵ بە یەکتری بوون، سێ کوچکەی نەورۆزو شاد بوونەوە لەگەڵ خاك و دۆزینەوەی چیرۆك نووسێك. ئەو سێ تایە بوون بە یەك تا. چەند ئێوارەیێك لەگەڵ محەمەد مەولوود، جار جارە پیربـاڵ مەحمـوودیش لەگـەڵ دا بوو. بیرەوەری‌یـەکـان پێوەندی‌یان بە سروشتەوە هەبوو، سروشتیش بە واتای بەهار، چونکـە شارستـانیانی کوردستان سروشتی رووت . تەنیا لە بەهارا دەبینن. پیاسەمان دەکرد، یادگار لە سەر شانۆی بیردا خۆی دەنووان، هەرکەسە بیرکردنەوەو بینینی تایبەتی هەبوو بۆ رابردووی کون بێ گومان بیرەوەری‌یەکانی من لە هی محەمەد مەولوودی نەدەکـرد، چونکـە سەردەمی مندالی لەم مەڵبەندە

نەبردبووە سەر، رەنگە بیرەوەرییەکان لەگەڵ بینینی پیربال مەحموود دا تا پلەیێك رێك کەوت بێ، چونکە پیربال کوری ئەو مەڵبەندە بوو و هاوبەشی ئەو دیمەنانەی کرد بوو.

پیاسە لە مێرگی بەهاردا بەرەو ئێستگەی شەمەندەفەر و باغچەکانی، لە گازینۆی ئێستگەکەدا یادی یەکەمین بینین و خواووردنەوەی کۆکا و کۆلامان کردەوە کە لە پاش جەنگی دووەمی گێتیلەم ناوە پەیدا بوو بوو. گردی قارنج ئاغا ئێستا کەوتۆتە ناشارەوە، پێشان بە کەرو بار بۆ سەیرانی بەهار بۆی دەچوون و هەندێ وەستاو پاڵەکاریان تێدا دەکرد، ووتیان ئەمانە سەر بە دەستگای ئەرکیۆلۆجین و لە شتومەك و کەلوپەلی دێرینە دەگەرێن.

بۆ منارەی چۆلی، لە کاتی خۆیدا مێوژ و گوێزو ئەشرەسی و چەرەزمان لەگەڵ خۆمان دا دەبرد. لە ژێر سێبەری منارەی دێرین دا دادەنیشتین و گرێی دەسترمان دەکردەوە و لە سەر ئەرز رامان دەخست. هەموو پیاسەیێك دەبوو بە دەرگای قەلا کۆتایی پێ بێ. جاری جاران لە بەر دەرگای قەلا سروشت و بەهارمان لێوە دیار دەبوو، بەلام ئەمجارە شار زۆر کشا بوو، دیمەنی سروشت دوور بوو، کەچی بەهاری راستەقینە لەبەر دەممان دابوو. قەد پالی قەلا خۆی گیاو گوڵ و گوڵزارێك بوو، ئینجا بە ناو کۆلانە تەسکەکانی شاری هەولێرە کۆنە هەر دەرگاییێك، هەر گوێ سووانەیێك، هەر سەربانێك، هەر پێچ و پەنایێك وێنەی یادگاری کیژۆلەیێکی نازەنین بوو، خورپەی دەهێنایە دڵی مێرد منداڵ و لاوو گەنج و هەرزەی سەردەمی خۆی.

## جاجی ئۆمەران و هەژارو هێمن

تەمووزی ١٩٦٨ بوو، محەمەد مەولوودو من لەگەڵ شێزاردی پوورزام و بە ئۆتۆمۆبیلەکەی ئەو روومان کردە سەرەوە بۆ ئەو شاخانەی هەرگیز بەفری سەرلووتکەکانیان رەش نابێتەوە. لە دەشتەکراوەکانی کوردستان دا قرچەی گەرما بوو، کەچی لەو کوێستانانەدا سەرەتای بەهار بوو، جۆگەلەکانیان بەفراو بوو.

لە قەد پالێکی سەخت، وولاغ و پیادە نەبێ شتی تری بۆ نەدەچوو. هەژار بەرخی لە ژێر پێی میوانانی ئازیز سەر بری، مەعسوومەخان پێشەوازی پێك و میواندارییێکی کردین شایانی قسەکانی خۆی بوو کە دەیووت: خوشك بۆ برایانی هەرچی بکا هەر کەمە. قسە خۆش و پر نوکتەکانی هەژار ئەو شەوە بۆن و بەرامەو مانای تایبەتییان هەبوو، چونکە دەمێك بوو بە ئاواتەوە بوو من و محەمەد مەولوود ببین بە میوانی.

هەژار ووتی: ئێوەی نووسەر دیاریتان دەوێ، پەنجەی بۆ لای سەروو درێژ کردو ووتی: فەرموو ئەمە مام حەسەنە، شیعری هەنە.. ئەم مام حەسەنە هێمن بوو.

ماوەی هەفتەیێك هەژارو هێمن و میوانەکانیان ئەوەی ئاواتی دێرینیان بوو لەو کوردستانەدا ببینین ئەمجارە دییان! ئەشکەوت و قسن و گۆرستان و شوێنەواری دێرین و ئەرکیۆلۆجی و کۆنە مزگەوت و تەکیە و خانەقاو کتێبی زەردو دەسنووسی کۆن، لەمانەش و لە هەموو شتێکی تریش بە نرختر ئادەمزادی ئەو ناوە بوو.

محەمەد مەولوود زۆر بەختیار بوو، هەژاری خۆش دەویست، وەکو من هێمنیش شاعیرێکی گەورە بوو بەلایەوە، هەردووکمان بەو رێکەوتە زۆر بەختیار بووین کە پێکەوە بۆ یەکەمین جار ناسیاویمان لەگەڵ دا پەیدا کرد.

لە گەرانەوەدا هێمن بوو بە میوانی ئێمە، یەکەمین گەشتی هاتنە خوارەوەی بوو بۆ هەولێر، لەوێ میوانی ماڵی خزمەکانی من و ماڵی محەمەد مەولوود بوو، لە شاری کۆنەدا تەنیا داوای بینینی گیوی موکریانی کرد.

من و محەمەد مەولوود لە شەقلاوە هێمنمان سوواری ئۆتۆمۆبیل کرد، بۆلای هەژار، هەژار دەیووت ئەمانەتەکەم بە سەلامەتی دەبێ بگاتەوە بە دەست

## میمی «محەمەد»و میمی «مەولوود» بوو بە «مەم»

لەپاش جەنگی دووەمی گێتی نازناو لە ناو لاوی خوێندەواری کورردا باو بوو، نەك تەنیا شاعیر و نووسەر بەڵکو خاوەن باوەرنامەی زانستگاو هەموو خوێندەوارێکی تریش هەوڵیان دەدا ناز ناوێك بۆ خۆیان دابنێن. هەر وا ئێوارەییێکیان لای ماڵی خۆیان پیاسەمان دەکرد، بیرم لە ناز ناوی «مەم» کردەوە، بە دڵنیاییەوە لێم پرسی: کاکە دیارە زۆر شانازی بە ناوی مەمی دڵداری خاتوو زین دەکەی، بۆیە ئەو ناوەت لە خۆت ناوە!.

وتی: نا، نازناوی من «مەم» مانای نییە، تیپی یەکەمی ناوی خۆم و ناوی باوکم کۆکردۆتەوە و بووە بە «مەم». من لەو کاتەدا ئاگاداری مەسەلەی نووسەری نامرادی عەرەب مەی زیادە نەبوو، هەروەها باوەڕ ناکەم محەمەد مەولوودیش ئاگادر بوو بێ و لەم کارەدا لاسایی ئەوی کردبێتەوە. مەسەلەی مەی بەم جۆرە بووە: جارێکیان لەمەی زیادەیان پرسیوە، مەی مانای چییە؟ وتوویەتی: نازانم، بۆ من مانای نییە، چونکە نە لە «میە»ی عەرەبییەوەیە کە ناوی کچەو نە مەبەسیشم «مي» بە مانای شەرابی ئێرانییە، بەڵکو تیپی یەکەم و دوایی ناوی خۆم «ماری»م کۆکردۆتەوە و بووە بە «مي»

## کۆواری «هەولێر»

لە دوا دوایی ساڵی ١٩٦٩دا مەم لە هەولێر خەریك بوو بە کار بەدەستانی شارەوانیی هەولێر بسەلمێنێ کە شارەکە پێویستی بە کۆوارێکی ڕۆشنبیریی مانگانە هەیە، وەکو ئەوەی لەوە پێش شارەوانی سلێمانی بە ناوی کۆواری «سلێمانی» دەری دەکرد (تەمووزی ٩٦٨/ - مایسی ١٩٧٠)، وا بوو لەم هەوڵ و تەقەلایەی دا سەرکەوت، ، کۆواری «هەولێر» کە مەم سەرپەرشتی و سەرنووسەری دەکرد ژمارە یەکەمی لە مایسی ١٩٧٠ دا بڵاو کرایەوە لە ساڵی یەکەمی دا شەش ژمارە و پاشکۆیێکی لێ دەرچوون.

لە ساڵی دووەمی دا لە مایسی ١٩٧١دا تەنیا یەك ژمارەی لێ دەرچوو، ئیتر گیروگرفت کەوتە ناوەوەو مەم لێی دوور کەوتەوە، ئەمە بووە هۆی دوواکەوتنی تا ئەیلوولی ١٩٧١ ئنجا ژمارەی دووەمی ساڵی دووەمی دەرچوو بە بێ مەم و دەستەیێکی نووسەران بەڕێوەی دەبرد.

محەمەد مەولوود بە هەوڵ و تەقەلای خۆی و پلەی کۆمەلایەتی و تێکەلاوی لەگەڵ ڕۆشنبیرو نووسەرانی کورد توانی کۆمەڵێك لەوانە لە دەورو بەری کۆوارەکە کۆبکاتەوە، دیارە پلەی خوێندەواریی خۆشی ڕەنگی لە کۆوارەکە دابووەوەو ئەدگار و دیمەنێکی جووانی دابوویە.

محەمەد مەولوود وەکو خوێندەوارو ڕۆشنبیرێك بیری دەکردەوە، نەك وەکو سیاسییێك، ئەمەش سەرێشە و تەنگوچەڵەمەی لە ژیانی دا دروست دەکرد.

دەسەلات بەدەست و مەڵبەندەکانی هێز لە کۆمەڵ دا بۆیان هەبوو گەلێ کردەوەو بیروباوەڕی پێچەوانە بە سەری‌دا بسەپێنن، بێ گومان بە مە ڕازی نەدەبوو، لەبەر ئەوە دەبینین لە یادداشتێکی دا بۆ سەرۆکی شارەوانی لە بابەت خۆکشاندنەوەی لە کۆواری «هەولێر» دا دەڵێ: «کە سەرەك نووسینیی کۆوارەکەم قوبووڵ کرد، مەرجێکم دانابوو، سەرۆکی شارەوانی پێشووی هەولێر پێی ڕازی بوو، مەرجەکە ئەوە بوو لە کۆوارەکەدا وەکو سەرنووسەرێك پێوەندیم بە وەزیفەکەمەوە نەبێ وەکو سەرۆکی مولاحیزین، چونکە لەوێ ڕۆژنامە نووسم، لێرە مووچە خۆرم، لەوێ دەبێ سەربەست بم، لێرە پێویستە بە پێی یاساو دەستووری دەوڵەت بجووڵێمەوە لەبەر ئەوەی ئەم مەرجەم خرایە پەناوە خۆم لە سەرەك نووسینی کۆوارەکە دەکشێمەوە.

محەمەد مەولوود بەتوندی باوەڕی وابوو کە کۆوار، هەموو کۆوارێك وەکو بەهار وایە، دەبێ زۆربەی کەرەستەکانی پێوەندی‌یان بە ژیانەوە هەبێ، وە لە سەر ئەو باوەڕە بوو، بە تاقە وتارێکی چاك یا شیعرێکی جووان کۆوارەکە نابێ بە کۆوارێکی باش چونکە بە تاقە گوڵێك بەهار نایە.

هۆی خۆ کشاندنەوەی لە کۆواری هەولێر جگە لە هۆ خودییەکەی پێشوو دوو شت بوو، یەکەمیان پێوەندی‌ی بە پلەی بیری کۆوارەکەوە هەبوو، وەکو ئەوەی کەرەستەی بێ کەڵکیان بۆ سنگ دەرخستن بەسەریدا دەسەپاند، دووەمیان پێوەندی‌ی بە جۆری کەرەستەکانەوە هەبوو چونکە بۆ سوودی هەندێ لە تاکەکانی کۆمەڵ بوو کەشایستەی ئەوە نەبوون و بەرژەوەندیی کۆمەڵ پشت گوێ خرابوو، سەرەڕای ئەمەش لە ڕەخنەی ڕاستی دیموکراتیانە گرژ دەبوون.

## مەم و «دەفتەری کوردەواری»

لەو سەردەمەی کە محەمەد مەولوود بیری لە دەرکردنی کۆواری «هەولێر» دەکردەوە، منیش لە بەغدا پرۆژەی بڵاو کردنەوەی «دەفتەری کوردەواری»م بە دەستەوە بوو. محەمەد مەولوود بۆ هێنانەدی «دەفتەری کوردەواری» هاندەرێکی کاریگەر بوو، بەڕاستی بە کۆواری خۆی دادەنا، دڵی پێ دەکرایەوە، هەر

لەبەر ئەوەش بوو لە هەرسێ ژمارەی دا نووسینی هەبوو، بۆ ژمارەی چووارەمیشی نووسی بوو بەڵام دەرنەچوو.

★ لە ژمارەی یەکەمی دا «ئەدەب و ... هەندێ بیری ساکارم بۆی بڵاو کردەوە بەڵام ئەوەی هەندێ تاریکایی خستە سەر ئەو لاپەرە رووناکانەی کە محەمەد مەولوود نووسیبوونیەوە ئەوە بوو نزیکەی لاپەرە و نیوێکی ووتارەکە بڵاو نەکرایەوەو هەروا لە ئەرشیفی مەم دا ماوەتەوە.

★ لە ژمارەی دووەمی دا چیرۆکی «پێشەوازی» م بۆی بڵاوکردەوە ئەم چیرۆکە یەکێکە لە چیرۆکە چاکەکانی محەمەد مەولوود، ئەوەی زیاتریش لەم چیرۆکەدا کاری کردۆتە سەر دڵ و دەروونم ئەوەیە کە دیمەنێکە، دیمەنی هاتنی خاوەن شکۆ بۆ ناوچەکەمان، لای محەمەد مەلوود بوو بە چیرۆکی پێشوازی ولای منیش بوو بە چیرۆکی پێشوازی خاوەن شکۆ.

★ لە ژمارەی سێیەمی دا «هەندێك .. شتی ووردیلە»م بۆی بڵاوکردەوە، محەمەد مەولوود لەو تابلۆ رەنگینەی دا رێرەوی سیمبوڵیزم (رەمزی) گرتووە وەکو لەگەڵ لە نووسینەکانی تریشی دا روون وئاشکرایە، دیارەشتی «ووردیلە» لای ئەو «گەورە»یە ، وەکو چۆن شتی «ساکار»یش پڕ لە «تەنگو چەڵەمە»یە.

## محەمەد مەولوودی مرۆڤ

بیرکردنەوەی محەمەد مەولوود لە مرۆڤ هەمیشەیی بوو، دووا رۆژی مرۆڤ لە ئاسۆی بیری دا ئاوا نەدەبوو، چارەنووسی مرۆڤ بە تایبەتی مرۆڤی هەژار و دەست کورت وبێ دەسەڵات دڵ و دەروون و مێشکی داگیرکردبوو، وێنەی ئەم هەژارانەی لە خۆی دادەدی ، لەبەر ئەوە هەستی راست و پاك وبێ گەرد بوو بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەی کە رۆژگار یاریدەی نەدابوون توانای بیرو بازوویان بۆ چاکەی ژیانی خۆیان و کۆمەڵ بەکار بێنن.

بێ کەسیو ئاوارەیی و نەبوونی هەندێ گرێی سایکۆلۆجی لە ئادەمزاد دروست دەکەن هەزاران هەزار کەس دێنە سەر رووی ئەم زەویەو ئەو گرێیە لە ژیان دا دەیانتلێنێتەوە، لە ئەنجاما بە هێمنی و بێ دەنگی، بەبێ ئەوەی کەس ئاگادار بێ مەرگ کۆتایی بە ژیانیان دێنێ، بەڵام تەنگوچەڵەمەی گیانی کە تووشی محەمەد مەولوود دەبێ لەبەر بێ کەسی یە کۆمەڵ دەتوانێ ئەم بۆشاییەو بێ کەسییەی بە «بەکەسی» پڕ بکاتەوە مەبەس لە کۆمەڵ خوێندەوار و رۆشنبیرو ئەدەب پەروەرانن ئایا خوێندەوارانی کورد دۆخێکی وایان رەخساند بوو کە محەمەد مەولوود هەست بەبێ کەسی نەکا؟!

محەمەد مەولوود ناحەزی هەبوو ئەمانە خەڵکی جیاواز بوون، یەك ئیدیۆلۆجی کۆی نەدەکردنەوە، هەر یەکەیان بە بەڵگەیێکەوە لە ناخەوە محەمەد مەولوود وەکو ناحەزێك نەدەهاتە بەرچاوی خۆ سەردەمی ئەو باو باوی «پێشکەوتن خوواز» (تقدمی) و «کۆنەپەرست» (رجعی) و «پرۆلیتار» و «ئەمپریالیزم» و شتی تر بوو لەبەر ئەوەی مەم لەو رێکخراوانەی ئەم دروشمانەیان هەڵگرت بوو، دوورە پەرێز بوو، لایەنگرانی ئەو رێکخراوانە بە چاوی گومانەوە تەماشای محەمەد مەولوودو هەموو بێ لایەنەکانیان دەکرد مەبەستیش ئەو کەسانە بوون شناسنامەی هیچ رێکخراوێکیان لە گیرفانا نەبوو بەڵام ئەوەی راستی بێ مەم وەکو کەس بەگشتی و بەرهەمە ئەدەبییەکەی بە تایبەتی بە تەرازووی «پێشکەوتن خواز» و « کۆنەپەرست» ناکێشرێن نووسینەکانی لە پلەیێکی بەرزی داهێناندان و بۆ مشتومالٚ کردنی بیرو هەست و نەست و خەیاڵی خوێندەوار لە رووی ئیستێتیکییەوە بوون بەسەرچاوەیەکی گرنگ ، بەمەش گەلێ خزمەتی چاك کردنی باری ژیانی ئادەمزادی کردووە هەروەها لە پێناوی هێنانەدی هەموو ئامانجە نەتەوایەکاندا بووە لەبەر ئەوەیە مەم رۆڵەی دڵسۆزی نەتەوەی خۆی بوو، هەمیشە ئەوەی لەبەر چاو بوو کەنەتەوە دەبێ تێرو ئازاد بێ، ئەمە دروشمێکی راست بوو.

## ساڵێك و شتێك پێکەوە بووین

هەفتاکانی ئەم سەدەیە لە ئاوابوونابوو، مەم دڵ و مێشکی ماندوو بوو، ئەو لە هەولێر و من لە بەغدا، زۆر جار کە چاومان بە یەکتری دەکەوت لە سەر یەك شت رێك نەدەکەوتین، من سوور بووم لە سەر ئەوەی لەو ماندووترم، ئەویش سوور بوو لە سەر ئەوەی لە من ماندووترە. هەر چۆنێ بوو بێ راستییەکەی هەردووکمان ماندوو بووین، زیاتر ئەو گرفتاری نەخۆشیش بوو

بوو. وا بوو من لە زانستگای بەغدا دوور خرامەوە، ئەگەرچی ئەمــە کارێـکی گەورەی کردە سەر گوزەران ودڵ و دەروونم، بەوەی دەبوو بە مووچەی خانەنشینی یەکەم بژیم کە زۆر کەم بوو، هەروەها لە قوتابیانیش دوور خرامەوە، بۆ منیش وەکو خۆم بیـزانم قوتابی زەر. بایە و من ماسی! لەگەڵ ئەوەش دا دوور کەوتنـەوەم لە زانستگا جۆرە ئارامی‌یێکی گیانی خستە دڵ و دەروونــمـــەوە بەوەی لە لایــێـک لە هەنــدێ کەسی خاوەن خووڕەوشتی پێچەوانەی خۆم دوور کەوتمەوە و چارەیان وون بوو لە پێش چاووم، ئەم کۆمەڵە ناهەموارە لە ئەنجامی وەزیفەی میریەوە دروست بوو بوو، لە لایێکی ترەوە لە هەندێ دڵسۆزی وەکو مەم و هاورێکانی نزیك بوومەوە، لە سەردەمی سەرەتای هەشتـاکـانی ئەم سەدەیــە لە شاری هەولێری خۆشەویست، هاورێ ڕاستــەقینــەکــانم زۆربــەیــان دانیشتــووی هەولێر و سلێمانی بوون.

لەو ماوەیــەدا زیــاتــر چوومــە ناخی دەروونی محــەمـــەد مەولوودەوە، ئەو ڕاستی‌یــەم بۆ دەرکەوت کە هەست کردن بە تەنیایی دڵ و دەروونی داگیر کرد بوو، بەڵام بەوەی باش بوو ئەمـــەی بە کۆمـــەڵەوە بەستبـــووەوە، واتـــە خۆی و کۆمـــەڵ هەردووکیان هەستیان بە تەنیایی دەکرد، ئەمە وا کاری تێ کرد بوو کە بیری لە قەڵەمی تیژتر و بەهێزتر بێ، هەرچەندە زمانی قسە کردنی محەمەد مەولوود پاراو و ڕێك و پێك بوو، نووسینیشی لە قسە کردنی پاراوترو ڕێك و پێك تر بوو، بەڵام نووسینەکانی لە پلەی بیرکردنەوەکانی‌دا نەبوو، ئەمیان لەویان بە هێزتر بوو.

## ئێوارەیێکی بەهار

ماڵمان لە یەکتری‌یەوە نزیك بوو، ئەو لە سەرەتای گەرەکی ڕووناکی و منیش لە نزیك بنەتای ڕووناکی خۆشەویست بووین. ڕۆژێك پێشتر بەرنامەمان دانا بوو، پاش نیوەڕۆ من بەپێ بچم بۆ ماڵیان و لەوێوە بۆ گردی قارنچ ئاغا، ئنجا گۆرستانەکانی چراغ و گەورەو یانەی فەرمانبەران و قوتابخانەی ئوولای کۆن لە پاشـانـا بەرەو قەڵا سەرکـەوین، لە دەرگای بچووك بێینە خوارەوەو ڕوو بکەینە تەکیەی شێخ عەبدولکەریمی دارە خورماو ئنجـا مزگەوتی شێخ مستەفای ئەقشبەندی، لە دوای ماندوو بوون لە دوکـانـەکـەی عەبدولخالیق مەعرووف بنیشینەوە بۆ حەســانـــەوە، پاش ڕۆژئــاواش لەگـەڵ ئەو چەنـد کەســەی دوکانەکەدا میوانی خۆمان بین لە یانەی ئازادی.

پاش نان خواردنی نیوەڕۆ خۆم کۆکردەوە، هێشتا لە دەرگای باغـەکە نەچووبوومە دەرەوە، هەوری نیسان ئاسمانی تاریك کرد گاڵە گاڵی هەورە تریشقە و ڕێژنەی باران بوو، چەتر سوودی نەبوو، بارانی ئەو کەژمش هەر تاوێك بوو، ئاسمان کرایەوە و پەلکە زێرینە دەستی ڕێزی خستبووە سەر سنگی بۆ هەموو ئادەمــزادێـك بۆنی بەهــار بەم بارانە خۆشتر بوو، کە بۆ ماڵی محــەمەد مەولوود بچوومایە لە ماڵی خۆمانەوە ڕێگەی سەوزم دەگرتە بەر و خۆم لەو کۆڵانە بۆ گەنانە ڕزگار دەکرد کە وەکو شەقڵی بازرگانی‌یە بۆ هەندێی لە کۆڵانەکانی شاری هەولێر کە گەیشتمە بەر دەرگای ماڵی مەم و چاووم لێ‌ی بوو لە پێش دەرگا پیاسەی دەکردو چاوەڕوانی من بوو، ووتی:

- کاکی خۆم دیــارە دڵ خۆش و گوشــادی بەم بارانە، دەزانم هاوینەکە ئەوەندە ووشکە دە ئەوەندەی تریش باران تێرت ناکا، دڵت هەر لەلای گوڵ و موڵ و دار و درەختەکانە! ووتم:

- ئێ کاکە مەم، زۆر سەیرە نازانم بۆچ هەر لە خۆمەوە پێش ئەوەی یەکتری ببینین وام‌دەزانی کە تۆ مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی؟.

- تۆ دەتەوێ من خەون و خەیاڵی تایبەتی خۆتت بۆ لێك بدەمەوە؟

- بەڵێ.

- وابزانم بەلای تۆوە مامۆستای قوتابخانە گەورەیە، هەروەها نووســەر و شاعــیرو چیرۆك نووسیش گەورەن، ئیتــر لە پاش «پەنجا فلس»ەوە ناوی من لە دڵ و دەروونت دا دروست بووە، دیارە هەر لە خۆتەوە پیشەی مامۆستای قوتابخانەی سەرەتاییت بۆم دروست کرد، ئەمە لە خەیاڵەوە هاتووە بەڵام لە مێشکت دا شێوەی ڕاستی وەرگرتووە.

**- ئەمە وایە.**

**- بەڵام تۆ شتــێــکــی تریــشــت بۆم دروســت کردووە، باوەرنامەی مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی، کەچی من هیچ باوەرنامەیێك نی‌یە هی شەشەمی سەرەتایی نەبێ**

**- بەڵام تۆ خۆت لە هەموو باوەڕنامەیێك گەورەتری.**
**- بەلای تۆوە، نەك بەلای ئەو کەسانەی خۆیان بە باوەڕنامەی دوکتۆری و موکتۆرییەوە هەڵدەکێشن.**
**- ئەوانە بەستەزمانن!**

هەموو دیمەن و دیاردەیێکی سروشت لەگەڵمانا دەدووا و یادگاری ڕابردووی دەگێڕایەوە، لای دەستی چەپمان لە سەر ڕێی کەرکووك هێشتا هەر سروشتی خۆڕسك بوو، بەڵام لای دەستی ڕاستمان هەندێ خانووبەرەی لێ دروست کرابوو، ووتم:

- کاکە، هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتایی بووم، ئێوارەیێك، وەکو ئێستا بەهار بوو، بەڵام ئەم ناوە چۆڵ بوو، خەڵکێکی زۆر لەم ناوە بوون خاوەنی ئەم زەوییانەش لەوێ بوون، سنگ و گوریس و کوتەکیان بەدەستەوە بوو، بە گوریس زەوییان دەپێوا، ئەو کابرایەی سنگی بەدەستەوە بوو لە پاش هەموو پێوانەیێك کە دەیویست سنگی ئەو سەری گوریسەکە لە زەوییەکە داکوتێ، خاوەن زەوییەکە دەیوت ڕاوەستە، دوو هەنگاوی تریش زەوی دەخستە سەری وەکو پیاوەتی و ئنجا سنگەکەیان دەکوتا.

- بەڵێ ئەو سەردەمە وابوو. بە حسێبی ئەمڕۆ ئەمە بەرەڵڵایی بوو، بەڵام بە هەموو حسێبێك پیاوەتی و دڵسۆزیشی تێدا بوو.

یادی گۆڕەپانی سێزدە عەلەتریکی پاش جەنگی گێتیی دووەممان کردەوە. ئەم ڕێگەیە هەر خودا خۆی دەیزانی لە سەردەمی میدیایی و ئاشووریەکانەوە، تا مەغۆل و سەربازی تورك و ئینگلیز چی بیرەوەریی و سەرو سەربردەیێکی لایە!

لەم ڕێگەیەوە دەچوون بۆ ئاوی میری بۆ پێشوازیی حاجییان، بۆ نوێژی بارانی بەهاری بێ باران، خۆپیشاندانی دەروێشان بەهای و هووو دەف و تەپڵ و زەرگ وەشاندن لەسەر ئەم ڕێیە بوو و دووایی بە تەکیەی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما دەهات. لە مانگی مەولوودا هەر ئەم ڕێیە بوو بە قوماشی سەوز و سوور دەرازایەوە.

**محەمەد مەولوود ڕووی قسەی کردە من ووتی:**

**- ڕاستە هەر ڕێیێك شێوەیێکی هەیە، «ڕێگاکەی منیش شێوەی تایبەتیی خۆی هەیە.**

**- «ڕێگاکەی یەڵماز گۆناییش بابەتێکە.**
**- هەموو شت ڕێگەی هەیە.**
**- گرنگ سەرەتای ڕێگە نییە، بەڵکو ڕووداوەکانی درێژاییەکەیەتی، لەوێش گرنگتر ئەنجامە.**
**- بەڵێ! بەڵێ! ژیان ڕێگەیە، ڕێگەی بێ ئەنجامیش کارەساتە.**

دەمەتەقێ دووایی نەدەهات، تەنانەت لە پێش دوکانەکەی عەبدولخالیقیش ماوەیێك وەستاین، بیرەوەری و یادگارو خەیاڵی دڵ ڕووناك کەرەوە گوێی کەر کردبووین بەرامبەر بانگ کردنەکانی عەبدولخالیق: فەرموون بۆ ژوورەوە. بێ گومان دوکانەکەی ئەویش، ئەکادیمیا نەبوو لەو بەرزتر، ئامۆژگا نەبوو لەو بڵندتر، زانستگا نەبوو لەو بەنرختر هیچ نەبێت بۆ ئێمە، قوتابیانی ئەو دوکانە بەختیارن بەوەی کە لەوێ فێر بوون.

## ئاوارەییێکی تر

دوورکەوتنەوە لە قوتابی کارەساتێکی تر بوو بۆ من، نەمتوانی زیاتر لە دووساڵ و نیو بەبێ قوتابی هەڵبکەم، ساڵێکی بەغداو ساڵ و نیوەیێکی هەولێر.

دوورکەوتنەوە لە شاعیرو نوسەرانی هەولێر کارێکی قورس بوو بۆ دەروونی من، بەڵام نزیك بوونەوە لە قوتابی ئەو کارەی ئاسان دەکرد.

ڕۆژێك بەر لە ماڵ ئاوایی، ئازیزێکی بنەماڵەمان کۆچی دووایی کرد، عەباسی پوورزام، محەمەد مەولوود و هاوڕێیان کە خۆیان ئامادە کرد بوو تا بەغداش بەڕێم بکەن، دوو ڕۆژ لە پرسەدا دانیشتن، ئەو دوو ڕۆژە لەگەڵ ئەوانا خەفەت و بارگرانی مردنی ئەو ئازیزەی سووکتر کرد بوو، لە دەموچاوی محەمەد مەولوودا بارگرانی ژیانم دەخوێندەوە، من بیرم لەوە لە دوورکەوتنەوە لە نیشتمان دەکردەوە، ئەویش دیار بوو بیری دەکردەوە بێگومان لە من دەکردەوە ئیتر نازانم بیری لە چی تریش دەکردەوە؟

لەناو فرۆکە کاتێ بۆ ئاوارەیی و زیندەگانی لە وڵات و خاکێکی دوور دەچووم بیرم لەو کەسانە دەکردەوە کە جارێکی تر چاوم پێیان ناکەوێتەوە، نەمدەویست ئەو کەسانە دیاری

بکەم، چونکە بۆم نەدەکرا پێو بەساڵا چووەکان نەبێ. لە ئاوارەیی‌یێکی پێشـووترم دا نەمدەزانی جارێکی تر چاووم بە دایکی دڵسۆزم ناکەوێتەوە، ئەمجارەش بیرم بۆ هەموکەس چوو بێ بیرم بۆ محەمەد مەولوود نەدەچوو لە پاش گەڕانەوەم لە باتی ئەو بێ بۆ ڕووناکی بۆ پێشوازی‌ی هاتنەوەم من بچم بۆ سەر گۆڕی لە شەقڵاوە.

## پێوەندی‌ی گیانی

ئەگەرچی لەگەڵ محەمەد مەولوودا بە لەش لە یەکتری‌یەوە دوور بووین ئەو لە ئاسیا و من لە ئەفریقیا، بەڵام بە گیان لە یەکتری‌یەوە نزیک بووین، ئەگەر پۆستە نارەوایی لەگەڵمانا نەدەکردایە ڕەنگە هەبوو بەختەوەرتر بین. لەگەڵ ئەوەش دا چەند نامەیێک کەوتە نێوانمانەوە.

محەمەد مەولوود نامەنووسێکی باش بوو، دەتووت نامە بە شێوەیێک دەنووسێ کە بۆ بڵاوکردنەوە بشێ، نامەکانیم پێ خۆش بوو چونکە ڕەنگ دانەوەی دڵ و دەروونم بوون،

، وەرام دانەوییێک بوو بۆ هەموو ئەو پرسیارانەی کە لە مێشکما پەنگیان دەخوواردەوە لەنامەکانا سروشت و ڕووداوی کۆمەڵایەتی تێکەڵ بە کردەوەو هەڵسوکەوتی برادەران دەکرد ...یزانی حەز لە چی دەکەم و ڕقم لەچی دەبێتەوە.

## ئەنجام

ئێمە لە سەر ئەو باوەڕە نین کە نابێ شاعیرو نووسەر و ڕۆشنبیرانمان بەراوورد بکەین لەگەڵ هی ئەورووپایی‌یان چونکە وا دەزانین ئەوانەی ئێمە نمرەی کەمتر وەردەگرن، ڕەنگە ئەمە لە ڕووی قەوارەوە ڕاست بێ، چونکە ئەوان نووسینیان لە هی ئێمە زیاترە، بەڵام لە ڕووی ناوەرۆکەوە ڕاست نی‌یە محەمەد مەولوود یەکێکە لەو چیرۆك نووسانەی کە چیرۆکەکانی لە پلەیێکی بەرزی هونەری دان، بەڵام لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە بەختی یار نەبووە هەندێ کەس خۆشیان نەدەویست چونکە دەیانزانی چیرۆك نووسێکی باشە ئەوەی ئەو دەیکا ئەوان پێ یان ناکرێ، هی تریش پشتیان لێ دەکرد چونکە پارێزگاری‌ی ناوی بەرزی «نووسەر»ی دەکرد. دەبێ نەبوونی شناسنامەی ڕێکخراوێکی سیاسی لە گیرفانی دا نەبوو بێتە هۆی ئەوەی ئەمانە ئەگەر بەسەریشی دا هەڵنەڵێن، لەسەری نەکەنەوە

●

محەمەد مەولوود «مەم» کێ‌یە؟

★ محەمەد مەولوود «مەم» لە ساڵی ١٩٢٧ لە دایك بوو.
★ خوێندنی سەرەتایی و ناوەنجی‌ی هەیە.
★ لە ساڵی ١٩٤٤ لە ناوچەی برادۆست دەبێتە ...وچەخۆری میری.
★ لە پەنجاکان دا بە هۆی وەزیفەوە زیندەگانی‌ی لە شەقڵاوە و کۆیە و هاوینەهەواری سەلاحەدین کردووە.
★ لە سەرەتای شەستەکانەوە گوێزاوەتەوە هەولێر وەزیفەکەی لە شارەوانی هەولێربووە
★ وەکو هەموو خوێندەوارێکی کورد سەرەتا بە شیعر دەستی پێ کردووە، بەڵام زوو خۆی دۆزیوەتەوە لە سەرەتای پەنجاکانەوە خۆی لەگەڵ کورتە چیرۆك خەریك کردووە.
★ لە ڕۆژنامە و گۆوارەکانی سەردەمی ژیانی خۆی بەرهەمی بڵاوکراوەتەوە.
★ لە ساڵی ١٩٧٠ بە شێك لە چیرۆکەکانی بڵاوکرایەوە
★ لەساڵی ١٩٨٤ بەشێکی تر لە چیرۆکەکانی بڵاوکرایەوە
★ لە ڕۆژی ٧ی مایسی ١٩٨٧ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە و لە شەقڵاوە نێژراوە
★ پاش کۆچی دوایی «پایزە خەون» چاپ کرا و «ڕێگا»ش چاوەڕووانی چاپە

هەولێر - ڕووناکی ١٩٩٠




دیسان دەنگی دەف و زیکرە، دەرویش حاڵی مەرگمانە
من و ئەو کوڵە نهێنییە
سۆزی عیشقی شەوانە دڵم دادەگری
هەندێ لە خۆ بێزار دەبم، هەرپێکەوەین
هەر لێرەوە لە سەرێتی شەکەت بووما
ئاوەدانی واز لە تەنهاییم ناهێنێ
ئەم هەوارە، بەزمی چنارو شەنگە بییان
لەسەرویسکی بابان ویرانی سەربەتەم ئاڵۆزترن
ئەو شێوَ نازانم چ مەفتەن
لە ویرانی سەریسکی ئازداران ئارامترن
سالانێکە شنەی بیدادی میوانە
وەرە پەنا هەندەی ویرانی دڵی من بە
من ئەساڵم لەویرانی خوێبینیووە
ئەشەویکی سەرمەستانە
لەئارامگای دوا هەناسەی کۆچی مێژوو
لە هەورازی رێی بەرەو ژووری غەریبان
کوێرستانی رێکاو بان و تەرمی بە تەنیا جێماوی
سەربردە دوور
لە ئەوەندە بێ مەیلەو بێخۆستم نرسێکی گەورە
ئەوەنیە لە شەوانەی بێ ئاگایی و
لە رۆژانی سەرشێتیما
تۆی هیلاکی رومەت زەردو بارگرانیش
دڵی لاوو غەریب لاوو
سێبەری دڵی منی جوانێ
مەلیکی چاوی منۆ سوارۆ..

★ ★ ★ ★ ★
★ ★ ★ ★

وەرە ئەوشێو میوانی دواشەوی دڵی من بە
من لە ساڵم لەویرانی خۆبینیووە
ئەشەوێکی سەرمەستانە
من وڵاتێکم هەژاوە.. ئازیزەکانی پەرگەندەو
ماچیان مەرگە خاکی لە برینان وەرس بوو.

# خوێندنەوەی تەرمی لەکان

شیعری:ئازاد صبحی

لە کانیە دوورەکانی پشتمەوە دەست بۆ خەندەو
یاریە بێ باکەکان دەبەم،یادی سەرەتاتکێ
ئاسان و دێرینەکانی نێو قژە منالیەکان کلۆلیی
ئەم بارانە خەڵەتاوانەم لێ دوور دەخاتەوە...ئۆی
بارانە ساختەکان،من.
بەستەزمانم
یان ئێوە رێگای سەفەرە ژەنگاوییەکان لە گەردنم
دەئاڵێنن؟
زیاتر دادەچۆڕێم بەڵکو ببمەوە
ماسیە سەماکەرەکەی نێو ئاوو لە
چەتوونەکان
یادم گیرۆدەی ئەو چرکە دوور و تەرانەیە کە بە
ناچاریی لە فارگۆنە پەرتەکانی دوای خۆمەوە جێم
هێشتن...دەی چرکە منالەکان لە گەڵ بارانە
هەمیشە سەرسامەکاندا سەما بکەن،بەربەستەکان
فێری مۆسیقای...
ئاو بکەن.
تەرابیە کۆنەکان گەمارۆم دەدەن و چاوە
خۆڵاوییەکانم دەتەکێنن،لە پانتایی و پێچەکانی
ونبوونمدا بەدوای سێبەری دەنکە لمێکدا دەگەڕێم
ئەوە کێیە لە ژێر زبڵ و خۆڵەمێش ساڵە
سووتاوەکاندا نائومێدانە چاو دەتروکێنێ؟
ئاوور دەدەمەوە...
لە سەر شاشە ئاوییەکان
پێکەنینە فریشتەییەکانی کچۆڵە پێپەتی و قژ
سەوزەکان دەبینم،ئەو کیژۆڵە چاورەش و قردێلە
سپیە دادەگیرسێ کە پێکەوە پەنجەکانمان بە
دڵنیایی تەپۆلکە و چاڵە لمەکان دەسپارد...
(خواوەندی لمەکان تۆراوە...چونکە بە زمانی
لۆژیک دەدوێین،دەفتەر و وانەکانی ئاومان سوتاند
وسەر سامیمان فڕێ دایە دەریا دوورەکانەوە...)
وباسی ئەو دێوانەمان دەکرد کە خوێنی کوکوختیە
خەمبارەکان
دەدزن...
کوکوختیەکان نهێنی فرمێسکەکانیان
پێچاوەتەوە،
بۆ لای ئاسمان و دەرختەکان کۆچیان
کردووە،نێوەرۆی هاوینەکانیان کردۆتە پەنجەرەی
گریان و لەوێوە نەفرەت لە پیرەژنە
بەدەکان دەکەن.
دایکم... گوێی لە داروخانی خوێنە ترساوەکان
نیە
دایکم... نازانێ ساڵە شکاوەکان نابنە پلیکانەی
قاچە گۆجەکان
دایکم... لای عەیبە پیاوێ بۆ قردێلەی سپی و
پەنجەو لمە لە دەسچوەکان بگری
دایکم... تەرمی بوکەشووشەکانم لێ دەشارێتەوە
ئەو بوکەشووشانەی خۆی بەمناڵی ناویانی لە سەر
رومەت و ناوچەوانم بە پیتی رەنگاورەنگ دەنووسی
وێنەکانیانی لەنێو گلێنەی چاوومدا دەکێشا
کە بە بەرچاوییەوە رووتایەتی شتەکانم بەسەرقژی
زێرینی ئێوارەکاندا
دەڕژاند...
گشت
پەپوولەو
کەنارییەکان،
لەسەر برژانگەکانم دەنیشتنەوە
باسی خەونی لمە تەرمەکانیان بۆ دەکردم.
ئێ ی... بابەنوئێلە بزرەکان،ئەوە جلوبەرگی
رەنگینی دیارییەکانە دەسووتێیان
تەمەنی ریشە سپیەکان
ئێ ی بەفرە لاڵەکانی دەرختی لەدایکبوونی
مەسیح، ئەوە نامەی پیرێتی ئێوەیە یان
نووسینەوەی تەرمی لمەکان؟

لەئاسۆی

# سترانەک بۆ سەمەرقەند (*)

شیعرەوە

مەعین بەسیسۆ

وەرگێڕانی: نەژاد عەزیز سورمێ

لەکاتێکدا تەیمووری لەنگ، دوور لەشاری
سەمەرقەند؛ خەریکی یەکێك لەشەڕەکانی
ـەی
حەمی ژنی، هەموو ئەندازیارانی سەمەرقەند
ـەکۆکردەوەو داوایان لێدەکا پەرستگایەکی
ـەیی بۆ دروست بکەن؛ پێشوازی (تەیموورلەنگی)
ـەکا. بەڵام بەمەرجێك پەرستگاکە لەچەند
ـەـێك دا تەواو بێ.
ـەستی هیچ ئەندازیارێك نەوێرا خۆی لەم پرۆژەیە بدا،
ـەندازیارێکی لاو نەبێ، ئەویش لەبەرابەر ئەوەی خانمی ژنی
تەیمورلەنگ ماچێکی بداتێ.. هەرچەندە خانم تەماحێکی زۆری
ـەتە پێش ئەندازیارە لاوەکە بێ سوود بوو..
هەموو زێڕو گەوهەرەکانی ڕەت کردەوەو بەماچەکەوە نووسا..
ـەکام خانم، دەستی خستە سەر ڕوومەتیو ڕازی بوو بەوەی
ئەندازیارەکە لەسەر دەستی لەرزۆکییەوە ماچی بکا.. بەم جۆرە
پەرستگاکە دروست بوو.
کەتەیمورلەنگ گەڕایەوە، پێی زانی،
ویستی کەتنێك بەئەندازیارە لاوەکە بکا،
ـەڵام سوودی نەبوو؛ ئێشتاشی لەگەڵ دابێ
ـ بووو نەکەوتە دەست..»

ـ خانمەکەم
ـەشکرشکێنم و نەخاوەنی دەربار
بەڵام پێم دەکرێ، ئەوەت بدەمێ
ـێو خەنجەرو
هەموو تەخت و تاراجی زەوی، نەیاندابێ
چەند ئاسانە ئەم جیهانە بەلەپی دەست سەرببڕێ
چەند ئاستەمیشە لەلێوی ئێمەوە لەدایك بێ...
چەند ئاستەمە قەپێلکی هێلکە بشکێو
جوچەکەیێ لەشەقەی باڵی بدا..
ـ دارگوڵێ لەژێر لێفەی تەیموور بڕوێ..

خانمەکەم، جیهان مناڵێکە لەئێمەدا، وەختێ یەکترمان
خۆش دەوێ گەورە دەبێ..
دەبێ بەدڵ خانمەکەم!
کەشمشێر جێی دڵ دەگرێتەوە،
خۆشەویستیش دەمرێ..
پاسەوانەکانت لەژێر شوورەکاندان
بانێژەکەشت دوورە..
بەڵام من خوێنبەرەکانم، دەکەم بەپەت
عاشق دەستی بەخۆریش رادەگا..
ئەوەیە موجیزەی خۆشەویستی خانمەکەم
گۆچانەکەی نەشوەشێنێ، دەبێ مار
رستەی دەسرۆکان، رستەی دەسرۆکان
لەدەمییەوە دەرناکا...
(هابیل) لەتەرمی (قابیل)دا
ناهێنێتە دەرەوە...
خانمەکەم،
جادووگەر هەرگیز نابێ بەعاشق
لەوە جوانتر،
عاشقی ژنی قەیسەربی
ناپاکی لەقەیسەر بکەی..
چ لەوە جوانترە
بەینی هەردوو چاوی قەیسەر
بدرێتە بەر باڵی بولبول
ـ: بمدرە بەرگوڵ
بمدرە بەر خەنجەر..
ـ: خانمەکەم!
تەیموور ئەوەتا لەبەر دەروازەی سەمەرقەند

(*) بۆ ئەسڵی ئەم شیعرە: بڕوانە کۆشیعری (القتلی والمقاتلون والسكاری)، بڵاوکردنەوەی دار العودة ـ بێروت ١٩٧٠ ـ ل ٦٤ـ٧٠.

تەیموور خوداوەندە
فریشتەو شەیتانەکان..
داروو دەستەو سەربازەکانیەتی..
چیبکەم؟
ئەدی قەیسەری گەورەم؟
بەڵام من لەپێناوی تۆدا
خیانەت لەقەیسەریش دەکەم..
هێشووی بروسک، کەزی قژەکەت
تریفەی بروسکەی لەلێوەکانتدا هەڵبوو
هەموو مۆم و ئەستێرەی شەو،
هەموو رووناهی خۆر دێنێ..
ـ: ماچم کە!
بەسەر لەپی لەرزۆکی بەگوناوە نووساوم دا
ماچم کە!
بەناوی سەمەرقەندەوە..
ـ: خانمەکەم ماچەکانت مردنە..
رەنگی قۆدگا، رەنگی ئاوە..
وەلێ شاعیر، خانمەکەم
لەرووبارێکی رەواندا لەدایک نابێ
بەڵکو لەبروسکەیەک هەڵدەدێرریٚو
. دەمرێ...
قەدەری شاعیر ئەوەیە خانمەکەم:
مەدالیای قەیسەر رەت دەکاتەوە..
نانی قەیسەر رەت دەکاتەوە
شەرابی قەیسەر رەت دەکاتەوەو
بەخەیاڵی مەستی
لەچۆرێ بروسک، تێدەتەقێنێ..
بروسک دەیکوژێو
بروسک زیندووی دەکاتەوە..
خانمەکەم

ئەگەر ماچەکانت گەردوونێک و
شارستانیەتێک بنیات بنێن؛
داخۆ چەند گەردوو لەژێر
لێفەو سەرجێیت لەدایک دەبن؟
رۆژگارێ دێ
ماچ تامردن راودەنرێ..
جێو بالنگانی عاشقان
پیاڵەی مەییو
بەیتی شیعر راو دەنرێن
رۆژگارێ دێ
سەری پاسارییان دەبررێو
بەشوورە شۆر دەکرێنەوە..
بەڵام ئەوە تەیموورە
بەردێکە لەزەویدا رواوە
خانمەکەم!
بەرد چەندی رەنگ و دەماری لێبروێن
نابێ بەدرەخت
شەو هەرچەندێکی برسی بێ
ئەستێرەو مانگی خۆی ناخوا
چۆلەکەی سەمەرقەندیش
بەژێر نینۆکی تەیمووردا
دانەوێڵە هەڵناگرن..
چی بەئەژدیهاوە ماوە خانمەکەم؟
لەچرنووکی شکاویو
پاشماوەی ئەفسانەکان بەدەر
چیپێماوە؟
چ هیلاکە ئەو دنیایەی
سیماو رووی چۆلەکەی هەیەو
دڵی ئەژدیها...
(چ هیلاکە...)

دەقێکی ڕەخنەیی

# بەبیابان بوونی جیهان و تراژیدیای کۆلۆنێل

خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی نمایشی

«کەس نیە نامە بۆ کولۆنیل بنێرێت»

خوێندنەوەی/ هۆشەنگ محمد امین

- ڕۆمانی: گابریل گارسیا مارکیز
- دارشتنی دەق و نمایش: هادی المهدی
- وەرگێران و نواندن: ئیبراهیم جیوار

«نیان کەریم» لە ڕۆڵی ژنەکەی کولونێل

★ «نمایشی شانۆیی ڕستێک نیشانەیە (علامات)، واتە شانۆ هیچ فەرمانێکی نیە ئەگەر ئاماژە بۆ شتێکی دیکە نەکات، وە لەوە دەکەوێت شانۆ بێت، ئەگەر شتێکی دیکەی دەست نیشان نەکرد»

- ئوتکار زیخ -

★ «هەمو شتێك لە نمایشی شانۆیی نیشانەیە»

- تادیوس کوزان -

- ئەم باسە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی پێکهێنەرەکانی نمایشی «کۆلۆنێل»ی شانۆییەو دۆزینەوەی بونیادە شاردراوەکانیەتی، وە هەوڵدانێکە بۆ خوێندنەوەی «دەرەوە» لە بواری ئاماژە/ نیشانەکان «العلامات المرئية» وە ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی پانتایی بینراوی نمایشەکە.

ئەم باسەرەخنەیی‌یە بەسەر دوو تەوەری شیکاری دابەش دەبێت:-

**١) هیچی جیهان ناکردەیی کۆلۆنێل**

**٢) نمایش لە نێوان دووانەیی (ناوەوە/ دەرەوە)**

بەڵام پێش ژوورەوەی باسەکەو خوێندنەوە، تۆزێك لای سنوری دەقی ئامادەکراو دەوەستین و مەسەلەی بەیەکداچوونی دەقی «التنـاص» لەگـەڵ چەند دەقێکی جیهانی، بەیەکداچوونێکی دەقی هەیـە لە نێوان دەقی ئامادەکراوی ئەم نمایشەو چەند دەقێکی تر وەك «تـابلۆ/ بێ دەنگی»ی نووسـەری ئینگلیزی «هـارولد بنتـر» وە دەقی «لە چاوەڕوانی غۆدۆ»ی نووسـەر سامـوئێـل پیکیت وە دەقیتر.. ئەو بابەتانەی وەك «پرۆسەی تەداعی کردنەوە/ لە دەست دانی یاخود نەمانی گەیاندن لە نێوان کە سایەتیەکان و نیشتەجێ بوون لەیادەوەری» ئەمانە هەی یشە بەرەو هەردوو شانۆگەری بنترمان دەبەن، کە زمانێکی شپرزە جیاکەرەوەی سەرەکی دەقی بنتەرە، وەنەمانی تەواوی زمـانی لەیـەك حاڵی بوون، وەگـەڕانـەوەی بەردەوامی ئەم کەسـایـەتیـانە بۆ ڕۆژانی رابردوو وەترس لە رەگەزی زەمەن ...هتد، لەم جیاکەرەوانە..

لەلایەکی ترەوەش، چاوەڕوانی‌یەکی بێ هوودەو، وەستاویەکی تەواو لەبـارو مرۆڤـدا، (نـاکـردەیی). وە چاوەڕوان کردنی، ڕوودانی شتێك، ئەمە تیمەی سەرەکیەکە نمایشەکە لەسەری بونیـاد نراوە، ئەم حاڵەتـەش فرێمان دەداتە ناو جیهانەکانی دەقی «لە چاوەڕوانی غۆدۆ»ی ترسناك و سامناك. کە جیهانێکە هیچ شتێکی تێدا ڕوونادات، کەسێك نایەت، کەسێك ناڕوات، جیهانێکە مرۆڤ تێیدا بەسەری داسەپانراوە کە موڵی وەهمی خۆی دروست بکـات.. بەڵام لە گەڵ ئەمـەش دا هەمـووی، پێـویستـە ئامـاژە بۆ جیـاوازیـە دیـارەکـانی نێوان هەردوو (چـاوەڕوانیـەکـە) بکـەین، چ‌وەڕوانی کۆلۆنێل و چاوەڕوانی

---

● «تصحر العالم وماساة الكولونيل».. ئەم باسە رەخنەیی‌یە لە بنەرەتدا بە زمانی عەرەبی نووسراوەتـەوە، کاك بەختیـار عەلی «سـوپـاسێکی بێ پایانی ئاراستە دەکەم» کەوەری گێراوەتە سەر زمانی کوردی، وەلە ١٤/٤/١٩٩٢ وەك کۆڕێك لە هۆڵی نووسـەرانی سلێمـانی پێش کەش کرا، کۆڕەکـەشی لەلایەن کاك «شێرزاد حەسەن» بەڕێوەبرا.

«ستراغۆن و فلادیمیر».

چاوەڕوانی کۆلۆنیل، چاوەڕوانی شتێکە، یاخود هاتنی شتێکە تایبەتە بە خۆی، شتێکە بنەڕەتێکی شەرعی خۆی لە ڕابردووی کۆلۆنیلەوە وەردەگرێت.. چاوەڕوانیەکە لە بنەڕەت دا، لە زەمینەیەکی سایکۆلۆژی و سوسیۆلۆژی و ئابووری هەڵدەقوڵێت. بەڵام چاوەڕوانی غۆدۆ لەلایەن هەردوو کەسایەتیەکە لە بنەڕەت دا لە «هیچی یەکی گەورەو غەیبیانیەتێك کە جیهان بەسەر مرۆڤی دادەسەپێنێت، هەڵدەقوڵێت، واتە چاوەڕوانیەکی ئەنطولۆجی یە «ووجودیە» بەسەر مرۆڤێك داسەپێنراوە، مرۆڤێك هەموو شتێکی وون کردوە، هەرلەبەر ئەم هۆیەش، ڕووبەکاتە خەڵق کردنی ڕزگار کەرێکی خوایی غەیبیانی کەلەوانەیە هەرگیز بوونی نەبێت...

بەڵام خاڵی بەریەککەوتن هەیە لە نێوان هەردوو پرۆسی «چاوەڕوانیەکە» ئەویش «هیچی» یەك کە خەلاسێکی وەهمی دروست دەکات...

★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★ ★

## میحوەری یەکەم/ هیچی جیهان ناکردەیی کۆلۆنیل هیچی جیهان

### «لاشیئیة العالم» «لافعلیة الکولونیل»

نمایشی «الکولونیل» چاوەڕوانیەکی دوورو درێژی بێ ئەنجامی ماناکانە، هەرمانایەك بێت. یاخود گەڕانێکی وەستاوە لە دوای شتەکان، هەر شتێك بێت، ئەمەش لە دونیایەکی بێبەش لەماناداکە توانای نەماوە هیچ شتێك پێش کەش بە ئادەمیزاد بکات.بەڵکو دونیایەکە هێدی هێدی و بەکاوەخۆ مرۆڤ لە بەهاگشتی یەکانی ڕووت دەکاتەوەو لە هەموو ئەو شتانەی دادەبڕێنێ کە مرۆڤایەتی پێ دەبەخشێت. ئەم شانۆنامەیە چوونە ژوورەوەیەکی بێ هوودەیە بۆ چەندەها ناوچەی ئەوتۆ کە جگە لە چەندەها وەهمی سامناك و پڕمەترسی هیچی تری تیانیە، ئەو ناوچانەی جەبریەتی چاوەڕوانیەکی تایبەت دەخولقێنن بۆ دیداری فریادرەسێکی غەیبی و ڕزگار کەرێك کە هەرگیز بوونی نیە.. پانتاییە مەنگ و وەستاوەکانی ئەم نمایشە، بەسەر دوو قوتبی تراژیدی دابەش دەبن :

١ـ پەشێوی و ناڕێکی و شپرزەیی لە لایەك.

٢ـ دابەش بوونێکی کوشندەو بریندارکەر لە دونیای تایبەتی کۆلۆنیل دا، لە دونیای ئەوپەڕی پێویستی و ئەوپەڕی نەبوونی لەلایەکی تردا.

«هیچی» بونیادی سەرەکی ئەم جیهانەیە کەامناو چەند زنجیرەیەك هەرەس دا ڕوو دەچێت، وە هەرشتێکیش کەلەم دونیایەدا مابێتەوە ڕوو لە ڕزین و کاڵ بوونەوەو پوکانەوەیە.

«هیچی» دونیاش لەلای کۆلۆنیل حاڵەتێکی «چەق بەستن» و «نەگۆڕان» دەخولقێنێ کە دەشێت ناوی بنێین «ناکردەیی بەردەوام»

ماڵی کۆلۆنیل و هەرشتێك کە دەکەوێتە دەرەوەی لە حاڵەتێکی بۆشاییی و هیچی دا دەژین کە هەموو بوارەکانی زیندەگی مرۆڤی داگیر کردووە، نمایشەکە بەدیمەنێکی سەرەتایی لە دەرەوەی تەختەی شانۆ دەست پێدەکات. کاتێك کۆلۆنیل دێتە ناو دونیای تایبەتی بینەرانەوە ـ لەڕاستی دا دونیای بینەران لەم نمایشەدا لە کردەیەکی کارتێك کردنی حواریی بەردەوام دایە لەگەڵ ئاستە جیاواز جیاوازەکانی نمایشەکەدا ـ کۆلۆنیل ـ دێت و لایتێکی دەستی چکۆلانەی لە گەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، وەکو ئەوەی لەناو تاریکیەکەدا بەدوای شتێکی بزرکراودا بگەڕێت....

دەم و چاوەکان دەپشکنێ و زنجیرەیەك پرسیاری هێمتانە خڕی دەداتە ناوپانتایی بینەرەوە. وەهەردەم وەڵامەکانی دونیای بینەریش ـ ئەوە ئەگەر وەڵامێك هەبێت «نا» و «نیە» و «نەماوە»یە .ئەم هەموو وەڵامە نەفی و سەلبیانە سەرەتاو یەکەمین دۆزینەوەی دەرکەوتەی ئەو «هیچەیە» کە بەدرێژایی نمایشەکە بەردەوام دەبێت، دوای ئەم کردە پشکنینە سەرەتاییە «کۆلۆنیل دەچێتە ناو فەزای نمایشەکەوە کەماڵی خۆیەتی ئەو ماڵەی لە نێوان «نەبوونی هەموو شتەکان «لەلایەك وە «پێویست بوونی بە هەموو شتەکان» لەلایەکی دیکەدا بەتوندو تیژی دابەش بووە. ماڵێکە لەبری شت، تارمایی و سێبەری شتەکانی تیانیشتەجێ بووە بە هێمنی دادەڕمێت و ڕۆدەچێت، پڕە لەسەرە قوماشی پارچە پارچەو پەرش و بڵاو لێرەو لەوێ، هێڵەکانی ئەم دونیایە نارێك و تێك شکاون شپرزەیە لە ناوەڕاستا «قەرەوێڵەیەکی کۆن» هەیە کە پارچە گۆشتێکی نەخۆشی لەسەر گرمۆڵە بووە کە ژنی کۆلۆنیلە، لەلاوەش کورسیەکی لەرندەوە «هەزار» هەیە.

دابەش بوونی جوگرافی ئەم موفردە ئەکسسواریانە «نیشانەکان العلامات»، واتە بونیادی سینوگرافی نمایشەکە ـ لە بنەڕەت دا لە سەر «نائەندازەیی» یان «نەبوونی ڕێکی» و وونبوونی هەر شێوەیەك لە شێوەکانی ڕژێم ڕاگیراوە، نارێکی و شپرزەییەکی سەرتاسەرەی هەیە کەشتەکان و پەیوەندیە ئینسانیەکانیشی لە خۆگرتوە، بۆ نموونە دوو موفردەی سەرەکی لە نمایشەکەدا «کورسیەکە» و «قەرەوێڵەکە» بەشێوەیەك لەسەر تەختەی شانۆ دەبینرێن کە نیشانەی پەشێوی‌و ناتەبایی لە زمانی لەیەکدی گەیشتن دا لە نێوان کۆڵۆنیل و ژنەکەی پیشان دەدات بە جۆرێك دەبینین قەرەوێڵەکە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە پشت کورسیەکەوە، وەپشتی کورسیەکە ڕووی لە قەرەوێڵەکەیە. وە ئەم پەشێویی‌و ناتەباییە لە پەیوەندی لە یەکتری گەیشتن دا دەگاتە پلەی لێك دابرانی تەواو لە یەکدی حاڵی نەبوونی تەواوەت، هەروەك لە دیمەنی حیواری یەکەم دا دێتە بەرچاومان:ـ دەبینین جوولەکانی کۆڵۆنیل نارێك و نائاسایی‌یە وە خەیاڵ و قسەکانی جیاوازی هەیە لە گەڵ خەیاڵ و قسەکانی ژنەکەی‌دا وەبەیەك ئاراستە نارۆن. لەم دیمەنەدا «دیالۆگێك» نیە کە هەردوو کەسایەتیەکە بەیەکەو پێ‌ی هەستن، بەڵکو «مۆنۆلۆگێکی» درێژی تایبەت بە کۆڵۆنیل. هەیە کە جار ناجار ژنەکەی دەیپچڕێت و پەش بەشی دەکات وە کۆڵۆنیل، باسەکانی پچڕو پچڕو دوور لەیەکە (لەباسی گۆرەویەکانی بۆ باسی باو باران سەرمایی/ بۆ مەرگی زەلامێك/ بۆ ڕێگای گۆڕستان / بۆ پۆلیسەکە..هتد)

ئەم گرێ‌و کۆسپانەی لە پەیوەندیەکانی کۆڵۆنیل دا هەیە، وە ئەم شپرزەییەی لە هزری دا هەیە دەگەڕێتەوە بۆ داپچڕانی کۆڵۆنیل لە گەڵ «ئێستا» و «لەگەڵ دەوروبەردا»، تا ئەندازەی ئەوەی خۆی لەناو (یادەوەری ـ الذاکرە) ی خۆیدا شورابەندکردووە ئەم داپچڕانەش مانای ئەوەنی‌یەکە کۆڵۆنیل بە دونیای دەرەوە تێ‌ناگات، بەڵکو ڕاستی لە پێچەوانە کردنەوەو دژکردنەوەی ئەم قسەدایە، ئەو لە دونیا تێ دەگات بەڵام دونیا تێ‌ی ناگات و قبوڵی ناکات.. دوای قۆناغێکی بچکۆڵە لەم پەشێویی‌و شپرزەییەی دونیاو زیندەگی خێزانیانە، کۆڵۆنیل دەکەوێتە پشکنینی ماڵەکەی وەکو ئەوەی گەشتە پووچەکەی ناو جیهانی بینەر کەلە سەرەتای نومایشەکە دەستی پێ کردبوو، تەواوی بکات بۆ ئەوەی بگاتە ئەو ڕاستی‌یەی کە هیچ شتێك نەماوە پێ‌ی بژین.

«هیچمان نەماوە»، ئەوە ئەو ڕستە ترسناکەیە کە کۆڵۆنیل دەیدرکێنێ لە ڕێگای ئەو ڕستەیەوە بانگەشەی چوونە ناو مەرگێکی لەسەرخۆ ڕادەگەیەنێت، مەرگێك کە لە مێژە چاوەڕوانێتی. ماڵی کۆڵۆنیل بیابانێکەو یەك لە دوای یەك هەرەسی پەیتا پەیتا دایگرتۆتەوە، بۆ دەڵێین یاسای سەرەکی ناو ئاستە جیاوازەکانی ئەم نمایشە لە «نەبوون» یاخود «لەدەست دان» ـ الفقدان ـ کورت دەکرێتەوە.

بینەران «هیچیان نەماوە» کۆڵۆنیل و دونیای کۆڵۆنیل هیچی تیا نەماوە، وە دونیا گەورەکەی دەرەوەی ماڵی کۆڵۆنیلیش هیچی تیا نەماوە. ماڵەکەی شیرازەی خانەوادەگی خۆی لە دەست داوە ئاسایش بەرقەراری‌و پتەوی بونیادی خۆی دۆڕاندوە، وە سادەترین پێویستیەکانی ژیانی «خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ» تیانیە. وەخودی کۆڵۆنیلیش پێش هەموو شتێك لەماناو جەوهەری ڕووت کراوەتەوە «کۆڵۆنیل» کۆڵۆنیل پیاوێکی بێ‌مانانیە، بەڵکو لە جەوهەریان دابڕیوە کە ڕابردوە پڕ لە قارەمانێتی‌و شکۆمەندیەتی ئەو ناتوانێت لە تەك ئێستایەکدا بژی کە هیچ مانایەکی نیە: بەبێ گەڕانەوەی هەمیشەیی بۆ ئەو «مێژوو»ەی هەر ئەوانە لێیان سەندۆتەوەو لێیان زەوت کردوە کە کۆڵۆنیل بەرگری لێکردووەن و قوربانی بۆ داون. بۆیە لێرەوە کۆڵۆنیل لە دەرەوە ڕا لە مانا بێ بەشکراوەو لە«مێژوو» و (ڕابردوو)ی خۆی ڕووتکراوەتەوە بەکەنارخستن و لاچەپ دانانی کۆڵۆنیل لە گۆشەیەکی سارداو بەجێ هێشتنی بۆ مەرگێکی لە سەر خۆ بێ ئەوەی کەس ئەو مێژووەی بە یادابێتەوە یاخود ئەو شتەی کە مێژووە پڕ لە ئازایەتیەکی بیر دەهێنێتەوە، بۆ نانێرن (نامەکە) چونکە لە ڕاستی‌دا ئەو نامەیە«کە مووچەکە دەهێنێ» بەرجەستە بوونی ئەو مێژووەیە هەر ئەوەشە کە چاوەڕوانیەکی کوشندەی سەپاندۆتە سەر کۆڵۆنیل، (١٥) ساڵ چاوەنواری. بەڵام باکەمێك لای ڕەگەزی «نامەکە» بوەستین چونکە نامەکە وەکو ڕەمزێکی سەرەکی دەشێت ببێتە مایەی دروستکردنی چەند لێکدانەوەیەکی وەهمی یاخود خولقاندنی «وەهمی تۆژینەوە ساز» ـ الایهام التفسیری ـ واتە بە هۆی ئەوەی نامەکە گەلێك ڕووبەری بەربڵاوی هەیە،

ئەمەش یاریدەی سەرهەڵدانی گەڵێك بۆچوونی سادەو كالفامانە دەدات سەبارەت بەماناكانی نمایشەكەو شوێنی نامەكە لە نمایشەكەدا، وەكو نامەكە لەتەك خۆیدا پارە دەهێنێت كە یارمەتی كۆلۆنیل دەدات بۆ ژیان ، بەڵام نامەكە بریتی‌نی‌یە لە پارە بەڵكو (مێژووی) كۆلۆنیلەو هەموو رابردویەتی، رەمزی ئەو هەوڵدانە بێ ووچانەی كۆلۆنیلە كەوا لە دونیا بكات دان بەو رابوردوە پرشكۆیەدا بنێت وە نەهاتنی نامەكە رووت كردنەوەی كۆلۆنیلە لە هەمووشتەكان، واتە پرۆسەی چاوەروان كردن = پرۆسەی رووت كردنەوەی كۆلۆنیل لە ژیان ـ مێژوو ـ رابردوو».

بەڵام كۆلۆنیل تەنها رەگە رابردوەیەكانی خۆی لەدەست نەداوە، بەڵكو لە داهاتووشی پچرینراوە، بەردەوامی نیە، بەرەو پاشە رۆژە درێژ كراوەكەی كوژراوە، ئەگەر پێی كۆلۆنیل بۆ پاشە رۆژ كورەكەی بێت ئەو كورەكەی لە مەیدانی شەرە كەلەشێردا كوژراوە.

لێرەوە كۆلۆنیل هەردوو دیوی زەمەنی لە دەست داوە، چ رابردوو چ داهاتوو. بەم شێوەیە دەكەوێتە نێو زەمەنێكی دبكەوە، زەمێكی جیاوازو تایبەت، كە زەمەنی چاوەروانی بەردەوام و نەگۆرە. لە گەڵ ئەمەش دا كۆلۆنیل دەست بەرداری رابردووی نی‌یە، ئەمەش بەدروست كردنی دابرانێكی گەورە لە گەڵ ئێستاداو هەوڵدانی هەمیشەیی بۆنیشتەجێ كردنی رابردوو و جیهانەكانی لە نێو تۆی لۆچەكانی (ئێستا) دا هەر هەر بۆیە تەنها كارێك كە دەتوانرێت پێی هەستێت یادكردنەوەو تەداعی كردنە.

لە ناو ئەو یادەوە ریە كۆن و زەنگاویانەی خۆیا پێچی خواردوە. بەمجۆرە كۆلۆنیل دەبێتە یادەوەر(ذاكرة)ی (رابردوو) خۆیو دەكەویتە وەهمی كوژراو لەچركەی كوشتنی كورەكەی. وەهەر لەم خاڵەشدا كۆلۆنیل بە بەردەوامی تراژیدیاری خۆی دەژیت.

دنیای دەرەوەش لەحاڵەتی لە دەست دان و نەبوونیەكی سەرتا پاگیری ترسناكدایە. دونیای دەرەوە تەواو لەوقوتوە بەتاڵە دەكات كە كۆلۆنێل بەرزی دەكاتەوە وتێی دەروانێت، دەبینی خاڵیە لە هەموو شتێك، یاخود راست تر خاڵی كراوە. دنیایەكە لە هەموو بەهایەكی خرۆقانەی گشتی رووت كراوەتەوە...

بەم شێوەیە هەموو ئاستەكان لە «هیچی» یەكی سامناك خۆیان دەنوێنن: «دونیای بینەران هیچی تیا نەماوە/ ماڵی كۆلۆنیل هیچی تیا نەماوە/ پۆستە هیچی تیانی‌یە/ پارێزە هیچی نوێی پێ نیە بۆ كۆلۆنیل/ رۆژنامەكان هیچیان تیانیە...هتد...»

كەواتە هەر یەكێك لە دوو جەمسەری تراژیدیایە كە دەبنەوە بە بەرهەم هێنی یەكدی- ناكردەی كۆلۆنیل لە هیچی دونیاوە هاتووە، كۆلۆنیل ناتوانێت هیچ بكات لەبەر ئەوەی لەراستی‌دا هیچ شتێك نیە بیكات. وەترسناكترین و پرمەترسیترین شتێك روو بەرووی كۆلۆنیل دەبێتەوە، ئەو هەوڵە بێ ئەنجام وبێ هودە گەریانەیەتی بۆ دروست كردنی شتێك لەو هیچی‌یە گەورەیە.

لای كۆلۆنیل بە ئاشكرا هەوڵدانی بزواندن و خولقاندنی ووزایەتی كاركردن دەبینین . یان بە ئاشكرا دەبینین ئارەزووی ئەنجام دانی كارێكی هەیە، ئیدی ئەوكارە هەر چۆنێك بێت یان كاریگەری چۆن بێت و گۆرینی بۆ شتەكان چۆن بێت، لێرەوە دەبینین چەند بریارێك دەدات كە راستەوخۆ دوای بریار دانەكە لێی پەشیمان دەبێتەوە، سێ ساتەوە ختی بریاری بنەرەتی لە نمایشەكەدا هەیە:

١ـ بریاردانی فرۆشتنی كەلە شێرەكە.

٢ـ بریاردانی دیدەنی هاورێكانی كورەكەی

٣ـ بریاردانی نووسینی نامەیەكی شكات.

بێ گومان هیچ یەك لەم بریارانە جێ بە جێ ناكرێت، وەپشت هەڵكردنی كۆلۆنیل لە جێ بە جێ كردنیان گەلێك هۆی هەیە، لەوانە گرنگ ترینیان ئەوەیە كە كۆلۆنیل پێشتر دەزانێت جێ بە جێ كردنی ئەو بریارانەشی هیچ ئەوسسێو سەقامگیریەی ژیانی تێك ناشكێنێت، وە لەپاڵئەمانەشدا كەرامەتی رێگای لێ دەگرێت، واتە ترسی لەوەی دەرەوەتانەی هەژاریو دەست كورتی بدەنەپاڵی، رێگای ئەوەی لێ دەگرێت ئەم هەنگاوانە ئەنجام بدات. وە لەنمایشەكەدا گەلێك ئاستی دیكە هەیە كە ئامـاژەیەكی راستەوخۆ دەكەن بۆ مەسەلەی «كەرامەت» بۆ نموونە « كاتێك دەیەوێت كاتژمێرەكە بفرۆشێت و سەرتاشەكە رێگای پێ نادات/ كاتێك ژنەكەی دەیەوێت ئەڵقەی دەستگیرانێیان بفرۆشن» .. هتد.

لە كۆتایی دەتوانین بڵێین كە تەوەری یەكەم/ هیچی ناكردەیی/ ئەم هاوكێشەیەكورتی دەكاتەوە:

هیچی جیهان (هیچی زیندەگی خانەوا دەگی /ماڵ/و هیچی

جیهانی دەرەوە) چاوەڕوانی بێ هوودە = ناکردەیی کۆلۆنیل و چەق بەستنی لە ناوچەیەکی زەمەنی نەگۆڕ + پڕوسی ڕووتکردنەوەی لە هەموو شتەکان.

میحوەری دووەم/ نمایش لە نێوان (ناوەوە/دەرەوە)دا.

سەرەتاوە بۆ ئەوەی تووشی هیچ جۆرە لەیەک حاڵی نەبوونێک نەبین، پێویستە هەردوو چەمکی ناوەوەو دەرەوە بەووردی دەست نیشان بکەین: ئەو (ناوەوە)ی کە ئێمە ڕووی تێ دەکەین بریتیە لە ڕووبەرە ناوەکیو زاتیەکانی دونیای کۆلۆنیل، ئەمیش دەبێت بە دووبەشەوە

١) ماڵەوە/ هەموو ئەو شتانەی دەکەوێتەوە ناو جوگرافیا ئەرزۆکەکەیەوە

٢) کۆلۆنیل/ جیهانی دەروونیو زاتی.

بەلام (دەرەوە)سنووری بێ کۆتاییە، وە هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە دەرەوەی (ناوەوە).

لێرەدا دەمانەوێت خوێندنەوەیەکی شیکاریانە بکەین بۆ چەمکەکانی ئەو پەیوەندیەی کە (ناوەوە/ دەرەوە) بەیەکەوە گرێ دەدات، تابگەینە ئاستی گرتنی بونیادە شاردراوەکەی ئەو پەیوەندییە.

سەرەتا لە (ماڵەوە) دەست پێ دەکەین کە دالێکی هێمایییە دالترمیزی) دەلالەتە سەرەکییەکانی لە خودی خۆیەوە وەرناگرێت. بەڵکو لە دونیای دەرەوە وەری دەگرێت. هەر شتێک لەناوەوە ڕوودەدات ڕەنگدانەوەی ئەو شتانەیە کە لە دەرەوە ڕوو دەدات...شپرزەییو نارێکی ماڵەوە، ڕەنگدانەوەی شپرزەیی وتێکچوونی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکانی دەرەوەو نارێکی شتەکانە (لانظامیة الاشیاء) وەبۆسەلماندنی ئەم گریمانەیە، لە خوێندنەوەی رەگەزە پێکهێنە- بینراوەکانی فەزای نمایشەکەوە دەڕوانین. (نیشانەکان - العلامات) کەرەستەی سەرەکی لە نومایشەکەدا کە بۆپڕکردنەوەی زەمینەی شانۆ/ ماڵ/ کە بەکارهاتووە، ئەو پارچە قوماشە دراوانەیە کە بە شێوەیەکی تەواو بەسەر هەموو سووچ و کونج و کەلەبەری شانۆکەدا بلاوکراوەتەوە، ئەمەش دەلالاتی ڕوون و ئاشکرای خۆی هەیە. قوماش وەك کەرستەیەکی سەرەکی بەکارهاتووە بۆ پێکهێنانی رەگەزی رەمزی سەرەکی لەنمایشەکەدا دەلالاتەکانیشی توانای کشانیان بۆ ناو هەموو نمایشەکەوە هەیە قوماش مادەیەکی نەرمە کە دەبێت بە ئاسانی بدرێو پارچە پارچە بکرێت، دەتوانیت فرە ڕەنگ و شێوە وەرگرێت لەبەر ئەوەی قوماشی ڕژێمی شێوەو فۆرمێکی جێگیرو دیاری کراوی نیە،وە قوماشەکان هەمووی لەتەنها ڕەنگێك نین، بەڵکو لە کۆمەڵێك ڕەنگی جۆراو جۆرن، بەیەکدا چوون، پەرش و بلاون، ئەمەش ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆیە بۆ ئەو جیهانە پارچە پارچەو پەلەپەلەی کۆلۆنیل تیا دەژی. بونیادەکانی ئەم جیهانە لەرزۆك و جێنەگیرن هەروەها شیاوی ڕماندنێکی خێران: بونیادە ئەخلاقیو کۆمەلایەتیو ئابووری و سیاسی، هەمووی قابیلی هەرەسن. وە لە نمایشەکەدا جوولەیەکی نواندنی تەشخیص (حرکة تمثیلیة شخصیة)، لەلایەن کۆلۆنیلەوە هەیە. بە ئاشکرا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئەو کۆمەڵە قوماشە کە لەناو فەوزای ڕەنگ و نارێکیدا دەژی، هەمان ئەو نیشتمانەیەکە بەرگری لێ کردووەو لە پێناوی خەباتی کردووە.

ئەمەش لە دیمەنیکۆلۆنیل/ پارێزەرداله تەنیشت دۆلابە ئاسنەکەوە ئەو دۆلابەش کە خۆی لە خۆیدا شێوەی خۆی لە دەست داوە لەناو فەوزای دۆسیەو کاغەزی کۆن دا دەژی.

بەلام ئەم سپرزەییو نارێکیەی فەزای نمایشەکە تەنیا ئاماژە نییە. بۆ نارێکی دنیای دەرەوە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ دنیای دەروونی کۆلونێلش، کە پارچە پارچە بوون و لەدەست دان و نەبوونیو شلەژانی دەروونیو تێك چوونی پەیوەندییە بە مێژوو (و) ئێستاوە تەوەرە سەرەکییەکانێتی. واتە بەگشتی کۆمەڵێك نیشانەو ئاماژە هەیە لە سنووری بەرتەسکی دەلالیانەی خۆی، سنووری ماڵەکە، دەیەوێ دەربازبێت، بەرەو خولقاندنی ڕوو بەری تەئویلیو دەلالی گەورەتر لە دەرەوە.

هەرەسی بەکاوە خۆی ماڵەکەی کۆلۆنیل، لە بنەڕەت دا هەرەسێکی نەبینراوی هەموو بنەچە ئەخلاقیەکانە کە نیشتمان و کۆمەلی لە سەر بونیاد نراوە، ساتەکانی کەوتنی کۆلۆنیل و ژنەکەی/ مەرگی لە سەر خۆ/پیری/چاوەڕوانی بێ هودە/ پەشێوی...هتد.

هەموو کۆمەڵێك دالن کەماناو دەلالا تەکانیان لە دونیای دەرەوە دایە، دونیایەك ڕووی لە خەرمندو نغرۆ بوونە...

هەرکەوتنێکی جەستەییو هەرەس هێنانی لە سەر تەختەی

شانـۆ نیشـانەی کەوتنی،ئەخلاقیانەی دەرەوەیە. ئەم کەوتنە ئەخلاقیە لە بایەخ پێ نەدانی دونیای دەرەوە بە کۆلۆنێل خۆی دەبیـنێتـەوە. هەمـووکـەس دەستی لە کۆلۆنێـل بەرداوە «هاورێکانی کورەکەی/ حکومەت /نیشتمان / کۆمەڵ...»
بەلاّم هەلّوێستی جیهـان و دونیـا تەنیـا لە ئاستی دەست بەرداری‌و بایـەخ پێ نەدانـەوە نەوەستـاوە، بەلّکو گەیشتۆتە ئاستی لاقرتی‌و گالّتە جاری کردن «وەکو گالّتە جاری پۆستەچی بە کۆلۆنێـل»یان بریندار کردنی کەرامەتی‌و پیا هەلّشاخانی، بەلّکـو نیشتمـان بوو درێـژ کەرەوەکەی (کورەکەی) کۆلۆنێلی کوشت و بەمـە وەچـاخی کوێـرکرد. لێرەوە دەشێت بلّێین کە بونیـادی پەیـوەنـدی لە نێـوان (مالّ/ جیهان)دا « بونیادی مالّەوە/بـونیـادی جیهـان» بونیـادێکی پەرچەییە، لێرەوە،مالّ هەندێك جار دەبێتە جیهانو دەوری جیهان دەبینێ.تا ئەندازەی ئەوەی هەنـدیـك جار / مالّ/ تەواو دەچێتە پێستی جیهانی دەرەوە واتـە (تقمص)ی دەکـات، لەسـەر رۆشنایی ئەمەش دەتـوانین بلّێین پەیوەندی نێوان مالّ/ جیهان پەیوەندی‌یەکی ئاوێنەیی‌یەو زۆر جار مالّ وەك ئاوێنەیەك دونیای دەرەوە نیشاندەدات.

ئێستا دەگوازینەوە سەر پشکنینی هەندێك ئاستی تایبەت لە پەیوەندی نێوان (کۆلۆنێل ـ و ـ جیهان)دا.

لەوەو پێش ئاماژەم بۆ بوونی جۆرێك لە لێك دابران کرد لە نێوان /کۆلۆنێل/ و دەرەوەدا، کاتێك ئاماژەم بۆ ئەوەی کرد کە کۆلۆنێل خۆی بە یادەوەریەکانی خۆی شورا بەند کردووە، بەلاّم کۆلۆنێل کاتێ خۆی بەیادگارەکانی ئابلوقە داوە،ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە خالی بەریەك کەوتن نیە لە نێوان جیهانی کۆلۆنێل و دەرەوەدا.

چونکـە کۆلۆنێـل لە جەوهـەری بەرامبـەرەکـەی/ دەرەوەتی گەیشتوەکە بریتی‌یە لە هیچی‌یەك هەموو شتەکان هەلّدەلوشێ، وەکـاتێـك لە کۆتـایی شانـۆگـەریەکەیدا هاوار دەکات « گوو دەخوێن»!! ئەوە رادەگەیەنێت کە ئەم جیهانە پیسی‌و پاشەڕۆ حوکمی دەکات، کەواتە لێك دابرانێکی یەك لایەن هەیە یاخود راستتـر بابلێن حالّی نەبـوونێکی کوشنـدە «عدم فهم عنیف» لەلایەن دونیاوە بەرامبەر بە کۆلۆنێل هەیە. لێرەدا هەوڵ دەدەین بچینە ناو ئەو ناوچە دیمەنانیەی کە پرۆسی (لێك دابران / حالّی نەبوون)ی تیا بەرجەستە دەبێت.وە زیاترپشت بە خوێندنەوەی ئەو حالّەتـە دەبـەستـین لە چۆنیـەتی بەر جەستـە بوونی‌دا لەتەکنیکی نواندنی ناو نمایشەکەدا. لە زۆر لە شانۆگەریەکان داڕوودەدات کە یەك ئەکتەر لەیەك کات دا دوو کارکتەر نمایش بکات ،دوو کارکتەری پێچەوانەی یان دژ بەیەك لە فەزای یەك دیمـەن دا «ئەمە زۆر جار لە مۆنۆدراماو ئەونمایشانەدا دێتە پێش چاو کە بونیادیان مەحکومە بەگێرانەوەی حیکایەت ـ ئامێز (السردیـة الحکـائیـة)وە ئەکتـەر بۆ ئەوەی ئەوە بکات چەند کەرەستەیەکی ئەکسسواری جیاواز بەکار دەهێنێ‌و سروشتی ئیلقـاکردنی دەگۆڕێت. واتە بۆ ئەوەی پرۆسسی گواستنەوەی نواندنی لە نێوان هەردوو کەسایەتیەکە دیار بێت، ئەکتەر کە سەریـەکی بینـراوی تایبـەت هەلّدەگـرێت وەکو شەبقەیەك/ گۆچانێك/ پارچەیەك جل/ چاویلکەیەك .. هتد و دەنگی خۆی دەگـوڕێت تا سەربـەخـۆیی کە سێتیـەکـەلە کەسـایـەتی‌یە سەرەکی‌یـەکەی نمایشەکە جیا بکاتەوە، لەم نمایشەدا ئەگەر چی ئالّو گۆڕێکی زۆر هەبـوو لە ئاستی نمـایش کردنی زیاد لەکـارکتـەری ، ئەوا پروسی گواستنـەوەی نواندنی (الأنتقال التمثلي) لە نێوان کەسایەتی کۆلۆنێل و کەسایەتیەکانی تر بە خستنـە گەڕی دۆخـە دەرونیەکان و نیشاندانی هەلّچوون و داچـوونی کارکتەرەکان بەرچەستە کرابوو.. بۆ نموونە ئەگەر بڕوانینـە دیمـەنی «پـارێـزەر/ کۆلۆنێل» دەبینین کە ابراهیم چێواری ئەکتەرکە لە نواندنی کۆلۆنێلەوە دەچێتەسەر نواندنی کارکتەری پارێزەر تەمسیل ناکات بەقەدەر ئەوەی دەیەوێت ئەم کارەکتـەرە لە ڕووی سایکـۆلۆژیـەوە بەرجـەستە بکات، واتە دەیەوێت ئەوە پیشانی بینەران بدات کە ئەم پارێزەرە بە هیچ شێوەیەك هەست بە کێشەکەی کۆلۆنێل ناکات و بە هیچ جۆرێك لە گەل مەسەلەکەی داناژی بەلّکو هەر باکیشی پێ نیە. بەوەی کە زۆر خۆی ئارام نیشـان دەدات و هەلّچـوونـەکـان سارد دەکـاتـەوە، یا با بلّێـین دەمـار ساردیـەکی تەواو دەنـوێنێ‌و بەسـاردی‌و کەمتـەرخـەمی‌یەکەوە رستەکان لەزاری دەکەونە خوارێ، وە پەیـوەنـدی بە (مـێش کوژەکـەی) دەسـتـی پەیـوەنـدیەکی ساردەو تورەیی‌و هەلّچوونی پێوە دیار نی‌یە.. پارێزەرەکە کاتێك قسە لەگەڵ کۆلۆنێل دا دەکات کە خەریکی مێش کوشتنەو بە هیچ شێوەیەك لە ڕێگای بینینەوە پەیوەندییەك لەگـەڵ کۆلۆنێل دا نابەستێت، سەیری کۆلۆنێل ناکات، بەلّکو

بەدوای مێش دا دەگەڕێت بیکوژێت. لاسایی کردنەوەی چێوار) بۆ ئەم پارێزەرەلە ڕاستیدا دەرخستنی سیفەتی سەرەکی‌یەتی کە ساردو سڕی‌و بێ بایەخی پارێزەرەکەیە بەرامبەر کێشەکەی کۆلۆنیل بەلام کە دەگەڕێینەوە بۆ نواندنی کەسایەتی کۆلۆنیل (ابراهیم چێوار) دووبارە پەشێویی‌و شپرزەیی دەروونی پێوە دیارەو هەڵچوونە توندەکانی سەر هەڵچوونە توندەکانی سەر هەڵدەداتەوە بێ هوودەو بێ‌پشوو هاوارەکانی سەر هەڵدەداتەوە بەرز دەبێتەوە. ئەمەش لە ڕێگای بەکارهێنانی هەمان ئەو کەرەستەیەی کە لە کاتی نواندنی پارێزەرەکەدا بەکاری دەهێنا بەلام پەیوەندی نێوان کۆلۆنیل و مێش کوژەکە تەواو جیاوازە لە پەیوەندی نێوان پارێزەرەکەو مێش کوژەکە بەکارهێنانی کۆلۆنیل تەواو پەشۆکان و هەڵچوونی دەروونی پێوە دیارە، کۆلۆنیل زۆربە تورەیی‌و دڵ ڕەقی‌یەوە وەکو دارێک مێش کوژەکە بەکار دەهێنێ بۆ لێدانی شتەکانی چواردەوری « لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەم ـ علامە ـ یە دەلالەت و وەزیفەیەکی نوێ وەردەگرێت، ئەمەش لەڕێگای بەکارهێنانی تەمسیلی لێرەدامێش کوژەکە دەبێتە (دار) و بەهۆیەوە کۆلۆنیل (لێدانێکی وەهمی) بۆ پارێزەرەکە ساز دەکات .

وەمیرازێکی خەیاڵی پارێزەرەکە میراز بکات ، ئەمەش بۆ خۆی پرۆسەی تۆڵەیەکی وەهمی‌یە دەروونی پاکژ دەکاتەوە لەو تورەییەی بەرامبەر ئەوانەی چەندەها ساڵ بەرگری لێ کردن.

وەلەدیمەنی پۆستەچی‌یەکەشدا کۆلۆنیل لە ڕێگای لاسایی کردنەوەی ئەو کەسایەتی‌یەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەو پۆستەچی‌یە چەند لاقرتی بە کۆلۆنیل دێت کە چەندەها ساڵە چاوەڕوانی نامەیەکەو هەرگیز ناگات . لە بواری خوێندنەوەیەکی دەروونی بۆ هەموو کەسە جیاجیاکانی دونیای دەرەوە کە کۆلۆنیل لاسایی‌یان دەکاتەوە، دەتوانین بەئاشکرا هەست بە بەو ڕاستی‌یە بکەین کە دونیای دەرەوە تەواو لە کۆلۆنیل دابراوە یاخود بە هیچ جۆرێك تێی ناگات وە دونیا کەسایەتی‌یەکی وەکو کۆلۆنیلی پێی قووت ناچێت، ئەم تێ نەگەیشتنە لەلای زەرنگەرەکە دەگاتە ئەوپەڕی کە بۆخۆی پارە دارێکە هەر ئێستا تێری خواردن و خواردنەوە بووەو ددانی پاك دەکاتەوە، قبولی ئەوە ناکات ئەلقەی دەستگیرانەکەی لە ژنەکەی کۆلۆنیل بکرێت کە لە برسا دەیفرۆشێ!

بەمجۆرە پرسیاری هەرەگەورەی کۆلۆنیل بەرووی دونیادا ئەوەیە «ئاخو هیچ شتێك هەیە ؟» کە بێ گومان پرسیارێکی گەڵیك هێمن بەلام توندو تیژو دڵ ڕەقانەیەو لەڕوانگەی چاوەڕوانی یەکی سەقامگیرو ترسناکەوە هەڵقوڵاوە، بەم پێیەو لە ناو هەمان پەیوەندی داو لەسەر چاوەی هەمان هاوکێشەوە دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە هەردوو لایەنەکە چ جیهانی دەرەوە؟ چ کۆلۆنیل کەوتونەتە ناو بازنەی وەهمەوە، بەلام ئەو وەهمەی کۆلۆنیل تیا دەژی ئێجگار جیاوازە لەو وەهمەی دونیا تیا دەژی.

ئەو کەرستانەی کە پرۆسسی وەهمکردنی (دەرەوە)یان پێ دەکرێت کەرستەی سیاسین «دروست کردنی بەرلەمان / هەڵبژاردن...هتد» ئەمانە ڕستێك وەهمی سیاسین و کۆمەڵ گیرۆدەیان دەبێت کاتێك بیر لە بەختیاری پاشە ڕۆژی خۆی دەکاتەوە، بەلام کۆلۆنیل لەوانەیە تاکە کەسێك بێت کە گاڵتە بەم وەهمە دەکات و ناکەوێتە داوی‌یەوە.

هەروەها گاڵتە بەم هەموو چارەسەریانە دەکات. بەلام کۆلۆنیل وەهمی تایبەتی خۆی هەیە، کە لەسەر خەیاڵە نەخۆشەکانی خۆی دەربارەی دوا ڕۆژ بونیادی ناوە....وە دوو گەورەترین بابەتی وەهمەکانی کۆلۆنیل «نامەکەو کە لە شێرەکەیە»،(١٥) ساڵ چاوەنواری ئەو نامەیە وەدواجاریش ئەو کەلەشێرە ـ کەهێمایەکی وەستاوە (رمز جامد) بەدرێژایی نمایشەکە ـ کۆلۆنیل بەتامایە بیفرۆشێ‌و پێی بژی. «کەلەشێرەکە» کە ڕەستەیەکی وەهم سازی سەرەکیە لە خۆلقاندنی خەیاڵەکانی کۆلۆنیل و لە ئازاردانیشی یدا. بەرلەوەی بگەینە سەر دوا دیمەن، پێویستە کەمێك لەسەر ڕەگەزی « جلوبەرگ » وهەموو ئاستەدە لالیەکانی بوەستین. ڕەنگە جل وبەرگ یەکێك بێت لەو نیشانانەی کە دەتوانین زیاد لە زانیاریەکمان سەبارەت بەئاستە جیا جیاکانی نومایشەکە نیشان بدات و یەکێك بێت لەو ڕەگەزانە، کە توانای خەلق کردنی حاڵەتێکی کارلێك کردنی تەواوی لەگەڵ سەرجەم ڕەگەزەکانی‌تری نمایش هەیە. لەم نمایشەدا جلەکانی «کۆلۆنیل» دوو ئاستی جیاوازیان هەڵگرتوە:ـ

١ـ ئاستی ڕووکەشی: کە تەعبیر لە شێوەی دەرەوەی دونیاو شێوەی دەرەوەی کۆلۆنیلیش دەکات، لە سەرەتای نمایشەکەدا

دەبینن کۆلۆنیل لە دەرەوەی گەراوەتەوە لە دەستێك جل وبەرگی لایەق و گونجاو دایە «پاڵتۆو پانتۆڵ» ئەمەش خۆی رەنگدانەوەی هەوڵدانەکان کۆلۆنیلە کە خۆی لای دەرەوە، وانیشان بدات کە پیاوێکە تەواو خۆی گرتوەو، رێك و پێکە وپێویستی بە هیچ شتێك نیە، ئەمەش ئەو درۆیەیە کە کۆلۆنیل لە گەڵ دونیادا دەیکات، کورتەی قسە ئەو سیمایەیە کە کۆلۆنیل لە دەرەوە دەری دەخات. لەلایەکی ترەوەش ئەمە هەمان ئاستی دەرەکی دونیای دەرەوەیە. واتە هەمان رێك و پێکیو گونجانەیە کە دونیای دەرەوەش بە پێچەوانەی جەوهەری خۆی لە رووکەشی خۆیدا هەڵیگرتوە. «کەواتە ئاستییەکەم ئەو درۆ رووکەشییە کە کۆلۆنیل ودونیا تیا بەشدارن.»

٢ـ ئاستی قووڵ و نادیار/ ئەم ئاستەیان تەعبیر لە بو نیادی شاراوەی کۆلۆنیل و دونیاش دەکات، واتە ئەو یاسا سەرەکیانە ئاشکرا دەکات کە بونیادە قوڵەکانی دونیایە حوکم دەکات و جیهانە دەروونیو ناوەکییەکانی کۆلۆنیلیشی جلەو کردووە، لەدوای گۆرین و فرێدانی جلی یەکەمەوە، کە کۆلۆنیل بۆ دەرەوە لە بەری دەکرد، ئەوا لە سەرجەمی دیمەنەکانی دیکە داوەلەدوا دیمەنیشدا بەجلێك یاخود راستتر بە سیپاڵە شرێکی کۆن و دراوو پینەکراوەوە، دەر دەکەوێت کە حەقیقەتی کۆلۆنیل و دەروونە پەشێوەکەیو نەداری کۆلۆنیلمان پێ رادەگەیەنێت. وەجلە پینە کراوەکانی رەنگدانەوەی دەروونێکی پینە کراوو ژیانێکی پینەکراوە، لەلایەکی دیکەوە کۆلۆنیل لەو جلانەیدا حەقیقەتی دونیاشی لەبەر کردووە. حەقیقەتی بونیادی جیهان و جەوهەرەکەیمان لەوجلانەی خۆیدا نیشان دەداتەوە. کە جیهانێکە پارچە پارچەو هەلاهەلایەو بەرەو هەرەسێکی گەورە هەنگاو دەنێت. واتە «کۆلۆنیل» لەلەسیپاڵە شرەکەیدا= جەهەری جیهان و حەقیقەتی بونیادەکەی،

لێرەدا دەتوانین ئەم ئاستە ناوبنێین/ حەقیقەتی جەوهەری شاردراوە. دواجار، دوا دیمەن پرۆسەی خۆ فەزح کردنە، یاخود، خۆ کوشتنێکی تورە، یاخود یاخی بوونێکی سەرتاسەری. ئەم دیمەنە لە هەموو دیمەنەکانی تر، توانای زیاترە لە دروست کردنی چەند پرسیارێك و چەند خوێندنەوەیەکی تەئویلی جیاواز، وەئەم پانتاییە پرلەپرسیار کراوانە، لە پرۆسسی کارلێك کردنی دیالەکێکیانەی بەردەوامی نێوان هەموو رەگەزە پێکهێنەرەکانی سینوگرافیای دیمەنەکە، لەدایك دەبێت و سەرهەڵدات. واتە لەرێگای «پەیوەندی نیشانەکانەوە ـ علائق العلامات ـ» لەم دیمەنەدا کۆمەڵێك جولەی تایبەت دەبینین کە ژمارەیەکی زۆر دەلالەتمان بۆ بەرهەم دەهێنن: «گۆرینی ئاراستەی چراکە لەناوەوە بۆ دەرەوە / هاوارە ترسناکەپرسیاریەکەی/ خۆ رووتکردنە (التعری)/ قسەکردن لەگەڵ بینەران دا/ئەو چوونە دەرەوە سەیرو ئاڵۆزەی بۆ دەرەوە/شێوەی نواندن...هتد.»

ئەم ئاماژانە توانیویەتی ئاسۆیەکی تەئویلی کراوە فرەئاست بکاتەوە. واتە بەرهەم هێنانی چەند خوێندنەوەیەکی جۆراوجۆر کە لەبینەرێکەوە تابینەرێکی ترمانای جیاواز دروست دەکات.

پرسیاری کۆلۆنیل دەربارەی بوونی شت «چی بخوێنین»وە کردەو رووتکردنەوە سەیرەکەی، پاشان هەڵهاتنی بەم شێوەیە بەرەو دەرەوە، ئەمانە بونیادی کردەیەکی نەبینراوی دیکەیە کە ترسناکترو ئاڵۆزترە لەوەی کە دەبینرێ ودەردەکەوێت، ئەمیش هەوڵدانی کۆلۆنیلە بۆ ئەوەی جیهان لە خۆی دا بکەنێت یاخود خۆی لە جیهان رزگار بکات و لە خودی خۆشی دەربازبێت، چوونە دەرەوەیە بۆ فەزح کردنی حەقیقەتە ترسناکەکەی، هەروەها رووبەروو بوونەوە لەگەڵ حەقیقەتی جیهان خۆ فەزح کردنی خۆی فەزح کردنی جیهان بۆ ئابروو بردنی هەموو دونیا، ئەمە چگە لەوەی کە جۆرە خۆ کو شتنێکە لە تورەیی ونارازی بوونەوە هاتوو «داکەندنی-جلەکانی لە کەژێك دا کە برسی وسەرمایەتی حوکمی دەکات، ئەمە خۆکوشتنە!» تورەبوون بەرامبەر دونیایەك کە شلەژان و نارێکییەك جلەوی دەکەن و کێشی دەکەنە ناو «هیچییەکی موتڵەقەوە» تورەبوون بەرامبەر کەمتەرخەمی مرۆڤایەتی بەرامبەر ژیانی مرۆڤێك کە رۆژێك لە رۆژان لە پێناوی ئەمدا ژیانی خستۆتە مەترسییەوە وئێستا لەسەرماو لەبرسا دەمرێت.

واتە پانتایی دوا دیمەن، پانتایی نارازی بوونی، کۆلۆنیل بەرجەستە دەکات، بەرامبەر بە «خۆی ـ مێژووی ـ رابردووی ـ پاڵەوانێتیو جەنگەکانی ـ ئەو وەهمەیکەتێی کەوتوو...».

تورەبوونی کۆلۆنیلە بەرامبەر بە هەموو شتەکان وەچوونە دەرەوەی سەیرو ئاڵۆزی لە سنووری تەختەی شانۆ، چوونە دەرەوەیەکی تەواو لە جیهان و لە یادەوەریە لە عنەتیەکان.



# شانـۆی ئیلیزابیثی لە سەردەمی شێکسپیردا

و: خالد حمید خۆشناو

لە سەردەمی شێکسبیردا لەسەرتاپای وڵاتدا رەنگە لە پێنج شانـۆ پتـر نەبـووبێت و هەمـووشیـان لە لەندەن بون کەلەسـەر شێـوازی حەوشـەی خانەکانی ئەو سەردەمە دروست کرابـوون. دەتـوانـین بڵێین شوێنێکی خۆش و دڵگیرو بەجێبوون بۆ پێشکەش کردنی شانۆگەری‌یەکان. شێـوەی هەڵکەوتنی شانۆیەکە بازنەیی بوو یان هەشت گۆشـەیی بووو جێی دانیشتنیش لە شانـۆکـەدا وەك چاڵیکی خری گەورە خۆی دەنواند کە سەرەکەی والابوو، ئەو شوێنە جێگای دانیشتنی بینەرە هەژارەکان بوو واتە ئەو بینـەرانەی کەلە سەر زەوی دادەنیشتن، بەدەوری هەمـوو دیـوارەکـانی شانـۆکەدا سێ پانیژە هەبوو کە سەریان گیرابوون، بەڵام لای پێشەوەیان کراوە بوون کە وەکـو پەیـژەی گۆرەپـانی یاری تۆپـێن دەردەکـەوتن و کورسییان لێبوو. نرخی چوونە ژوورەوە بۆ چالایی یەکە یەك (پێنی) بوو کە دەکاتە (پازدە پێنس)ی ئەمرۆ، کەچی چوونە ژوورەوە بۆ پانیژەکان لە دوو (پێنی) یەوە تا نیو کراون بوو بە گوێـرەی پلەو پایـەی کۆمـەڵایـەتی ئەو کەسـەوە بوو. ئەگەر رۆژێك باران بوایە ئەوا پێشکەش کردنی شانـۆگـەرییەکە دوا دەخرا بۆ رۆژێکی تر چونکە سەری شانۆیەکە والا بوو.

تەختـەی شانۆ لە شانۆی (ئیلیزابیثی) دا گەورە بووو درێژ ببـوەوە بۆ ناو چا لایی‌یەکە، هەروەها سەرتەختەی شانۆیەکە هیـچ رازانـدنـەوەیەکی لێنەبوو و چۆل و هۆل بوو، بێجگەلە هەنـدێ کەل پەل نەبێت، کەواتـە هیچ جیاوازی‌یەك نەبوو بۆ بینەر ئەگەر لە پێشەوەی شانۆکەیان لە تەنیشتییەوە بوەستێت. دیمەن و کەش وبای ئەو شانۆگەری‌یە ىش دەبوایە لە رێگای قسـەکـردنی کارێکتـەرەکـانـەوە دەربکـەوتـایە هەروەها ئەو شانۆگەری‌یە‌هۆی ئەم قسەکردنەوە لە خەیاڵی بینەرەوە دەربکاو بەبـەشێکی شانـۆگەری‌یەکە دادەنرا ئەمەش لەبەر ئەوە بوو تانـەبێتـە هۆی تێـك و پێکدانی خەیاڵی واقعیانە، بۆ وێنە لە

شانـۆگەری (ماکبیشدا) لەسەرەتای پەردەی یەکەم، دیمەنی شەشەم و پەردەی دووەم و سێ یەمدا وە دەبێت ئەوە بخرێتەوە یاد کە پێویستبوو شانۆگەری یەکە لە ڕۆژانی ڕووناك پێشکەش بکـرابایەو نیشانەکردنیشی بۆ تاریکی شەو دەبوایە لە خەیاڵی بینەرەکاندا بڕسکابایە بە هۆی قسەکردنەوە.

نەبـوونی ماوەی وەستـان و گۆڕانی لەدوای‌یەکی دیمەنەکان شتێکی باش نەبـوو لەبەر نەبوونی ڕازاندنەوە لەسەرتەختەی شانـۆ، کەواتە بەدوای یەکداهاتنی دیمەنی کورت و نەبوونی ماوەیەك بۆ وەستان شتێکی زۆر باو بوو لە درامای ئیلیزابیثی دا وەلە پەردەی (٥) ی ماکبیثدا دەردەکەوێت. دەبێت ئەوەش بزانین کەلەشانۆگەری‌یەکانی شێکسپیر هیچ جیا جیا نەبووە، لەســەرەتـای ئەو سەدەیـەدا شانـۆگەری‌یەکانی شێکسبیر بە دیمــەنی جوان و قەشەنگ دەڕازێنرانەوەو هەندێك جار لەبەر گۆڕانی بەردەوامی دیمەنەکان دەبووە هۆی چاوەڕێ کردنی بینەر.

ئەمڕۆ گەڕانەوەیەك هەیە بۆ دانانی شانۆگەری سادەو ساکار بۆ ئەوەی هەمان بارودۆخی سەردەمی شێکسپیر بپارێزین وەك لە دەرهێنـانی [شـانـۆی ڕۆیـاڵی شێکسپیری دا لە ستراتفۆرد (ئەیۆن ئەڤۆن)] دا دەردەکەوێت.

نوانـدنی شانـۆگەری یەك لەسەردەمی شێکسپیردا ماوەیەکی کەمتـری دەوێت لەوەی ئەمـڕۆ هەربۆ نموونە لە پێش گوتەی شانـۆی (ڕۆمێـوو جولێت) دا دەست نیشـانی تێپـەڕبوونی دووکاتژمێر دەکات. هەر دیمەنێك لە شانۆگەری‌یەکەدا بە بەیتە شیعـرێـك کۆتـایی دێت وەکـو لەپـەردەی یەکـەمدا دیمەنی (٤،٢،١) لە چوونە دەرەوەی (ماکبیث) دادیمەنی (٧،٥) بەدیار دەکەوێت:

دیمـەنەکان دەبێت بخرێتە ناو شانۆگەری‌یەکە بەهۆی هاتنە ژوورو. چوونەدەرەوە دەبێت وەك بەشێك لەناو شانۆگەری یەکە بخرێت، بەڵام لە شانۆی هاوچەرخدا کاریکتەر دەتوانێت بچێتە شوێنی خۆی پێش هەڵدانـەوەی پەردەی شانۆ هەرچەندە لە شانۆی بەرهەڵدادا ئەوە بەشتێکی ناراستەقینە دەردەکەوێت وەکو ڕۆیشتنی کاریکتەر بۆ سەر شانۆو دەست بەقسەکردن بۆ یەکەم جاریان کۆتایی هێنان بە دیمەنی شانۆگەری دا وەك لە

هەنـدێـك لە دیمەنەکانی ماکبیثدا بەرچاو دەکەوێت ، کەواتە هەمیشە لاشەی مردوو هەڵدەگیرێت و دەهێنرێتە سەر تەختەی شانـۆ لەکاتی بەردەوامی شانۆگەری‌یەکەدا زانراوە کەلەسەر عاردی شانـۆکـەدا دەرگـای سەرزەمینی دانـراوە بۆ لەنکـاو دەرکـەوتن یان ون بوونی (تـارمـایی و تاپـۆ) کان لە شانۆدا هەروەهـا لە هەنـدێ لە شانۆکان ئامرازی هەڵفڕین هەبووکە کاریکتـەر دەیتـوانی بەهـۆی گوریسێکـەوە داببـەزێتە سەر تەختەی شانۆ.

لەژێر تەختەی شانۆ ئۆرکێسترا هەبووکە سیمایەکی زۆر گرنگ بوو لە شانۆی ئیلیزابیثی دا هەرچەندە مەودای مۆسیقای زۆر نییـە لە شانۆگەری‌یەکی وەکو (ماکبیث) دا چونکە ترسناکە، بەڵام دووزەلە لێدەدرا جار واهەبوو تەپڵ لێدەدرا لە کاتی هاتنی سەربـاز بۆ سەرشـانـۆ وەهەروەها لە دواوەی تەختەی شانۆ کەلێنێـك هەبوو بەپەردە داپۆشرابوو و هەزکاتێك بویسترابایە دادەدرایەوە کەبو جادووگەرەکان وەك ئەشکەوت بەکار دەهات وەك لەپەردەی چوارەم دیمەنی (١)ی ماکبیثدا دیارە.

لە سەرەوەی ئەوکەلێنە پانیژەیەك هەیەکە وەك دیواری قەڵا یان ژووری سەرەوەکە بۆ پیشاندانی ئەو دیمەنانە بەکاردەهات کە دەبـوایـە پێوە بخرێت وا دیار بوو خەڵکەکە حەزی لە بینینی دیمـەنـەکـانی پانیژە بوو بەتایبەتی کە هەڵاتن لەسەرەوە بۆ ژووری خوارەوە بوو واتـە بۆ سەر تەختـەی شانـۆهەر چەند دیمەنی وا لە ماکبیثدا نەبوو.

ئەو کەسـانەی کە دەیانویست لە خەڵکی دیاربن دەیانتوانی کورسی لەسەر تەختەی شانۆبەکرێ بگرن بەتایبەتی ئەگەر یەك (شلن) یان پتر بدابایە ئەواخزمە تکارێك دەهات قەنەکانیانی دادەگیرساند بەوەش بۆ هەموو کەسیان پیشان دەداکەئەوان خاوەن خزمـەتکـارن، بەڵام ئەم خۆبـەدەرخستنـە لەلایـەن جوامێرەکانی گوندەکانەوە دەکرا تابۆخەڵکی دەربخەن کە ئەوان هاتـوونـەتـە شار، بەم کارەش دەبـووە مایەی بێزاری یەکی بەردەوامی کاریکتـەرەکـان هەروەها دەبوایە ئەم کاریکتەرانە دەمیـان بەش بکـردایـەوە تاوەکـو ئەوبینەرە ئەرستۆکراتیانە دڵخۆش بکەن.

هیچ ئافرەتێك بە پێی یاسارێی پێ نەدەدرا ڕۆڵی نواندن ببینێ، سەردەنجـام دەوری ئافرەتان لاوانی دەنگ ناسك دەیانبینی،





ئینجا به خۆت خەیاڵ بکەلاویك رۆڵی (لیدی ماکبیث) یان (ئیموگن) یان (کیلۆباترا) ببینێ ئەمەش بووە هۆی کەمی ـدوری ئافرەتان لە شانۆکانی ئەو سەردەمەدا هەرچەندە هەندێك رۆڵیان هەر تێدا دەدیت بۆمەبەستی گۆران لەبەر ئەم هۆیەش زۆر جار ئافرەتان وەکو لاوی خزمەتکار خۆیان دەگۆری بەمەش زۆر ساناتر بوو بۆ دەرهێنەر وێرای ئەمەش بینەر بە هۆی ئەو بارو دۆخەوە هەڵدەخەڵەتێندرا کە کاریکتەرێك وای خۆ دەردەخست کە بەراستی ئەو کەسەیەکە رۆڵەکەی دەیبینێ جا لە شانۆگەری (بازرگانی ڤینیسیا)دا دەتبینی هەر کاریکتەرێکی مێ یینە جل و بەرگی پیاوانە دەکاتە بەر هەرچەندە شانۆگەرییەکان بەجل و بەرگی ئەو سەردەمە نە دەنوێنران، سەرەرای ئەوەی هەوڵدانێکی زۆر هەبوو بۆ ئەوەی جل و بەرگی سەردەم لەبەر بکرێن لەلایەن کاریکتەرەکانەوە. وەلەبەر ئەوە دەبوایە جل و بەرگیان دیار بووباو جیاواز بووایە لەگەڵ جل و بەرگی خەڵکی کەواتە دەکرێ بڵێین یەکەم جار زۆربەی شانۆگەرییەکانی شێکسپیر بە جل و بەرگی هاوچەرخانە پیشان دەدران، بەلام لەبەر نەبوونی دیمەن سازی لەو سەردەمەدا بەرێوەبەری شانۆ پارەیەکی زۆری لە جل و بەرگی ڤەشەنگدا خەرج دەکرد.

لەو رۆژانەی شانۆگەری پێشکە... دەکرا، ئالایەك لەسەر ساختمانەکە هەڵدەکرا، هەرکە شانۆگەری یەکەش دەستی پێدەکرد نۆ بۆرەی شەیپوور دەژەنرا.
لەسەرەوەی ساختمان زەنگێکی گەورەی لێبوو لە شانۆیە زوومکاندا بە چاکی دێتەوە بیر، هەروەها ئەم زەنگە کاریگەرییەکی گرنگی هەبوو و زەنگە شێکسپیر هەر ئەوزەنگەی بەبیردا هاتبێت هەر کە ماکدوف هاواردەکات (زەنگەکە لێدە)، بەلام پێویستە وابیرنەکرێتەوە نووسینی شانۆگەرییەکی شێکسپیر بۆ ئەو جۆرە شانۆگەری کارێکی زۆر سەخت بووە چونکە بۆ شێکسپیر زۆرگران بوو ئەگەر بۆ هەر شانۆیەکی دیکەی بنووسیبایە بێجگە لەو جۆرە شانۆیەی ئەو پێی راهاتبوو.

BRODIES NOTES

Shakes Pear Magbeth






زاراوەی سونێت لە ئەسڵدا لە ووشەی سۆنێتۆی (Sonetto) ئیتالی وەرگیراوە کە بە مانای «دەنگێکی بچووك» یان «گۆرانی» دێت. لە پاشاندا سونێت بووە فۆرمێکی لیریکی سەربەخۆ. سۆنێت پارچە هۆزانێکە لە چواردە دێرە شیعر پێکدێت و دەکرێتە دوو بەش: هەشت دێری یەکەم پێی دەگوترێت ئۆکتێڤ (Octive) شەش دێری کۆتایی سێستیت (Sestet).

کێشەکەی بە زۆری (ئامبك)ی پێنج تەفعیلەیە. سەرەتای نوسینی سۆنێت بۆ گیاکو دالینێنۆ دەگەڕێتەوە. لە ساڵانی دوایی سەدەکانی ناوەراستدا هەموو شاعیرە لیریکیە ئیتاڵیەکان وەکو دانتی و گافالکانی ئەم شێوە ئەدەبییەیان دارشت.

پیتراك (Petrarch) لە هەموو شاعیرانی دی سەردەمی خۆی بناغەی سۆنێتی وەکو فۆرمێکی شیعری سەرەکی چەسپاند.

قافیەی پیترارکی بەمجۆرە بوو:

ab ba ab ba cde cde

ئەم فۆرمە(سۆنێت) بۆ دەربڕینی خۆشەویستی بەکار دەهات و لە پاشاندا بووە کلیشەیەك بۆ شیعری دڵداری. ناوەرۆکی شیعرەکە لەم سەردەمدا دەربڕینی ئێش و ئازاری دڵداری و تلانەوە بە دەست ساردو سڕی و روونەدانی خۆشەویستەکەی کابرای ئاشق بوو پێی. باسی خەو زران و دالغە بردنەوەو ئەسڵزادەیی و خۆنەویستن لە نێو توێی شاکاری ئەدەبی و باق و بریقی رەوانبێژیدا دادەرێژرا.

ئینگلیزەکان لە ئیتالیەکانەوە سۆنێتیان ناسی و لە سەدەی شازدەمیندا سێر تۆماس وایت (١٥٠٣ _ ١٥٤٢) و ئێرلی سەری The Earl of surry (١٥١٧_١٥٤٧) یەکەمجار فۆرمی پیتراکیان وەرگرت و لە پاشاندا پەرەیان پێسەند و شێوەیەکی نوێیان پێبەخشی.

سدنی و سپنسەرو شەکسپیر دەستێکی باڵایان لە گەشە پێکردنی سونێت و بەرەو پێش بردنی هەبوو.

شاعیری میتافیزیکی ئینگلیز جۆن دەن (١٥٧٢_١٦٣١) لە سۆنێتەکانیدا باسی ئایین دەکات و بە نێوی سۆنێتە پیرۆزەکان (Holy Sonnets ) رێکی خستبوون. لە کاتێکدا میلتن (١٦٠٨_١٦٧٤) سۆنێتی بۆ ئامانجی ساتیرو کۆمەلایەتی و سیاسی دارشتووە.

شەکسپیر، سەرتۆپی شاعیرانی ئینگلیزە لە هۆنینەوەی سۆنێتدا. لە پەرەپێدانی ئەم بەرفراوان و بە رەواجەی ئەو کاتەی ئەم جۆرە ئەدەبە (سۆنێت) سەر دەستەی سواران بوو، بەڵام بە جۆرێکی جیاواز لە سۆنێت نوسەکانی زەمانی خۆی دایرشتووە.

فۆرمی سۆنێتی شەکسپیری وەکو سپنسەری سێ چوارینە و کۆپلەیەك بوو بەڵام قافیەکەی abab, cdcd, efef, gg بوو. شەکسپیر، سۆنێتەکانی بە بیرۆکەیەك دەستی پێدەکرد کە لە یەکەمین چوارینەدا دەری دەبری لە چوارینەی دووەمدا پێدا دەچوو و پەرەی بە بیرۆکەکە دەسەند لە چوارینەی سێیەمدا بیرۆکەکەی ئاوەژوو دەکردەوە تاکو لە کۆپلەی کۆتاییدا حەلێکی بۆ بدۆزێتەوە. سۆنێتی شەکسپیری چیرۆکێکی تەموموژاوی دەگێڕێتەوەو بابەتی سەرەکیشی روون و ئاشکرایە. زنجیرەیەك

لەم سۆنێتانە باسی قۆزی کورە گەنجێکەو هانی دەدا ژن بهێنێ.
هەندێکیان بۆ خانمێکە، هەندێك دەربارەی خۆشەویستیەکی سەیـری سێ قۆڵییە لە نێوان دوو پیاوو ژنێك چەند سۆنێتێك لەسەر هێزی رووخێنەری زەمانەو نەمری شیعرە. هەندێکیان دەربارەی شاعیرێکی غەنیمە.... تاد.
هەرچەندە زمانی نوسینی سۆنێتە کان بە ووشەی سادەو سانـا دەربـڕاوە بەڵام پڕە لە مێتـافـەو بیرو مانا بە پێزەکەی قوڵبونەوەیەکی وورده لە کات و گۆڕان و جوانی: وێنەبیری لە سەرچـاوەی هەمـەجـۆر هەڵێنجاوە: باخچەوانی، دەریاوانی، یاسا، وەرزێری، ئیشوکار، هونەری وێنەگری زەیتی، ئەستێرە ناسیو کاروبـاری ناومـاڵ. مودی سۆنێتەکان وەکو سەردەمی رینەیسانس رەشماڵی رەشبینی باڵی بەسەردا نەگرتووە بەڵکو هەمە چەشنەیە: کەیفسازی، فیز غەمگینی، شەرم، بێزو ترس.
ئەمەش سێ سۆنێتی شەکسپیرە لە ئینگلیزی‌یەوە کردوومە بە کوردی.

**تێبینی:**
زنجیرەی سۆنێتەکان بە گوێرەی هاتنیانە لێرە نەك بە گوێرەی زنجیرەی ئەسلی سۆنێتەکان.

## سۆنێتی یەکەم

نازانم بە ڕۆژێکی هاوینت بشوبهێنم؟ کەچی تۆ فێنکترو خنجیلانەتری:
ووشکـە با خونچـە ئازیزەکانی مایس دەهەژێنێ، بەڵێنی مەودای هاوینە زۆر کورتە، هەندێ جار دیدەی ئاسمان سەرگ کەچـەڵ دەسـوتێنێ‌و، زۆر جاریش پیسقـەی زێرینی بۆری دەنـوێنێ؛ هەمـوو جوانێـك، چارەنوسی نەمانە، لە ژێر کاری زەمانە یان بە ڕێچکۆڵەی گۆڕاوی سروشت بەڵام هاوینەی هەتا هەتایی‌ی تۆ، سیس نابێتەوە ئەو جوانی‌یەی هەتە نارەوێتەوە مردنیش بە سورانـەوەی تۆ لە سێبـەریـدا پۆز دەرناهێنێ تا مرۆڤ توانـای هەناسەی مابێ و چاو بەدی بکا تۆ لەم ووشە ئەبـەدییـانـە نەمریت بۆ دەنوسرێت و ئەم شیعرەش دەژی‌و ژیانیشت پێدەبەخشێ.

## سۆنێتی دووەم

چاوانی خۆشەویستەکەم هیچی لە ڕۆژ ناکا، مەرجان زۆر سوورترە لە سووری لێوەکانی، گەرچی بەفر سپی‌یە، کەواتە بۆچی سینەو مەمانی رەش و برشە گەر داوە پرچ وایەر بێت، وایەری رەش لە سەریدا شین بووە گوڵی قەرنەفلی سوورو سپیم بینیووە، بەڵام گوڵی وا لە کوڵەکانیدا بەدی ناکەم هەندێ بۆن و بەرام بۆن خۆشترن لە بۆنی گەنی هەناسەی خۆشەویستەکەم.
حەز دەکـەم گوێ لە قسـەکانی رادێرم، کەچی باش دەزانم، دەنگی مۆسیقا زۆر بە جۆش و خرۆشترە:

راسـتـە، من پەریـم نەدیـوە بەسـەر زەویـا بروات، کاتێ خۆشـەویستـەکەم دەروا ترپەی پێی دێ لەسەر زەویا بەڵام مێشتا، قەسەم بەخوا، لەو باوەرەدام کە دڵدارەکەم دوورە لەو هەموو کەمیـانەی بە هەڵە پێیان دەشوبهێنم.

## سونێتی سێیەم

کاتێ چل زسـتـان دەوری ئەبـرۆکـانت دەداو لە کێڵگـەی جوانیتا خەتی قووڵ هەڵدەکۆڵێ ڕووکەشی گەنجێتی لە خۆباییت کە جێی سەرنجـە دەبێتـە پەڕۆی دڕاوو کەم بایـەخ ئینجـا دەپرسن، کوا ئەو هەموو جوانیەت؟ کوا ئەو هەموو گەنجینەی زەمانی هەڵچوونت؟ گەر گوتت وا لە چاوی قوولەکانمە مەحتێکی بێهودەیەو شورەیی بەکار هێنانی جوانیت چەند مەتح و سەنای شایان بوو گەر بتوانی بڵێی: ئەم کورە قشتەی من حسێبم بە سروشت دەداتـەوەو لە پیری دەبێتە عوزرم، جوانی خۆی لە دوای تۆ دەنوێنێ:

کە تۆ کەنەفت دەبی ئەم بەرەی نوێیەو خوێن گەرمی خۆت لەودا بەدی دەکەی کاتێ تۆ هەست بە ساردی دەکەی.

●




یاد گاری مندالیت وەك سێبەرەكەت وایە، كە لەشت لە بەر خۆرا جوولا سێبەرەكەیشت یان بچووك یان بە تەواوی ئەتوێتەوە، جاری وایش هەیە ئەبێتە درەختێكی بالابەرزی بێ لق و پۆپ، نهێنییەكە لەوەدایە كە خۆری ئەو یادگارانە درەنگ هەڵدێن، بەلام كە گەرماییان كەوتە لە شتەوە ئیتر وەك خوێن بە هەموو كون و كەلەبەرو درزو دەمارتا دێن و دەچن و ناهێڵن بۆ تاوێك وەنەوزی ئاسوودەیی بدەیت، هەیانە تەمێكی تەنكەو بەسروەی شەماڵێك سەری خۆی هەڵئەگرێو ئەروات، هەیشە درەختێكی رەگ ئەستوورەو لە قووڵاییدا خۆی داكوتاوە، هەزار رەشەبا تەزوویەكی مەرگی پێ ناگەیەنێت. ئیتر مندالی مێژوویەكی بەوەفایەو تا مردن پێت لێ نابرێت. ئەی كەس هەیە مندالیەكە ی هەورێكی بەهاری نەبێت و كەلێك جار دانەكاتە سەركێڵگە وشك و دیمەكارەكەی ژیانی؟ یان نەی گرێنێ و بەرەو گەرداوی نەبات؟

دوێنێ كە بە پلیكانەكانی ناوبازاردا چوومە خوارێ، لە بەردەم هەرسێ شەقامەكەدا بوومە گوڵە گەنمی دەست شەماڵی رارابییەكەم، دیمەنی كورە گەنجە بێ قاچەكە كە خۆی عەرەبانە دەستیەكەی ژێری لێ نەخوری بووە دەرزیەكی داخ كراوو، كسپەیەكی بێ دووكەڵی لە هەناوم هەستاند، بوومە ئەو پاپۆرە شكاوەی كە شەپۆلەكان بە تاشە بەردو كە ناریا دەكێشن، ئاگام لەوەنەما كە چەند كەوتمە دوایەو، چۆن بێجگە لەو لاوەو عەرەبانەكەی چاوم هیچی تری نە ئەبینی، كەلە چاوییش ون بوو سەرم دانەوواندو بەرەو خوار ملم نا، سەری ماندووم قورساییەكی زیاتری خستبووە سەر ملم و بەشانمەوە شەتەك درابوو، ئەم ویست بارەكەم سووك بێت، بەلام چۆن؟

لەبەردەم ئاشەكەدا وەستام لام دایە دووكانەكەی قاڵەرەشی هاورێیم، پیامدا هەڵپروانیو وتی:

- دیسان لەوەدەچێت تەواو نەبێت؟
- .....
- ڕۆژێك نەبوو نەکەویتە ناو ئەم گوزەرەو ئاسایی خۆت بکەی
ـەلای مندا، وا دیارە لەم بازارەدا شتە بێ گیانە کانیشت لێ
ـێنە سەرپێ؟
- ئەمرۆ کارم بەبێ گیانەوە نیە.
- ئەی چی سەرو دڵی گرتوویت؟
- کەمێك لەمەوبەر بوومەوە بە منداڵە دە دوانزە ساڵەکەی جاران.
قسە بە پێکەنینێکی ساردەوە وتی.
- حەو!.... بۆ تۆ هەر ئەمرۆ وا بوویت؟ ئێستایش یاریەکانی منداڵی لە ناختا ئەژین، بەلاتەوە ئاساییە سەعاتێك بە دیار چەند منـــداڵێکـــەوە ڕاوەستی و گوێ لە جوێن و قســـەی هەلەق و مەلەقیان بگرێت، یان تەماشای یاری و گۆڵەزیان بکەیت، ئەمە خۆت بۆت باس کردووم.
- هەنـــدێ تەمـــەنـــی گەورەیی منـــداڵیـــەکـــە بۆ خۆی، من نەگەیشتوومەتە ئەو تەمەنە، بەلام منداڵیشم.
- هەموو کەسێك تەزووی ئەو تەمەنە سری ئەکات.
بەلام نەك وەك تۆ زەویەکەی هەڵکۆڵێت و بەدوای شتە ون بووەکانیشیا بگەڕێیت.
- ئەمەیشیان نا، منداڵی هەر جوانی و گوڵێ‌دڕك و داڵیشی زۆرە.
- ئەمەی ئەمڕۆت کامیانە؟
- هەردووکیان.
- چۆن؟
- کوڕێـــکـــی گەنـــجـــم بیـــنـــی هەر دوو قاچی برا بووەوە، لە عەرەبانەیەکی دەستیدا بوو خۆی لێی ئەخوری.
- ڕۆژانە دەیانی وا ئەبینم، ئەمەندە زۆرە بۆتە دیمەنێکی ئاسایی.
- ڕاست ئەکەیت، بەلام سیمای ئەو گەنجە خۆری ڕۆژانێکی من بوو، تا ئێستایش بەشێك لە ڕووناکی مێشکم هی ئەو خۆرەیە.
- باشترم بۆ باس بکە، من زۆر شارەزای منداڵیت نیم.
- ئەزانم، چونکـــە هاوڕێیـــەتی من و تۆ درەنـــگ وەخت و ئەم باسەیشم بۆ نەگێراویتەوە.
- ڕەنگە باسێکی دەوڵەمەندیش بێت؟

- ئەشێ.... نازانم تۆ دووکانەکانی حەمەی میرزا ئەزانیت؟
- حەمەی میرزا.. خوار کۆنە خانووەکەی خۆتان.
- تەواو، ئەوە ئەو شوێنەیە کە گەرای یادگارێکی گەورەی منی تیا تروکا.
- دووکانەکان کۆنن
- بەڵێ، ئەوە شوێن خانووی مارف ناوێك بوو، پاشان فرۆشتی بە مام شەریفی جامبازی ووڵاغ، مام مارف لە گوندەوە هاتبووە شار، تاقەکوڕێکی هەبوو کە هەردوو قاچی لە کارکەوتبوو.
- بۆ؟
- پاشان بۆت باس ئەکەم، نازانم چۆن لەو کوڕە بدوێم؟ لە گوند خوێندبووی، تابڵێی هۆشیار و لە دڵ خۆشەویست بوو، من بەو منداڵیە ئەمەندە ئالوودەی بووم هەموو ڕۆژێك ئەچوومە لای.
- ڕەنگە بەزەییت پیا هاتبێتەوە؟
- نەء، بڕوابکە کەلای دائەنیشتم باوکیشم لە بیر ئەچوەوە.
- ئەی تۆی منداڵ و ئەوێکی گەنج چۆن؟
- نازانم، نا توانم دەست بخەمە سەر ئەو هەستی منداڵیەم. بەلام نهێنیەك لەو ئالوودە بوونەمدا هەبوو کە تا ئێستایش لام ماوەتەوە.
- ڕەنگە تۆیەکی تاقانەو ئەویش هەروا؟
- ئەشێ، بەلام هەستی ئەوسای من وەك دەرزی ناوکاوایەو نای دۆزمەوە.
- خۆ ئەبێت بەشتێکەوە گیرسا بێتەوە؟
- ئێستا مەبەستم کردنەوەی ئەو دەرگایە نیە.
- ئەی؟
- دایـــك و باوکی زۆریـــان خۆش دەویست، تاقانەو قۆز و تێ گەیشتوو، داخی قاچیشی هەردوو کیانی لە ئازار پڕ کردبوو.
- بەزگماك وابوو؟
- نەء، ئەمەیش باسێکە بۆ خۆی، بەلام بە کورتی لە ناو بەفرا کەسیرەکەوتبوو، پاشان هەردوو قاچی ببونە دوو لقی ووشك و چەماوە.
- تا ئێستا و نازانم ناوی چی بوو؟
- لەبەر خۆشەویستی دایك و باوکی پێیان ئەوت شازادە، بەلام خۆی ناوی غەریب بوو، من هەرپێم ئەوت کاکە غەریب، زۆر

جار چیرۆکـی چیـایـیو راوو گیر خواردنـی ناو بەفـری بۆ ئەگێڕامەوە، لەو باسانەی زۆر ئەزانێ، کە پاڵەوانی چیرۆکەکەی ئەکەوتە هەڵەت و کەوتن و هەستانەوە، ئەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشاو ئەی وت: «حەمە گیان، لەم وولاتەی ئێمەدا پیاو کە قاچی نەبوو ناو دەرناکات و نابێتە مرۆڤی مەزن. پیاوی بێ قاچ وەك ئافرەت بێ دەستەڵاتە، من حەز بەوە ئەکەم ببمەکوترێك و بە هەمـوو دنـیـادا بگـەرێـم،

بچمە سەر لووتکەو ناو باخ و دارستانەکان و داخی ئەم چەند ساڵی پەك کەوتوویەم برێژم؛ من پێم ئەوت.

(ـ کاکە غەریب ئەی تۆ قاچت چاك نابێتەوە؟

ئەی وت:

ـ ئێمــە لە لادێ بووین، من ورکم لە باوکم گرت بێتــە شارو چارێکم بکات، زۆر گەراین و بێ سوود بوو.

قالە وتی:

ـ هەرچاك نەبووەوە؟

ـ ئەوەیشم مەبــەست نیـە بۆت بگـێڕمەوە، بەلام لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە جوانترین کچی کۆلانەکەمان حەزی لێ دەکرد.

ـ ها.. جوانترین کچ؟

ـ بروات هەبێت، کەم و زیادی نیە.

ـ ئەمەیان چۆن؟

ـ بڵێم چۆن؟ ئەمەیش وەك زۆر نهێنی تری ئەو کورە.

ـ ئێستا تۆ بەلاتەوە سەیر نیە؟

ـ نەء، دەیان جار بە چاوی خۆم ئەم دی کە ـ خونچە ـ ئەهاتە ماڵیان، لەوە ئەچوو مەبەستیشی نەبێت خەڵك پێ بزانێت، چونکە ـ خونچە ـ لای باوەپیارە ئەژیاو زۆریش سەربەست و سەرەرۆ بوو. کە ئەکـەوتنە قسە غەریب بەزمانە خۆشەکەی ئەی کردە مەڵێکی بە هەشت و بەناو دنیای خۆشەویستیدا ئەی گێرا، کە بێ دەنگ ئەبوو ـ خونچە ـ سەروچاوی بەسنگی خۆیەوە ئەناو ئەکەوتە دەست و دەم بازی.

ـ ئەی تۆ چیت ئەکرد؟

ـ من گەشکەم پێ ئەکەوت، وام هەست ئەکرد خوشترین کاتی ژیانمە، کە غەریبم بەو ئارەزوە پڕەوە ئەبینی هەموو دنیا ئەبووە دیاریەکی بەختەوەری و بەمن ئەدرا، پێکەنین و دڵخۆشیِ غەریب دنیای لەبەر چاوی من روون و جوانتر ئەکرد.

ـ سەیرە... هەستی منداڵێکی ئەو تەمەنە!

ـ خۆیشم نازانم، تەنانەت لای کەسیش نەم ئەدرکاند.

ـ خۆشەویستیەکەی غەریب تەواو کاری لێ کردوویت.

ـ ئەشێ، بەلام لەو بەیەك گەیشتنانەدا هەستم بەشتێکی سەیر ئەکرد.

ـ وەك چی؟

ـ کە ـ خونچـە ـ ئەچـوە دەرەوە تارمـاییـەکی رەش بەســەر غەریبەوە لەنگەری ئەگرت، بێ دەنگ ئەبوو، رەنگی ئەگۆرا وەك نهێنی‌یەکی سامناك لە دەروونیا پەل بهاوێ گرژ ئەبوو، دەستی بەسەریەوە ئەگرت و ماوەیەکی زۆر وا ئەمایەوە.

ـ رەنگە هەر لەبەر بێ قاچی و بێ دەستەلاتیەکەی بوو بێت، یان کە ئەوکچەی بەو جوانیەوە بینیوە هەستی بە دەردە دڵی خۆی کردوە؟

ـ ئەبێت، بەلام خۆشـەویستیـەکـەیان لەوە گەورەتر بوو ئەو مەبەستانە بیروشێنێت.

ـ ئەی دایك و باوکی؟

ـ ئەت وت کونێك لە ناوەراستی ئاسمان کراوەو ـ خونچە ـ لای خواوە کراوەتە خەلاتی غەریب.

ـ دوایی؟

ـ دوایی! ئەمە ئەودارە شکاوەیە کە ترس و گومانی چەند ساڵەی منی لە ژێردایە.

ـ بۆ؟ مرد؟

ـ نەء

ـ چاك بووەوە؟

ـ نەء.

ـ کچەکەیان لێ داگیرکرد؟

ـ نەء.

ـ شووی پێ کردو ئێستا خاوەنی رەوە منالێکە؟

ـ ئەمەیشیان نەء

ـ ئەی چی؟ ئاسمان هەردووکیانی هەڵکێشا؟

ـ رەنگە وابێت.

ـ چۆن؟

- ڕاوەستە، بۆت باسگەم، ساڵێك زیاتر ئەو پەیوەندیە لە برەو ذابوو، دایکم چەند جارێك مەبەستەکەی بە گوێی دایکی خونچە ـ دادا، لە خۆیشیەوەنا، بەڵام دایکی خونچە بێ وەڵام بوو، ئەو ماوەیەیش گرێ کوێرەیەك کەوتبوە نێوان دایکی خونچەو مێردەکەیەوە. تا لە پڕا ئەوەی چارەنووس کردی وەك بوومە لەرزە هەمووماني هەژاند.

- خێر؟
- خێری کوێ؟ خونچەیان دابەشوو.
- بەیەکێکی تر؟
- بەبرازایەکی باوە پیارەکەی.
- هەروا بە ئاسانی؟
- پێم نەوتیت تارمایی هەندێك کارەسات تامردن لە کۆڵت نابێتەوە؟
- ئەی خونچە خۆی؟
- خونچە؟ تۆچی بۆ دائەنێیت؟
- خۆی بکوژێت.
- دەبا بۆت باس بکەم. کە دوای هەواڵەکە غەریبم بینی ڕەنگێکی سەیری لەخۆ گرتبوو، لە نێوان ڕاستیو درۆدا.
بروا کردن و نەکردندا لە هەڵچوون و داچووندا بوو، چاوی ئەگێڕاو لە پڕا بەشتێکەوە ئەگیرسایەوە کەتێ ڕامانی نەدەهێنا، هەستم ئەکرد ئەیویست باڵ بگرێ، بڕوات، بەسەر لە دەرگای ماڵی خونچە بدات و ڕاستیی ئەو نهێنیانە بدرکێنێت کە جاران لە چاویان بەدی دەکرا، لە پڕا هێور ئەبوو، ئەبووەوە بە غەریبە هێمنەکەی جاران.
- ئەی تۆ؟ دایکت، خەڵك و خوا؟ دەرگایەك پەنجەرەیەك کونێکی بچووك؟
- پێم وتیت غەریب هەر سکاڵای لای من ئەکرد، بۆیە تا ئێستایش ئەمە گرێیە کە لە دڵماو ئەڵقەکەی نەکراوەیە.
- ئەی چار؟
- کە یەکەمجار چوومە لای بۆ لای خونچەی ڕاسپاردم.
من زۆر بەرەهایی مەبەستەکەم پێ وت، بەڵام لە کوێم هەڵئەگریو لە کوێم دا ئەنێیت!

- ئەمەیان چیە؟

وەك ڕۆژێك لە ڕۆژان خونچە غەریبی نە ناسیبێت پێی وتم:
- حەمە کە گیان، بە غەریب بڵێ ناوم نەهێنێت و ئەو ڕابوردوەیش لەبیر خۆی بباتەوە، زۆر کەس حەزلێ کردنیان بوەو بەیەکیش نەبراون، ئیتر ئەمە چارەنووسە ڕاستیش حەمەکە من و ئەویان نەوتوە.
لەوکاتەدا وام هەست کرد چەقۆیەك بەناو دڵما ئەکات و تیایدا ئەی گێڕێت، نازانم چۆن بەو منداڵیە زمانم پڕاو پێم وت:
- خونچە ئەم قسانەت بەراستیە! خۆ تۆ بەپێی خۆت ئەهاتیتە لای کاکە غەریب و سەرت بەسنگیەوە دەنا، شەرمیشت لەکەس نەدەکرد، بۆمن کەمتان بە دیارەوە دانیشتووم؟ ئاگام لێتان نیە؟

- حەمەکە تۆ هێشتا منداڵیت و لەم شتانە نازانیت، دەست گیرانەکەم کوڕێکی قۆزە، وەك خۆم وایە، ئەوە تۆ ئەی لێیت یاریەك بوو کردمان و تەواو، با گەورەبیت تۆیش فێری ئەو جۆرە یاریە ئەبیت.

ئیتر وەك دەستێکی بڕاو کە لە داخا خوێنی لێ نەچۆڕێ هاتمە دەرەوە، کە بۆ غەریبم باس کرد زۆر ڕاما، ڕامانی نیمچە خنکاوێکی ناو دەریا کە بەدوای چڵە دارێکدا بگەڕێ دەستی بداتێو خۆی ڕزگار بکات، دوای ماوەیەك هاتەوە سەرخۆیو پێی وتم.
- کەواتە تۆش لە بیر خۆتی بەرەوە.
قالە کەچاوی لەناو چاوم بڕیبوو وتی:
- باشە ئەم بێ ویژدانیەی خونچە بۆ؟
- تا ئێستایش کە یادگارە تاڵەکانی ئەو ڕۆژانەم لێ دێنە سەر پێ ئەوەیان لە هەموو زیاتر دەبێتە پشکۆو جزە لە ڕۆحم هەڵدەستێنێت، بڕوا بکە تا ماوەیەکی زۆری دوای ئەو کارەساتەیش من سەرم لە نێوان ژن و پیاودا ببوە چەرخی گەڕوك، پێشتر زۆر ئالودەی دایکم بووم، کەچی وردە وردە لێی ئەکیمەوە، هەستم ئەکرد ئەویش خونچەیەکە بۆ خۆی یان بابڵێم خونچەم لە هەموو ئافرەتێکدا ئەبینی.
- چیتر؟
- خونچە بۆ گەرەکێکی دوور گوێزرایەوە، ئەو ڕۆژە خۆڵ باران بوو، گەورەو بچووکی کۆڵانەکە ئەیان وت ئەمەمانای شوومی و نەگبەتیە، پەنا بەخوا ئەگەر کارەساتێکی گەورەمان

بەسەرنەیەت. کە چوولەلای کاکە غەریب دووچاوی سووری بە قولاچووی رەش داگیرساو بوو، بانگی کردمەلای خۆیەوە، دەستی بەسەرما هێنا، پاشان وەك کەسێکی لە من دڵسۆزتری دەست نەکەوێت خەمەکانی خۆی بۆ باس بکات، کەوتەقسە، ئیتر من چەندی لێ تێ ئەگەم و چۆن ئەوەی مەبەست نەبوو، پێی وتم:

ـ حەمە گیان پێم نەوتیت کە قاچت نەبوو لە پیاوەتی ئەکەویت؟ ئەگەر وا نەبوومایە خونچە بۆ ئارەزووی خۆی ماوەیەك هەڵی نەدەخەڵەتاندم، پاشانیش لە ناو خەڵکا ئاوا شەرمەزاری نەدەکردم. رەنگە مێردەکەی تەنیا قاچی لە من زیاتر بێت، وانیە؟

خۆ ئەگەر من ئاوا دەستەوەستان نەبوومایە نە خونچەو نەکەس و کاری نەیان دەتوانی ئەم خەنجەرە لەسەر دڵم بدەن. حەمەگیان...

ئەمەوێ قسەت بۆ بکەم، گوێم لێ بگرە، بۆ ئەوەی کە گەورە بوویت یادم بکەیت و بڵێی: کوڕێکی فرێ دراوی بێ قاچ ئەم شتانەی فێر کردم، گوێ بگرە.... دوو ئاواتی گەورە دڵی منیان بە ژیان خۆش کردبوو، چاك بوونەوەی قاچم کەنەهاتە دی‌و، خۆشەویستی خونچەیش کەوەك بروسکەیەك هات و کردمیە کۆڵو، ئیتر ژیان بۆ من تەڵە پووشێك ناهێنێت، تەڵە پووشێکی بێ نرخ، بەلام کە گەورە بوویت ئەم خۆشەویستیەت لە بیر نەچێت، تۆ وەك خۆت یادی بکەرەوە، یادە رووناکەکانی‌و ئەوی تری بخەرە لاوە، بۆ ئەوەی تۆیش بێزارو هەراسان نەبیت.

دڵۆپێك فرمێسك لە چاوی غەریبەوە بازرەقەی بەست و لەسەرپشتی دەستی چەپی کە لەسەر کۆشی دای نابوو گیرسایەوە، لە بەر چاوی مندا ئەو دڵۆپە دەنگێکی تووڕەیی و لالانەوەیەکی بروسکە ئاسایش بوو کە بە رووی گەردووندا هەڵشاخا، کەبێ دەنگ بوو تەماشای ناوچاویم کرد، زانیم بێ دەنگیش زمانێکی تری هەستەو زۆر قووڵ دەدوێت. فرمێسك کەوتە ناو چاوی منیشەوە، گریام، غەریب پێی وتم:

ـ حەمەکە.. ئەم گریانەی تۆم زۆر لاخۆشە، وەك بلووری چرای بەر ئاوێکی بەخوڕ ئەمشواتەوە، هەست ئەکەم تۆی منداڵ چیایەکیت و لە پشتمەوە بەرگریم لێ ئەکەیت، حەمەکە، زیاتر بگری، دەی، گریا نەکەت دەروونم ئەحەسێنێتەوە.

دوای ئەوە غەریب بووە مرۆڤێکی دی، وەك پایزێکی مەلوول بێ دەنگ دادەنیشت، چاوی بە قاچە بارێك و بێ گیانەکەیدا دەگێڕا، ئەی ووت! ئەم گەردوونە گەلێك کاری نارەوا دەکات، تۆ بڵێی ئەگەر من قاچم وای لێ نەهاتایە ئەم دنیایە ژێرەو ژوور بایە؟ بەلام ئەگەر بەو ڕۆژە سەختە نەچوومایەتە ڕاوو پاشان شەوو ڕۆژێك لەناو بەفردا کەسیرە نەکەوتمایە قاچم وای لێ نەدەهات، ئەمەیان سەرچڵی خۆم و حەزێکی بێ مانابوو، حەمەکە ئەگەر ئەمەم بەسەر نەهاتایە ئێستا غەریبێکی تر ئەبووم.

ئیتر بێ دەنگیەکە دای دەگرتەوە، جارجار فرمێسکێکی بێ دەستەلاتی کە وەك زستانی وولاتە ساردەکان سەخت و کوشندە بوو دەکەوتە ناو چاوی، لەپڕا ئەهاتەوە سەرخۆی، ناو چاوی ئەبوەوە بە بیابانێکی بێ تەڕایی، چاوە ئاساییەکەی جارانی نەدەما، نهێنیەکان تیا ئەدرەوشانەوە نەم ئەزانی لە کوێوە سەرچاوە ئەگرن و بۆ کوێیش ئەڕۆن.

کە کڕی‌و بێ دەنگیەکەی تەواو ئەبوە مۆتەکەی ژوورەکە، ئەوسا هەستی لای دەورو بەری خۆی نەدەما، چاوی بەبن میچ و دارەڕاکەوە ئەبڕوا، لەگەڵ تاسەو خەمەکانی ناوەوەیدا رەنگی ئەگۆڕا، منیش وەك ئەو مت ئەبووم، حەزم نەئەکرد دنیاکەی لێ تێك بدەم، هەندێ جار بیرکردنەوەکەی وەك گەردەلوول ڕای دەژەند، یان هەناسەی یەك لە دوای یەکی پێ هەڵدەکێشا، کە درەنگی دەخایاند بێ دەنگ دەهاتمە دەرەوە، ئەو هەستی پێ نەدەکرد، منیش زمانی ماڵ ئاواییم لاڵ ئەبوو، کە هەستیشی پێ بکردایە، لەگەڵدا تابەر دەرگاکەیان بە قنگە خشکێ دەهات، کەمێك لەم سەرو ئەوسەری کۆڵانەکە رادەما، کەتەماشای لووتکەی پیرەمەگرونی دەکرد بە کوڵ هەناسەی هەڵدەکێشاو پێی دەوتم:

ـ حەمەکە.. چەند خۆشە جووتێ باڵت پێوە بێت و تاسەر ئەو لووتکەیە نەوەستیت، ئەنجا کوێی ترو لای کێت پێ خۆش بێت بۆی بدەی لەشەقەی باڵ، هەرساتە لە جێگایەك و هەرتاوە لەبن دارو لەسەرکانی‌و ئاوێك بیت.

قالە ووتی:

ـ جاتۆ لەم قسانە دەگەیشتی؟

ـ حەزم لێ بوو، بەلام کەمتر چێژم لەمەبەستەکە وەردەگرت،

- بەڵام فێری بیرکردنەوەیان کردی؟
- بێگومان، شەوان کەسەیری ئەستێرەکانم دەکرد هەموو وشەکانیم لێ دەکەوتنە درەوشانەوە، جار جاریش پرسیاری ئەوشتانەم لێ دەکرد کەتێ یان نە دەگەیشتم.
- ئەی لەگەڵ دایك و باوکیا چۆن بوو؟
- کەمتر بۆیان ئەدوا، کە کەسی لا نەبوایە یان هەر رادەما، یان کتێبی دەخوێندەوە، بەتایبەت دیوانی شیعر، من بۆ یەکەمجار ناوی نالی و مەحویم لەوە وەبیست، بەدەنگەوە شیعرەکانی مەحویی دەخوێندەوە.
- دوایی؟
- بێ دەنگی و خۆ خواردنەوەی غەریب تائەهات زیاتر ئەبوو، ئەومەیلە گەرم و گورەی جارانیشی لەگەڵ مندانەما، بابڵێم زۆری نە دەدوانـدم، بەڵام لە چاویا شتێکم دەبینی کەنەم دەتوانی بەدەم بیڵێم، ئەمزانی نهێنیەکە، بەڵام چیە؟ نەم ئەتوانی دەستی بخەمە سەر، ئەنجامیش هەر سەیر کەوتەوە.
- خۆی نەکوژێت؟
- هەرگیز لەو باسانە نەدەدوا، هەموو گیانی پڕ بوو لە خۆشەویستیی ژیان، من وا ئەزانم ئەگەر غەریب قاچی وا نەبوایە مرۆڤێکی زۆر ناودار دەردەچوو.
- کە قاچت نەبێت نابێ بژیت؟
- ئەو هەمووشتێکی خۆی لەوەدا ئەبینی، وای هەست ئەکرد کۆترێکەو هەردوو باڵی شکاوە، حەزی لە باڵ گرتن بوو، گەران، نەوەستان.
- بەتایبەتی وازهێنانی خونچەیش ئەوەندەی تر ئەوراستیەی لا چەسپاندووە، وانیە؟
- بێگومان، ئەوە بیرکردنەوە هەڵەکەی خەڵکیە کە دەیەوێت ئەوکەمەی راستیەکەی لایە بە هەڵەیدا بەرێت.
- دەی... ئەم غەریبە سەیرەی تۆ؟
- راوەستە، ئا.. وەك لەبیرم بێت سەر لە بەیانی رۆژێکی هاوین بوو، چەند رۆژێك بوو نەچوو بووم ماڵی کاکە غەریب، پوورمەنیجی دایکی بە پەشۆکاوی هات و چەند ورتەیەکی بە گوێی دایکمدا چرپاند، دایکم راما، پاشان بە جووتە رۆیشتن. منیش خۆم بۆ نەگیراو دوایان کەوتم، کە گەیشتمە ناو حەوشەی ماڵەکەیان یەکسەر بەرەو ژوورەکەی غەریب چووم، دیارنەبوو، کەوتمە سووسەو گوێ هەڵخستن، ئەوەندە تێ گەیشتم کە باوك و دایکیشی لەسەرو سۆراخی ئەودان و نازانن چی بەسەر هاتووە، بەوبەیانیە هەموو ناو بازارو مەیدانی وڵاخ و خانەکەی نزیکیشیان چوونەتە گەراجەکەو مزگەوتەکانی نزیکیش نەیان دۆزیوەتەوە، هەرکە خۆروبان گەرم بوو ماڵ لە کۆڵانەکەدانەما نەکەوێتە قسەو گەران و هەواڵ پرسین، ئیتر غەریب بوو بە بەردی بن گۆم، نە رۆژێك و نەدوان و نەدە، باوك و دایکی چاوی بێ فرمێسکیان لێك نەدەناو، شەوو رۆژیان دابووە دەم یەك، نە دەنگ و نەرەنگ. هەر کەسە لای خۆیەوە شتێکی ئەوت و ، ون بوونەکەی غەریب بووە مەتەڵی سەردەم و لانەی جاڵجاڵۆکە. سەرسامیو دڵە راوکێی خەڵکەکە پڕ بەپڕی هەموو ماڵێك بوو. ناهەقیشیان نەبوو، کورێك بە دوو قاچی مردووەوە ئەتوانێت بۆ کوێ بچێ؟ بەتایبەت غەریبیش کە هەر لەماڵ نەدەهاتە دەرەوە. سەدان گومان و باسو خواس خەڵکەکەی لە گێژەندا راگرتبوو، تاماوەیەك شەوانی هەرە درەنگیش غەریب پێڵوی تێ شکاوی چاوی خەومان بوو، لە خەویشدا هەدای نە دەداین.
- هەر نەبوو؟
- نەخێر، بەڵام لە مەسەیرتر بەزمی - خونچە - بوو
- خونچەیش سەری هەڵدایەوە؟
- بەڵێ، پاش چەند مانگێك ناوی خونچە کەوتەوە سەرزمانی خەڵکی، مقۆ مقۆنا ئەهات زیاتر ئەبوو.
- ئەمیش گوم نەبووبێت؟
- خونچە دوای ئەو کارەساتە ژنە جوان و شۆخەکەی جاران نەما، رەنگی ببووە گەڵای زەردی پاییز، گۆنا سپی و خڕپنەکەی بە قووڵاچوو بوو، من کە بەرقەوە لیم ئەروانی هەمان نهێنیەکانی چاوی غەریبم لە چاوی ئەویشدا دەبینی، ئەمەم لا سەیر بوو، هەستم بەوە ئەکرد خەریکە بەزەییم پێیایدا بێتەوە، ئەو جانەوەرەی غەریبی سەرنگوم کردو بۆ مەمیشە منیشی خستە ناو گومان و ترسەوە.
- ئەشێ لە شووکردنەکەی پەشیمان بووبێتەوە؟
- لای دایکم ئەوەی درکانـد بوو کە لەحەوشەکەی خۆیاندا لەشەوێکی تاریکدا غەریبی دیوە، غەریبی کەڵەکەت و مەچەك ئەستوور، کەوەك درەختێك لە بەردەمیا چەقیوە، ئەم رای کردوەو دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە داخستووە، کەچی رۆژێکی تر

بەڕۆژی نیوەڕۆ بە تەنیا دیویەتی، گوایا غەریب هاتۆتە ژوور سەری ڕاوەستاوەو بێ دەنگ چاوی تێ بڕیوە، ئەم کەوتۆتە هاوارو ڕای کردۆتە کۆڵان، لەگەڵ یەک دووژنی دراوسێیاندا هەموو ژوورو حەوشەکە گەڕاون و هیچیان نەبینیوە، ژنەکان پێیان و تووە: ئەوە خەیاڵی خۆتەو هیچی تر. شەوانیش خونچە خەوی لێناکەوێت، هەر کە ئەیەوێت وەنەوزێک بدات ڕائەپەڕێ و ئەکەوێتە هاوار کردن، ناوی غەریب دێنێت، مێردەکەی لێی کەوتۆتە گومان و پێی وتووە! تۆ خەریکە شێت ئەبیت، وابڕاوا لە گەڵتا ناژیم.

ئیتر هەر کە کۆڵان و گەڕەک ئەمەیان بیست دیسان باسی غەریب بووەوە بە چیرۆکی زیندووی هەموو ماڵێک بەڵام نەک وەک جاران،

- غەریب قاچی چاک بۆتەوەو شەوانە درەنگ بە کۆڵاندا دەگەڕێت.

- غەریب هەمووشەوێک دەڕواتەوە لای باوک و دایکی بۆیەوا کڕو بێ دەربەستن.

- غەریب بۆتە فریشتەیەکی سپی پۆش و هەموو شەوانێکی هەینی لە قسنەکەی شێخ مستەفادا زیکر ئەکات.

- غەریب چۆتە خەوی شێخ عەلی و پێی وتووە ئێوە تاوانبارن و خانووەکانتان بەسەردا ئەڕوخێنم.

- غەریب بە خونچەی وتوە: کچە یەک ساڵەکەت ئەکوژم.

ئیتر غەریب بوە فریشتە بۆلای لایەی منداڵ و جنۆکەیش بۆ ترساندنیان.

- ئەی خونچە؟ دیارە مەسەلەی ئەویش بەرە و گرێ کوێرەیی ئەڕوات؟

- خونچە بوو بەداسک و دەرزی، چاوە وێڵەکانی بە هیچەوە نە دەگێڕسانەوە، ڕۆژنە بوو لەماڵ و مێرد ڕانەکات و نەگەڕێتەوە کۆڵانەکەی خۆمان. بەرانبەر بەماڵی غەریب دائەنیشت و مت دەبوو، لە دەرگاو ناو حەوشەکەیان ڕادەما، کە دایکم و باجی مەنیجی ئەبینی دەستی بەداوێنیانەوە دەگرت و ئەکەوتە لالانەوە، کەمنیشی ئەدی ئەی گرتم و لە بەردەمیدا دای دەنا، ماچی دەکردن، یادگارەکانی نێوان خۆی و غەریبی بێ دەگێڕامەوە، من ماندوو دەبووم، خۆم لێ دووردەگرت، ئەو هەرپێمەوە دەنووسا، دەهاتە ماڵەوە، تابەیەک جاری وازی لە مێردەکەی هێناو هاتەوە ماڵی دایکی، ئەی ووت: (غەریب لە هەموو شوێنێکدا بەدوامەوەیە تەنیا لەم ماڵەدا نەبێت) ووردە ووردەیش وازی لە کچە بەرەمکانەکەی هێناو کەوتە ناو کۆڵان و شەقامەکان، هەر پیاوێکی بدیایە هاواری غەریبی لێ دەکرد وای لێهات کەمتر ڕێگای بکەوێتەوە کۆڵانەکەمان، کە ئە یش هاتەوە لە دەوری کۆنەبووینەوە، ئەمان دوان، هەندێ جار لێم ڕائەما، چاوی لە نێو چاوم دەبڕیو پێی دەوتم.

- حەمە کە گیان، ئەوە غەریب لەناو چاوتاچی دەکات؟ کە چاوم دەتروکاند ئەی وت:

- ئا.. ئا حەمەکە، ئەوە غەریب بوو بە فرمێسک و لە نێو چاوتەوە هاتە خوارێ، نەکەی بهێڵی بکەوێتە سەرزەوی،ئیتر ئەکەوتە گریان و هەڵدەستا، ئەچووەوە بەردەمی ماڵی غەریب و دەستی بەدەم ڕو دیواریدا ئەهێنا، کە ماندوویش دەبوو هەر لە بەردەرگاکەیاندا کروشکەی دەکرد، خەوی لێ دەکەوت، هەندێ جار فریای دەکەوتن و دەیان بردە ژوورەوە.

تاتەواو پێستی بەسەر ئێسقانیدا ووشک بوەوەو، لەشەوێکی ساردی زستاندا هەر لە بەر دەرگاکە ڕەق هەڵهاتبوو، تەنیا منداڵێک بووم‌کەلەگەڵ چەند پیاوێکی کۆڵانەکەدا بەشداری ناشتنیم کرد، گۆڕەکەیم کرد بەنیشانە بۆ سەردانی هەموو ڕۆژانێکی هەینی خۆم و دایکم.

قالە دەستی نابووە ژێر چەناگەی و ببووە بەردێکی لارێ، چاویشی وەک لەنگەری گرتبێت ئەت وت دەستکردن و بێجگە لە کۆمەڵێک پرسیار هیچیان تیا بەدی ناکرێت، پێم وت:

- مەرگ زۆر کارەسات و مرۆڤی ئەفسانەیی لەکۆڵ ئەکاتەوە، هەندێک جارتاقە نەجاتێکە کە مرۆ خۆزگەی پێ دەخوازێت، ها... چاوزیت.. وانیە؟

-....

- بۆ قسەناکەیت؟

- غەریب؟

- غەریب! دیارە پەلەتە؟

- زۆر.

- کێ ناڵێ تا ئێستایش چارەنووسی غەریب مورووی نێو گۆماوێکی لێڵە؟

- دوای چل ساڵ؟

- هەر تەواو دوای چل ساڵ.
- نابێت.
- بۆ نابێت؟
- ئەی ئەشێ بووبێتە فریشتەیان جنۆکەو لەبەر چاوون بووبێت؟
- چیرۆکی غەریب هەر وامایەوە، زمانێك بوو لە هەموو دەمێکدا دەگەڕا، دەچوە خەوی ئێم و شەوان بە بەردەمی ئەویاندا تێدە پەڕی. ژنانیش کە شەوانی هەینی دەچوونە سەر شێخ مستەفا هەریەکەیان بە چیرۆکێکی غەریبەوە دەگەڕایەوە. لای خەڵکەکە غەریب ببـووە گۆچـان بەدەستێکی پەل ئەستـوور، لەسەری کۆڵانـەکـەدا ئەوەستا و چاوی لە خانوەکەی خۆیان دەبڕی، ئەبـوە روونـاکیو لە قسنەکەوە پرشنگی دەهاویشت، لەسەر ڕێگای شارو گوندەکانی نزیکدا پاسەوانی کاروان و ڕێبوارەکان بوو، بووك و زاوای بەڕێ دەکرد، دەستی لەڕێ گروپیاو خراپ دەوە شاند، نوقڵی بە منداڵە وورد کە دەدا، لە جەژنیشدا خۆی دەگۆڕیو ئەبووە میوانی ماڵەکانی گەڕەك، ئیتر غەریب سەری زمان و بنی زمان بوو.
- ئەی تۆ؟
- من هەر گوێم دەگـرت، باسەکانم لاخۆش بوو، وام هەست دەکـرد هەمیشە غەریب لە ژێر سەرینەکەم یان لەناو جانتای کتێبەکانمدا خۆی شاردۆتەوە.
- ئەی هیچت دەدی؟
- نازانم، بەڵام لای خۆمەوە وام دادەنا کە غەریب لە پشتمەوە دەڕواو هەندێك جاریش دەبێتە سێبەرم.
- دوایی؟
- دایك و باکی دوای هیوا بڕان خانوەکەیان فرۆشت و بۆ دواجار گەڕانـەوە گونـدەکـەیـان، ئەو ڕۆژەی خۆیـان پێچـایـەوە کارەسـاتـەکـەی غەریب تازە بوەوە. خەڵکـەکە وایان دەزانی بەرۆیشتنی ئەوان مۆتـەکـەیـەك چوك دا دەداتە سەریان، تا ئێستـا کەمـاون لە چاوی ئەوانەوەیە، کەچی دوای دوومانگ تارمایی غەریبیش کەوتە ڕەوینەوە، بوە هەواڵی نێوان ڕاست و درۆ، بەڵام لای من غەریب هەرزینـدو بوو، مرۆڤێك بوو وەك خۆم؛ لەگەڵما دەژیا، بەخۆی و بیرو قسەکانیەوە. تا ئەو ڕۆژەی مام عەلی هەواڵە سەیـرەکەی گەیاند، ئیتر غەریب وەك جاران بوەوە بە کورە بێ قاچـە غەمبارەکە کە بەسەر کەساسی و بێ توانایی خۆیدا ئەگریا.
- ئەمەیان چیبوو؟
- مام عەلی قەسابێکی کۆڵانەکەمان بوو، غەریبی ئەناسی، لەگەڵ هاورێیەکیدا کەلەحەیوان کرین دەگەڕێنەوە، لە لارێیەکی نزیك بە قسەبخانە لاشەیەك ئەبینن، وەك باسی دەکرد لاشەکە لە ژێر خاکدا بوەو باران و خستویەتیە دەرەوە، لاشەکە زۆرشێواوە، لەگەڵ برادەرەکەیدا گۆڕێکی بۆ هەڵدەکەنن وتێی دەخەن، گوایا ئەوە لاشـەی غەریب بووە. هەندێك لەلاوەکانیکۆڵانەکەمان هەواڵی شوێنـەکـەیان پرسی، ویستیان بۆ دڵنیا بوون چاڵەکە هەڵبـدەنـەوە، بەڵام مام عەلی و هاورێکـەی نەیـان ویست شوێنەکەیان پیشان بدەن و هەروا بەنهێنی هێشتیانەوە.
- ئەی هەبوو بروا نەکات؟
- زۆر، هەبوو دوای چەند ساڵێکیش باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن غەریب هاتـۆتـە خەوی پێیو توە مام عەلی درۆ ئەکات و من نەمـردووم، شەوانـە لە خانـوە چۆڵەکەی خۆماندا ئەخەوم و تادرەنگانیش ئاگاداری کۆڵانەکەم.
- ئەی تۆ؟ ئەی خانوە چۆڵەکە؟
- کەس نەی ئەوێـرا خانوەکە بکرێ، هەروا بە چۆڵی مایەوە، تانـاوی غەریب وردە وردە دایـە نەهاتی، ئەوسا خاوەنەکەی خانوەکەی رووخاندوکردی بەو دووکانانە.
- غەریب بوو بەمـەسـەلەیەك، یان ئەفسانەی نێو عەقڵەکانی ئەوسا، تۆ ئێستا بروات بەوشتانە نیە.
- هەرگیـز وا مەزانە، ئێستایش کە سەر لەو کۆڵان و خانوانە ئەدەم غەریـب ئەبـیـنم، غەریب پەرێکی کۆمـاوەی گۆچـان بەدەستی ریش سپیـە، لەسـەری کۆڵانـەکـەدا دانیشتـوە، پەریـژنێکیش پەلکە سپیەکانی هۆنیوەتەوەو لە پاڵیا دانیشتوە، هەردووکیـان چاویـان بریـوەتـە ئەو دووکـانانەی لە جێگای خانوەکەدا کراون، منیش منداڵە دەدوانزە ساڵیەکەی جارانم، پەرێژنەکە کەمن دەبینێت ئەبێتەوە بە خونچە شۆخەکەی جاران، غەریبیش کورێکی قۆزی باڵا بەرزە، بەڵام لەباتی ئەوەی بەپێ بروات دووباڵی سپی لێ رواوەو بە هەموو لایەکدا دەفرێت.
مایسی ۱۹۸۹

# داڕەشتنەوەو خوڵقاندنی ئەفسانە لە شیعری نوێی کوردی دا

کەریم مستەفا شارەزا

پێشەکی :-

ئەوەی سەرنجی شیعرناس و رەخنەگری ئەدەبی نوێی کوردی رادەکێشێ، دیاردەی گەڕانەوەی شاعیرە نوێکارەکانە بۆ باوەشی کە لە پووری نەتەوایەتی خۆیان وبۆ جیهانی بێ پایانی کەلەپووری میللەتان، بەنیازی سوود وەرگرتن لە رەگەزە پتەوو زیندووەکانیان، بۆ خوڵقاندنی داهێنانێکی نوێ لە شیعری تازەی ئەدەبی نەتەوەیی‌یان و، بەتەواوی لەوە گەیشتوون کە کەلەپووری میللەتان موڵکی مرۆڤایەتی‌یەو : لایەنە هاوبەشەکانی تاسەر لەناو قاوغی نەتەوە ومیللەتێک دا نامێننەوە، بەڵکو لە سنووری خۆماڵێ دەردەچن وخۆیان لە جیهانی فراوانی مرۆڤایەتی‌دا دەدۆزنەوە.

لەو رەگەزە کەلەپوورەی کە شاعیران پتر ئاوڕیان لێ داوەتەوە و لە شیعری نوێدا بەکاریان هێناوە، ئەفسانەیە، بۆ قووڵ کردنەوەی ماناو رازاندنەوەی وێنەی شیعریی لە هۆنراوەکانیان دا چەسپاندووەولەلای شاعیری نوێکار ئەم کردارە سەرکەوتووانە ئەنجام دراوە.

ئەم کردارەی بەکار هێنانی ئەفسانەی میللەتان لە شیعری کوردی‌دا لە دووای جەنگی یەکەمی جیهانی دەستی دراوەتێ وچەند شاعیرێکی نوێخواز، لە چەند هۆنراوە یەکیان دا بەکاریان هێناوە، بەڵام بەکار

هێنـانەکەیان لە سنووری لێکچوواندن یاخود ململانێی نێوان هێزە دژ بەیەکەکانی ئەفسانە دەر نەچووە.
دوای ئەم شاعـیرە نوێ خوازانە گەلێك شاعیری دیکە هاتن و بەچاکی ئاوریـان لە ئەفسـانـەو رەگـەزەکانی دایەوە و، لەناو هۆنراوەکانیان دا بەکـاریـان هێنان. بەڵام تا ناوەراستی ساڵانی حەفتاکان بەکار هێنانی ئەفسانە لە شیعری کوردی‌دا گۆرانکاری‌یەکی ئەوتۆی بە خۆیەوە نەدی، تاکو چەند شاعیرێکی نوێ کاری لێ هاتوو هاتن و، بە شێوەیەکی نوێ دەسکاری ئەفسانەو رەگەزە کانیان کرد و لە قاڵب وچەمکی نوێ‌دا دایان رشتەوە و لە هۆنراوەکانیان دا بەکاریان هێنان و، لەدواییش دا هەندێك لەو شاعـیرە بەهـرەدارانە، دەستیان دایە خوڵقاندنی ئەفسانەی نوێ و لە شیعـری تازەیـان دا بەکـار هێنـا، یان ئەفسانە نوێیەکەیان بە شیعر دارشت. بەمـە دەرگای جیهانێکی تازەیان لە شیعری نوێی کوردی‌دا کردەوە. ئێمەش لەمەو دووا پێ بەپێ لەم دیاردە شیعری‌یەوە دە دوێین ونموونەیان بۆ دەهێنینەوە.

## ئەفسانە چی‌یە ؟

**لەراستی‌دا ئەفسـانـە پێناسەیەکی ورد و دیاری کراوی نی‌یـەو، بە ئاسـانی سنوور بۆ شکڵ وچەمکی دانانرێ، بەڵام ئەگـەر بمـانـەوێ پێناسەی لە باری بکەین، ئەوا دەتـوانـین لێرەدا بەپـێـی بیروڕای هەنـدێ لە زانـا پسپـۆرەکـانی فۆلکلۆر ومیثـۆلۆژی چەنـد پێناسەیەکی گشتی بۆ دەخەینەروو. هەیە دەڵێ:ـ**
**«ئـەفسـانـە حیکـایـەتی خواوەنـد ونیمچـە خواوەندو بوونەوەری سەیر و عاجباتی‌ی لە رادە بەدەرەو بەپێی لێکـدانـەوە وبۆ چوونی ئادەمیزادێ بەرایی دیاردەکانی ژیـان و سروشت وگـەردوون و سەرەتـاکـانی زانیـاری مرۆڤایەتی لێك دەداتەوە[1] »**

هەنـدێ لە زانـایـانی میثـۆلۆژی لەو باوەرەدان کە ئەفسانە جۆرێکە لەو حیکایەتە پڕ ئامۆژگاری‌یانەی کە مرۆڤ هان دەدەن بۆ گرتـنـی خووڕەوشـتی باش و، خۆلادان لە کارو کردەوەی خراپ. هەندێکی دیکەش لەو باوەرەدان کە ئەفسانە نیشانەو دیاردەکانی سروشت دەنوێنێ و، هەر ڕووداوێك لەو حیکایەتە ئەفسـانـەیی‌یـانە جۆرە رەمزێکن بۆ دیاردە سروشتی‌یەکانی دەوروبەری کومەڵگای ئادەمیزاد[2] .
خۆ ئەگـەر لە ڕوانگەی تێ ڕوانین و لێکدانەوەی میثولۆژستە نوێ‌یـەکانەوە سەیری دەورو نرخی ئەفسانە بکەین، دەبینین هەندێکیان لەو باوەرە دان کە ئەفسانەی جیهانی کۆن، یەکێك لە کرداره گیـانی‌یـە هەرە گەورەکـانی ئادەمیـزاد دەنوێنێ و دروسـت کارێـکـی سرووش بەخشی عەقـڵی شاعـیرانـەی بەهـرەداره[3] . هەیـە لەوەش زیـاتر دەروات و دەڵێ: ئەمرۆکە ئەفسانە هەر لە رەگەز و ململانێی کۆنی خواوەند وبوونەوەرە سەیر عاجباتی‌یەکانی جیهانی کۆن خەڵق نابێ، بەڵکو بۆمان هەیە لە هەموو شتێکی ناو ئەم جیهان و گەردونەدا بیخوڵقێنین، چونکـە هەمـوو شتێـك بۆی هەیـە لە بارێکی داخـراوو بێ دەنگی‌یەوە بخرێە بارێکی کراوەی وا کە بدوێ وبجووڵێتەوە و جۆرە سرووشێـك ببـەخشێ[4] ، کاری عاجبـاتی ئەنجام بدات وسەرنجی خەڵکەکە بە چاکی رابکێشێ.

بۆ نمـوونە: هەر چەندە درەخت هەر درەختە، بەڵام هەموو دەمێکیش هەر درەختێکی رەق ورووت نی‌یە، بەڵکو پەیوەندیی بە گەلێك وێنەو ئەدەبیات و شۆرش وگۆرانکاریی‌ی ئادەمیزادەوە هەیـە. بە کورتی هەمـوو ماددەیـەکی ڕووت و پەتی لە لای ئادەمیـزاد بە کار هێنـانێکی کۆمـەڵایـەتی هەیـەو[5] ، کەسی هوشیـاری هونـەرمەند دەتوانێ سوود لە سرووشی ئەو بەکار هێنـانـەی وشێوەو سروشتی وەرگرێ و، لە ژیانی کۆمەڵایەتی وڕۆشنبـیریی کۆمـەڵەکەی‌دا گەلێك کاری نوێی پێ ئەنجام بدات و داهێنانی پتەو وە دەست بێنێ و، هەر لەم ڕووانگەشەوە شاعیری بەهرەدار بیر لە خوڵقاندنی ئەفسانەی نوێ دەکاتەوەو لە شیعرەکانی‌دا بەکاری دێنێ.

## پەیوەندیی ئەفسانە بە شیعرەوە ..

هەندێك لە رەخنەگرانی ئەدەبی هاو چەرخ لەو بارەرەدان کە شیعر وئەفسانە پەیوەندی‌یەکی بە هێزیان لە نێوان دا هەیە. هەردووکیان لە بنەرەت دا دەچنەوە سەر یەك سەرچاوە. چونکە

ئەفسانە لەو سەردەمەدا پەیدا بووە کە میللەتان نەك بە بیری ئاسایی، بەڵکو بەوێنەی شیعریی بیریان کردۆتەوەو لە شت گەیشتوون[٦] و، هەر لەبارەی پەیوەندییی بە هێزو پتەوی ئەفسانە بە شیعرەوە، فەیلەسووف وزانای سۆسیۆلۆژی (ڤیکۆ) ١٦٦٧ ـ ١٧٤٤ لە بارەی شیعرو ئەفسانەوە دەڵێ:ـ

**«ئەندێشەو شیعر لێك دی جودا ناکرێتەوە، بە بیرو رای ئەو (شیعرو ئەفسانە) بەرهەمی ئەندێشەی ئادەمیزادن و، شاعیری هۆنراوە وداهێنەری ئەفسانە لە جیهانێك دا دەژین وخاوەنی یەك جۆرە بەهرەن[٧]».**

بەم پێیە شاعیری لێ هاتوو لە دەستی دێ هەروەك هۆنراوەیەکی نوێ دابنێ، بەهەمان شێوە وتواناو کرداریش ئەفسانەیەکی نوێ بخوڵقێنێ، چونکە سەرچاوەی هەردووکیان بەهرەو ئەندێشەی قووڵیەتی.

گەرانەوەی شاعیرە هاوچەرخەکانی گێتی لە سەدەی بیستەم دا بۆ ئەفسانە، ئەو راستییە دەسەلمێنێ کە هەستێکی نوێ لەلای شاعیری هاوچەرخ خوڵقاوە بەرامبەر بە رابوردوو بە هەموو رووداوەکانییەوە. ئەم گەرانەوەیشی لە ئەنجامی سەرهەڵدانی تەنگوچەڵەمەی ئادەمیزادی نوێ لە سایەی شارستانێتیو، پێشکەوتنی زانست و تەکنێکی نوێدا رووی داوە[٨].

### تاقی کردنەوەی ئەفسانەیی لە شیعردا.

**هەر وەکو زانراوە ئەفسانەی میللی، بەر ی تاقی کردنەوەی ئادەمیزادی بەراییەو ، ئەو تاقی کردنەوەیەش هەڵوێستی ئادەمیزاد بەرامبەر بە هێزی سرووشت وخواوەندی خەیاڵی و، رووداو دەردەبرێن و، نووسەر و شاعیر بۆیان هەیە تاقی کردنەوەی ئادەمیزادی بەرایی وەربگرن و لە نوژەن پەیکەری کاری ئەدەبی نوێیان لەسەر بنیاد بنێن، بە مەرجێك بە چاکی لە رەمز و ماناکانی بگەن و بە جۆرێکی هاوچەرخانە بەکاریان بێننەوە[٩]، بەرگێکی تازەیان لە بیرو ئەندیشەی بە پیتیان بە بەردا بکات، تاکو داهێنانێکی نوێ لە کرداره شیعرییەکانیدا**

**بخوڵقێنن.**

سوود وەرگرتن لە ئەفسانە بۆ تاقی کردنەوەیەکی نوێی شیعری تازە، لە سەردەمی پرناسییەکانەوە لە ئەورووپا کەوتەوە باو، لەدووایی‌دا گەلێك شاعیری هاوچەرخی رۆژئاوایی وەك (ت.س ئیلیوت) ١٨٨٨ـ١٩٦٤و (ئیدث ستوێل) (١٨٨٧ـ....) خۆیان لەو سوود وەرگرتنە کرد بە خاوەن و، تاقی کردنەوەی ئەفسانەییان لە شیعردا کرد، بەتایبەتی شاعیری گەورەی وەکو (ئیلیوت) بە تەواوی ئاوری لە نرخی ئەفسانە لە شیعردا دایەوە. بۆیە هەستا گەلێك لە ئەفسانەی کۆنی جیهانی لە هۆنراوەکانیدا بەکار هێنا و تاقی کردنەوەیەکی سەرکەوتووی ئەنجام دا وقووڵییەکی سایکۆلۆژی بە شیعرەکانی خۆی بەخشی[١٠].

## تاقی کردنەوەی ئەفسانەیی لە شیعری نوێی کوردیدا

**مێژووی گەرانەوەی شاعیری نوێ کاری کورد بۆ جیهانی ئەفسانەو سوود وەرگرتن لە رەمزو رەگەزەکانی، دەگەرێتەوە بۆ قوناغی نێوانی جەنگی یەکەم و جەنگی دووەمی جیهانی، کە شاعیرێکی نوێ کاری وەکو گۆران (١٩٠٤ـ ١٩٦٢) دەستی دایە ئەم جۆرە تاقیکردنەوەیەو لە هۆنراوەیەکیدا بەناوی (دیاری خوای شەر) بە چاکی لێی سەرکەوت . هۆنراوەکەی بەبۆنەی بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانەوە داناوە، لە کارە شەرانیو وێرانکاریەکانی (خواوەندی شەر)ەوە دوواوەو لە ساڵی ١٩٥٠ش دا لە هونراوە درێژەکەی (لاوکی سوور بۆ کۆریای ئازا) بە چاکی لەو تاقیکردنەوەیە مەعلان بوو، هەردوو رەمزی هێزی خێرو هێزی شەری بەکارهێناو، ململانێی نێوان ئەو دوو هێزە دژ بەیەکەی بەجوانی دەربری و نەچوو تەنها رەمزی بێگانە بەکاربێنێ ، بەڵکو ئاوری لە رەمزی ئەفسانەی خۆماڵی کوردی دایەوەو لە کارەکەیدا ململانێی نێوانی هێزە دژ بەیەکەکانی دەربری ولێی سەرکەوت.**

دوای ئەم ڕچە شکاندنەی (گۆران) بۆ تاقی کردنەوەی ئەفسانەیی لە شیعردا، شاعیرە نوێ کارەکانی دیکەش سەرکەوتووانە دەستیان دایە بەکارهێنانی ئەفسانە لە هۆنینەوەی شیعری نوێدا. بەڵام ئەم کارەیان لە سنووری بەکارهێنانی ڕەمزەکانی ئەفسانە دەرنەچوو و، زۆر جاریش تەنیا بەرامبەر یەك گرتن بوو، بەبێ ئەوەی کرداری ململانێیان بەجۆرێکی کاریگەر تێدا بخولقێنرێ، یاخود دارشتنەوەو خولقاندنێکی نوێی لێ ئەنجام بدرێت . تاکو لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە دەستەك لە شاعیرە نوێ کارەکانی کورد هاتن و گەلێك تاقی کردنەوەی بە پیتی ئەفسانەیی یان لە کرداری شیعریدا کردو، سەرکەوتنێکی دیارو بەرچاویان وە دەست هێنا و کارە هونەرییەکەشیان لە دوو تەوەرەی سەرەکیدا دەسووڕێتەوە:-

١- دارشتنەوەی ئەفسانەی کۆن.
٢- خولقاندنی ئەفسانەی تازە.

## دارشتنەوەی ئەفسانەی کۆن لە شیعری نوێدا

لەم دە پازدە ساڵەی دواییدا، شاعیری نوێ کاری کورد، دەستی دایە کارێکی هونەریی لە دارشتنەوەی ئەفسانەی کۆن لە هۆنراوەی تازەیدا و، لە پێناوی وە دەست هێنانی ناوەرۆکێکی بەهێز و پتەوی شیعرەکانی چووە ئەفسانەی کۆن (چ بیانی ، چ خۆماڵی) هەڵوەشاندۆتەوەو سەر لە نوێ بەجۆرێکی کاریگەرتر دای ڕشتۆتەوەو بەشێوەی وێنەی گەش و جوانی شیعری پێشکەشی کردووەو داهێنانێکی سەرنج ڕاکێشی خولقاندووە.

ئەم دارشتنەوەی ئەفسانەش لەلایەن شاعیری نوێ کارەوە دوو قاڵبی سەرەکی وەرگرتووە:

أ) قاڵبی دارشتنەوەی(پۆزەتیف):- واتە بەپێچەوانەی بنیات و کرداری ڕەمزەکانی ئەفسانە کۆنەکە.

ب) قاڵبی دارشتنەوەی (نێگەتیف):- واتە بەهەمان بنیات و کرداری ڕەمزەکانی ئەفسانە کۆنەکە.

لێرەدا بۆ هەر قاڵبێکیان چەند نموونەیەك لە شیعری ئەو شاعیرە نوێ کارانەی کورد دێنینەوە تاکو خوێنەری بەرێز ئاگاداری کارە شیعری یەکان بێ.

### (أ). قاڵبی دارشتنەوەی پۆزەتیف:-

جاریوا هەیە شاعیر ئەفسانەیەکی کۆن هەڵ دەوەشێنێ، دەچێ سەر لە نوێ دای دەڕێژێتەوەو هەمان دەور بە ڕەگەز و ڕەمزەکانی ئەو ئەفسانەیە دەداتەوە، بەڵام ناچێ هەر بۆ هەمان مەبەست و لە هەمان بواردا بەکاریان بێنێ ، بەڵکو دەچێ لە قاڵبێکی نوێو، لە بوارێکی دیکەو بابەتێکی ئەم سەردەمەی ژیانی خۆی و کۆمەڵەکەیدا بەکاری دێنێو جۆرە داهێنانێکی نوێ لە جیهانی شیعرو ئەفسانەدا دەخولقێنێ.

● بۆ نموونە ئەم ئەفسانە دارشتنەوەی پۆزەتیف دەتوانین ئەم هۆنراوەیەی (صلاح شوان : ١٩٤٧) کە بەناوی (سیزیف هێشتا بەردەوامە) بهێنینەوە کە دەڵێ:-

**دڵدارەکەم**
**من سیزیفێکم گشت ڕۆژێك**
**بە پێپیلکانەی شکاوی**
**تیشکی گەرد گرتووی هەتاوا**
**بەرەو لای تۆ سەر ئەکەوم**
**لەگەڵ ئاوا بوونی خۆردا**
**پێپیلکانە ئەرووخێت و**
**منیش لە جێگەکەی دوێنێ شەوی خۆما**
**بەتەنیا بێ تۆ ئەخەوم !!**

شاعیری نوێ خواز چووە ئەفسانەکەی (سیزیف)ی گریکی هەڵوەشاندۆتەوە کە بریتییە لە هەوڵ و کۆشش و ململانێی (سیزیف) واتە : (ئادەمیزاد) لە پێناوی سەرخستنی تا شەبەردی (ئەرکی ژیان و نەمریی) بۆ سەر لووتکەی کێوی بەرزی هیواو ئاوات و جاویدانی و هەر جارێکیش بحەسێتەوەو

بنوێ، تاشە بەردەکەی گلور دەبێتەوە بۆ بنی کێوەکەو لەجێی جارانی جێگیر دەبێتەوە!

شاعیر چووە سەر لەنوێ لە کەرەستەو روو داوەکانی ئەو ئەفسانەیە، ئەفسانەیەکی تازەی دارشتۆتەوە، بەڵام نەك بە هەمان کردار و شێوەو بواری جارانی ئەفسانە کۆنەکە، بەڵکو ئەم جارە لە بواری دڵداریو عەشقی خۆیو یارەکەیدا ئەم تاقی کردنەوەیەی کردووە و یارەکەی کردووە بە لووتکەی هیواوئاواتی و لە شێوەی خۆری پرشنگدار دەری بریوەو باریکە رێی سەرکەوتنیشی کردووە بە پێپلکانەی گەرد گرتووی هەتاوو، هەموو رۆژێك لەگەڵ خۆر هەڵاتن دا بە هیوای گەیشتن بەدڵدارەکەی بەتیشکی گەرد گرتووی ئەو خۆرە سەردەکەوێ، کەچی نای گاتێو بەئاوات ناگات و، کاتێکیش کە خۆر ئاوا دەبێت، تیشکەکە نامێنێ، خۆی لە جێگەی دوێنی شەویدا دەبینێتەوە و بەبێ دڵدارەکەی بە تەنهایی دەخەوێ، بەو هیوایەی سبەی بەیانی لەگەڵ خۆر هەڵاتن دا سیزیف ئاسا دووبارە هەوڵی سەرکەوتنەوە بداتەوە،بەم جۆرە ئەفسانەیەکی‌نوێ دادەرێژێتەوە.

**● هەر لە بواری دارشتنەوەی پۆزەتیڤی ئەفسانەی کۆنەوە، دەتوانین ئەم هۆنراوەیەی شاعیری نوێکار (محەمەد ئەمین پێنجوینی ١٩٤٣) بکەین بەنموونەی ئەم جۆرە تاقی کردنەوەیە، کە بەناوی « مێژووی دەستەمۆ» دایناوە:**

شاعیر هەستاوە ئەفسانەیەکی (ئەکەدی)ی سەردەمی عیراقی کۆنی هەڵوەشاندۆتەوە، بەڵام نەچووە کت و مت وەکو خۆی دای رێژێتەوە بەڵکو لە خۆیەوە رەمز و دەوربینینی دیکەی خستۆتە سەر، بەڵام لە هەیکەلی گشتی ئەفسانەکەو دەوربینینی رەمزو کەسەکانی دوور نەکەوتووەتەوە، بۆیە هەر دەچێتەوە ناو چوار چێوەی دارشتنەوەی (پۆزەتیڤ)ی ئەفسانە، بام هەندێ گۆرانکاری بەسەردا هاتبێو، ئەفسانەکە لەم بەشەی هۆنراوەکەی

**شاعیری نوێکار (پێنجوینی)دا خۆی بەروونی دەنوێنی کە دەڵێ:ـ**

**خوای دەشتی چۆڵ**
**ملوانکەکەی بەرەو ئاسمان کە فرێدا**
**چووە ملی دوندی چیا!!**
**ئەوە پەلکە زێرینەیە**
**تاقی شەبەنگە بە رۆژە**
**خڕ وەکو بازن نەخشاوە**
**هەرچی نەیەتە بەر شەوقی**
**ئەکەوێتە بەر نەحلەت و**
**رقی خواوە!!**
**لەو رۆژەوە چیا نشین**
**ئەو بازنەیە بووە کۆت و**
**لە گەردن و مەچەك و دەستی ئاڵاوە**
**لەو رۆژەوە باخەوان و چێوارەکان**
**کەوتنە بەر پێی**
**دەڵە دێوی گورزو مێژوو!!**[١٢]

ئەفسانە ئەکەدی‌یەکە دەڵێ:« لە سەردەمی (نارامسین)ی شای گەورەی (ئەکەد)دا، شارێکی وەك بەهەشت لە پشت حەوت کێوی رۆژ هەڵاتی وڵاتەکەیان دا هەبووەو، ویستوویانە داگیری بکەن ، بۆیە لەبەر خواوەندیان پاراونەتەوە تاکو یارمەتی‌یان بدات بۆ گرتنی ئەو شارە ، ئەویش گەردانەیەکی فرێداوەو خستوویەتی‌یە گەردنی چیاو بووەتە پەلکە زێرینەو خەڵکەکەیان پێ ترساندووەو گوتوویانە هەرچی نەیەتە ژێری دەکەوێتە بەر نەحلەتی خواوەند! بەم جۆرە سەرکەوتوون و گەیشتوونەتە شارە بەهەشتەکە!!

ئەمە پوختەی ئەفسانە کۆنەکە بوو. کەچی شاعیر کە دای رشتۆتەوە، هەندێ زیادەی خستۆتە سەرو، گیانێکی نوێی بە بەردا کردۆتەوەو دەڵێ:ـ

« کە خواوەندی دەشتی چۆڵ ملوانکەکەی بەرەو ئاسمان فرێ داوە، چووەتە ملی لووتکەی چیاو، لەوێ بووە بە پەلکە زێرینەی خڕ وەك بازنی نەخشاوونەمە بووەتە نیشانەیەکی سامناك و خەڵکەکەی پێ ترساندراوە، بۆیە لەو رۆژە نەگبەتەوە چیانشین (کورد) ئەو بازنەی پەلکە زێرنەیان لێ بووەتە کۆت و لەو

سەردەمەشەوە خەڵکی چیانشین کەوتوونەتە ژێر پێی دێوی مێژووی زۆردار !!»

**کاتێک کە هەموو هۆنراوەکەی شاعیر دەخوێنینەوە هەست دەکەین هەندێ رتووشی ئەفسانە ئەکەدی‌یەکەی کردووە، لەوێدا باسی شارێک (بەهەشتێک) دەکرێت، کەچی لێرەدا باسی شارەکە نەکراوە و تەنیا ناوی چیا نشین و باخەوانەکانی کراوە کە مەبەستی لە (کورد)ە و، شاعیر جۆرە کۆتایی‌یەکی لەباری بۆ ئەفسانەکەی دروست کردووەو لە رێگەی چەند رەمزێکی نەتەوەیی میللەتەکەی بەتەواوی بە باری ژیانی ئەم دوایی‌یەی کوردی بەستۆتەوەو دەڵێ:ـ**

**(کەو) دروشمی نەیاری‌یە**
**گزنگی رۆژمان. لا تارە!**
**«ئەهرەمەزدا» مان خستە بن**
**چاڵە بەفری گەرووی (زامۆ)**
**بەم تەرحە بووینە (دەستەمۆ)**[13]

شاعیری نوێکار لەم چەند دێرە شیعرەی‌دا هەندێ رەمزی نەیاری و خۆخۆری گەلی کوردمان ، لە نموونەی (کەو)دا بۆ دەردەبڕێ و ، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە چۆن لە ژیانی ژێر دەستی دا تەنانەت گزنگی خۆریش بە تاریکی دێتە بەرچاوی خەڵکی چیانشین و، رەوشتی کورد وا گۆڕاوە، لەو سەردەمە زووەوە « ئاهوورە مەزدا»ی خواوەندی رووناکی و خێرخوازی بخرێتە بن چاڵە بەفرو، ئەمەش بووەتە هۆی (دەستەمۆ) بوون و ژێر دەستی کۆمەڵی چیانشین.

## ب.قاڵبی دارشتنەوەی نێگەتیڤ..

ئەگەر بمانەوێ نموونە بۆ دارشتنەوەی نێگەتیڤی ئەفسانە لە شیعری نوێی کوردی‌دا بهێنینەوە،ئەوا دەتوانین ئەم هۆنراوەیەی (سەلام محەمەد ١٩٥٤) بکەین بەنموونەی پڕ بە پێستی ئەم قاڵبە، کە بەناوی (گەشت و پێ ناسین )ە، شاعیر چووە ئەفسانەی لە کەلەپووری ئایینی وەرگرتووە، بەڵام لە جیاتی دەوری خراپەو شەڕانی بە (شەیتان) بسپێرێ، کە نموونەی هێزی شەڕە لە ئایینە ئاسمانی‌و نا ئاسمانی‌یەکانی‌دا، چووە دەوری چاکە و خێرخوازی‌و خزمەتگوزاری بۆ مرۆڤایەتی پێ دەسپێرێ و خۆی ئەو دەورە نوێیەی (شەیتان) دەبینێ‌و، لەبەشی چوارەمی هۆنراوەکەی‌دا دەڵێ:ـ

**من شەیتانم!!**
**لە گۆڕستانێک ئەگەڕێم بەبێ مردوو!**
**وەک پەپوولە**
**بەسەر تەنووری بێ گڕی هاوینی هەستیارەکانا**
**ئەخولێمەوە**
**بەناو باخی شیعرەکان ئەسووڕێمەوە**
**من شەیتانم !!**
**کە دەرکرام لەبەهەشتا**
**بەدوای گەشتێکا ئەگەڕێم**
**بێ رابواردوو**
**لە کوردستانێک ئەگەڕێم**
**بێ خەواڵوو!**
**لە ئەپۆللۆیەک ئەگەڕێم**
**بۆ مانگی ناو چاوی قیەتنام**
**سەرم بخات !**
**لە پێغەمبەرێک ئەگەڕێم**
**تەختی خوایەکم نیشان دات**
**راپۆرتەکانم وەرگری**[14] **!!**

پەیوەندیی ئەفسانەکەی (سەلام محەمەد) بە ئەفسانەی هێزی شەڕو شەیتانەوە، پەیوەندیی‌یەکی (نێگەتیڤ)ە، لەو کاتەی کە شەیتان حەز دەکات گۆڕستان پڕ مردوو بێت، وڵاتەکەی هەموویان لە ژیان دا بن و نەمر بن، لە جیاتی ئەوەی خراپەی شاعیرانی بوێ، هەوڵی دوور بوونیان لە ئازارو ئەشکەنجەیان بۆ دەخوازێ دەیەوێ بە خۆشی بەناو باخی شیعرەکانیان دا بسووڕێتەوە شەیتانێکی دەرکراوی بەهەشتە «

بەڵام ناچێ وەکو شەیتانی راستەقینە لە داخی دەرکردنەکەی، خراپەی هەموو ئادەمیزاد و وولاتێکی بوێ، بەڵکو بە پێچەوانەوەبەدوای کوردستانێکی هوشیاردا دەگەرێو، بەدوای پێغەمبەرێك دا دەگەرێ تاکو خوداوەندێکی نیشان دات و بروانامەی خۆی و نەتەوەکەی پێشکەش بکات و لەتاقی کردنەوە ئەفسانەیی یەکەیدا بەچاکی سەرکەوتن وە دەست دێنێ.

● **ئەگەر بەدوای نموونەی دیکەی دارشتنەوەی نێگەتیڤی ئەفسانەدا بگەرێین، ئەوا دەتوانێن ئەم هۆنراوەیەی شاعیری رۆشنبیری نوێ کار کاك (کەریم دەشتی ١٩٥٥) کە بەناوی (میدۆزا) یان راستر وایە بڵێین:**

(میدۆسا: Medusa) ی گریکی لەقاڵبی دارشتنەوەیەکی (نێگەتیڤ)دا بەکارهێناوە و بەشێوەیەکی پێچەوانەیی لەگەڵ ئەفسانە کۆنەکەدا مامڵەتی کردووە و دەڵێ:-

**لەخەوێکی نەمردا بوو**
**چاوەکانی بریبوە ئەو درەختانەی**
**تامی بارانیان نەکرد بوو**
**قاچی لەزەمین دووری بوو، تاوی دەدا**
**برووسکەی ژێر سمی ئەسپی**
**وەکو ئاوێنەی ئەبەدەی**
**ساماڵی بە ئاسمان دەدا**
**گیانی شەلاڵی ئارەقەو لەزەت بوو بوو**
**زستانی لە پەرەنگی خۆی دەشاردەوە**
**زریانی لە خۆی لوول دەدا**
**چاوەکانی وەك دوو پشکۆی تەوورەی**
**چاخە بەردینەکان**
**دریان بە دارستان دەدا**
**تاشە بەردو کەڤری دەکردەوە مرۆڤ**
**بە دۆڵی مێژووی وەردەکرد**
**پرچی مێژووشی دەکردە کەزی یە مارێ**
**لە لوو لاقی خوای گیر دەکرد**
**کەونی بە دڵ و پەرەی خوێن**
**گەورە دەکرد..**
**سیستەمی ئەو سروشتانەی**
**لە بنەرەتەوە تێك دەدا**[١٥]!!

ئەفسانەی (میدۆسا)ی گریکی دەڵێ: «کچێکی یەگجار جوان هەبووە، ناوی (میدۆسا) بووە، بەجوانیی خۆی نازیوەو گوتوویەتی من لە (ئەثینا)ی خواوەندی حکیمەت و هونەرو زانیاری گریك جوانترم، بۆیە ئەو خواوەندە لەرقان کردوویەتی یە گیاندارێکی ناشیرین و قژو کەزی یە جوانەکانی کردووە بەمار و روخسارێکی یەگجار ناشیرین و بەد فەساڵی پێ داوەو هەر کەسێکی سەیری کردبێ هەر ئەو دەمە بووەتە بەرد[١٦]»

بەکورتی (میدۆسا) بووەتەنموونەیەکی یەگجار بەدی شەرووێرانکاری لەو سەردەمە زوەدا. کەچی (کەریم دەشتی) زۆر هوشیارانە ئەو ئەفسانەیەی وەرگرتووەو هونەرمەندانە دایرشتۆتەوە، بەڵام نەچووە بەهەمان فرمان و کرداری خراپەکاریی (میدۆسا)، ئەفسانەکەی دروست بکاتەوە، بەڵکو چووە بە پێچەوانەوە، هەموو کردارێکی چاکەو خێرخوازی پێ سپاردووە.

میدۆسای گریك هەموو کەسێك دەکاتە بەرد، کەچی میدۆسای (دەشتی) هەر تاشە بەردو کەڤرە دەیان کات بە مرۆڤ و بەدۆڵی مێژوویان وەر دەکات !!

لەجیاتی لەناو بردن و وێرانکاری، ئاوەدانی پێکەوە دەنێ. لە میدۆسای گریك دا بە فەرمانی خواوەند پرچ و کەزی یە جوانەکانی ئەو گیانداره بەد فەساڵە دەبنە تووله مارو پێیدا هەڵدەواسرێن ، کەچی لە میدۆسای دەشتیدا پرچی مێژوو دەکرێتە کەزی یەمارو لە لوولاقی هەمان خواوەندی دەئاڵێنیو (میدوسا)ی ئەوەندە لە لاخێر خوازە، دەچێ لە جیاتی وێران کردن ، کەون و گەردوونی بە دڵ و خوێنی خۆی گەورە دەکات و ، هەموو سیستەمێکی ناهەمواری سروشتی ئەم جیهانە لە بنەرەتەوە تێك دەدات.

بەکورتی (کەریم دەشتی) گەلێك وەستایانە مامڵەتی لەگەڵ (میدۆسا) ی گریکی کردووە، لە دارشتنەوەیەکی نێگەتیڤ دا

ئەفسانەیەکی تازەی پێکەوە ناوەتەوەو تاقی کردنەوەیەکی ئەفسانەیی بەپیتی ئەنجام داوە:-

**٢). خولقاندنی ئەفسانەی تازە لە شیعری نوێدا.**

ئەگەر چاوێك بە هۆنراوەی شاعیرە نوێ کارەکانی ئەم دە پازدە ساڵەی دوایـیدا بخشێنین و، بەوردی بیان خوێنینەوە، بێگومان چەند نموونەیەکمان لە خولقاندنی ئەفسانەی تازە لەشیعری نوێدا بەرچاو دەکەوێت، هەیە لە ناو ئاوو هەوا کۆنەکەی گریك یان عیراقی کۆنی سەردەمی بابل و ئاشووردا خولقێنراون و، هەندێکیشیان خۆماڵین و، شاعیر بە زیرەکیو هوشیاریو بەهرەی خۆی لەناو ئاوو هەوایێکی سازگاری نەتەوەکەیدا خولقاندوویەتی.

**★ بۆ ئەو جۆرە نموونانەی کەلە ئاوو هەوای ئەفسانەی گریکی یا بابلی یان کەلەپووری ئایینیدا خولقاون، دەتوانین هۆنراوەیەکی (نەوزاد رەفعەت ١٩٥١) کەبەناوی (نەفرەت) دایناوە، بکەین بەنموونەی ئەو جۆرە خولقاندنەی ئەفسانە لە شیعری نوێدا کە دەڵێ:-**

**تۆ پێم ناڵێی بۆ ئەو قەلە**<br>
**وا رەشپۆشەو قراندنی**<br>
**تەزوو بەلەش دا دەهێنێ؟**<br>
**سام دەنوێنێ؟!**<br>
**- ئەوسا مەلێکی بەفرین بوو**<br>
**نەغمە خوان و خوێن شیرین بوو**<br>
**بەلام ئەو رۆژەی کەویستی**<br>
**مەل و بەفرۆ هەموو شتە سپییەکانی**<br>
**ئەو دنیایە بەکوشت بدا**<br>
**چی دەنگ خۆش هەن ریسوایان کا**<br>
**تا هەر خۆی سپیو خۆش خوان بێ**<br>
**تاقە جوان بێ!**<br>
**بەر برووسکەی نەفرەتی خواوەندی جوانی**<br>
**کەوت و سووتا**<br>
**ئاوا دزێوو بەدووم بوو**<br>
**رەش هەڵگەرا!!**[١٧]

ئەوەی سەرچاوەکانی ئەفسانەی گریك و کەلەپووری ئایینی لەبارەی هۆی روو رەش بوونی قەل و شوومیو نەفرەت لێ کردنی بۆیان تۆمار کرد بێن، دوو ئەفسانەیە، یان ئەوەتا روو رەشییەکەی دەبەنەوە بۆ نەفرەت لێ کردنی لەلایەن خواوەند لەبەر زۆر بلێییو زۆر قیراندنی، یاخود شوومیو نەفرەت لێکردنەکەی دەبرێتەوە بۆ پەیمان شکاندن و بەجێ نەگەیاندنی راسپاردەکەی حەزرەتی نووح لەکاتی نیشتنەوەی تۆفانەکەیدا.[١٨] کەچی دەبینین (نەوزاد رەفعەت) لێرەدا هوشیارانە ئەفسانەیەکیتر بۆ مەسەلەی رەشپۆشی قەل و سامناکی قراندنیو نەفرەت لێکردنی دەخولقێنێو هۆی گۆڕانی رەنگی لەسپی بەفرینەوە بۆ رەشێکی ناشیرین، دەباتەوە بۆ هەناو رەشیو حەزکردنی بەخراپەو بەکوشت دانی هەموو گیان لەبەرو شتێکی سپیو جوانی سەر ئەو جیهانە تاکو هەر خۆی سپیو جوان و دەنگ خۆش بێ، بۆیە بە بەر برووسکەی نەفرەتی خواوەندی جوانی کەوت و سووتاو رەش هەڵگەراو بووە دزێوو مەلێکی شووم!

**ئەمە پوختەی ئەفسانەکەی (نەوزاد رەفعەت) بوو، بۆیە دەشلێین لەناو ئاوو هەوایێکی گریکی یا بابلیدا خولقاندوویەتی چونکە خواوەندی جوانیی گریك (ئەفرۆدێت)و خواوەندی جوانیی بابل و ئاشوور (عیشتار) زەبرو زەنگی لەو بابەتەیان لەبەدکارو تاوانباران داوە، شاعیریش لەتاقیکردنەوە ئەفسانەییەکەی سەرکەوتووە و ئەنجامێکی باشی بەدەستەوە داوە.**

★ لەو شاعیرە نوێ کارانەی کەلەناو ئاوو هەوایێکی کوردیدا ئەفسانەی تازەی خولقاند بێو لەقالبی هۆنراوەیەکی سەرکەوتوودا دەری بری بێ، (**لەتیف هەڵمەت**: ١٩٤٧)ە، ئەو شاعیرە نوێکارە لە هۆنراوەیەکیدا بەناوی(**یەکەم خۆشەویستی**) تاقیکردنەوەیەکی ئەفسانەیی بە هێزی

ئەنجام داوەو دەڵێ:ـ

**من هێشتا چلەم نەچوو بوو**
**نەم دەزانی لەبێشکەدام یا لە زیندان؟!**
**نەم دەزانی دایکم ناشیرینە یا جوان!**
**هیچی ترم نەدەزانی تەنها گریان**
**خەوم بینی فریشتەیەک**
**سپی وەکو شەستە باران**
**چاو سەوز وەکو دارستان**
**هێدی هێدی هاتە خوارەوە لە ئاسمان**
**جومگەی سنگمی یەکە یەکە لێك ترازان!**
**ئەفینی ئەم چەم و دۆڵ و شاخ و داخەی**
**لە دڵما چان!!**
**ئێستا دڵم هیچی تری تیادا نییە**
**هەر کوردستان...!![19]**

لەتیف هەڵمەتی شاعیری نوێکار ئەفسانەکەی لەچوار چێوەی خەونێکی سەردەمی ساوایی‌ی خۆیدا دەخوڵقێنێ‌و، هەموو ڕووداوێکیش لە خەون دا دەقەومێ‌و هیچ شتێك ڕێی لێناگرێ‌و خۆشەویستی بۆ کوردستان دەست چێنی فریشتەیەکی خودایی‌یەو، هەموو شێوەو ئەدگارێکی لەسروشتی خاکی کوردستانەوە وەرگرتووەو سپی‌یە وەکو شەستە بارانی بەهاران و (چاو سەوزە) وەکو سەوزایی دارستانەکانی نیشتمانی شاعیر

**ئێستا دەتوانین بڵێین شاعیری کورد لەدەستی دێت بەئەندێشەی قووڵ‌و بەهرەی شاعیریی‌و پەنا بردنە بەر خەون، جوانترین و خۆشترین ئەفسانە بخوڵقێنێ‌و بۆ ئامانجێکی نیشتمان پەروەری‌و سوودی میللەت و نەتەوە بەکاری بێنێ.**

★ لەو شاعیرە نوێکارانەی کە لەخوڵقاندنی ئەفسانەی تازە لە شیعری نوێدا دەست ڕۆیشتوون (قوبادی جەلی زادە: ١٩٥٢)یەو لەکورتە هۆنراوەیەکی‌دا بەناوی (شەپۆل) لە ئەفسانەی چۆنێتی کەوتنەوەی (ماسی)و (شەپۆل)ەوە دەدوێ‌و دەڵێ:ـ

**لەسەر ڕۆخی کەشتی‌یەکەوە**
**ماچێکمان کەوتە دەریاوە**
**(ماسی) لەو ماچە کەوتەوە!!**
**لە کەناری دەریاکەوە!!**
**بەدڵ توندی لێك دا براین**
**شەپۆل لەو داخە کەوتەوە!![20]**

کاتێك کە ئەم دێڕە شیعرە ناسکانە دەخوێنینەوە، لەچۆنێتی دروست بوون و، کەوتنەوەی (ماسی) لە (ماچ) و کەوتنەوەی (شەپۆل)ی دەریا لە (ئاخ و داخی لێك دابڕانی دوو دڵدار)، کەخۆی‌و یارەکەیەتی، دەگەین.

مەسەلەی دروست بوون و کەوتنەوەی گیاندارێك یا شتێك لە هێزو سەرچاوەیەکی تر، بیرو لێکدانەوەمان دەبەنەوە بۆ سەردەمێکی یەکجار زووی ژیانی ئادەمیزاد و بۆ ئەفسانەی پەیدا بوونی هەندێك گیاندار و ڕووەك و شتی بێگیان لەهێزێکی گەورەترەوە.

بۆ نموونە: لەکەلەپووری ئیسلامی‌دا گوتراوە پشیلە لەپژمینی شێری ناو کەشتی‌یەکەی نووح خوڵقاوە مشکە زۆر زەوەندەکەی ناو کەشتی‌یەکەی خواردووە،[21] یاخود دروست بوونی گوڵی (سووسن) لە فرمێسکی چاوی (حەوا) لە دوای دەرکردنی لەگەڵ (ئادەم)دا لەبەهەشتو بەگوێر ئەو فرمێسکەی هەڵ ڕشتووەو ئەو گوڵە جوانەی لێکەوتووەتەوە.[22]

بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ شاعیری نوێ کارمان مەرگە سروشێکی دووراو دوری لەو جۆرە خوڵقاندنانە وەرگرتبێ، دەنا تا بڵێی ئەفسانەیەکی خۆش و نوێی بۆ خوڵقاندووین و، وەکو دوو وێنەی گەشی شیعری ناسك پێشکەشی کردووین.

جەلی زادەی نوێ کار هەر ئەم دوو ئەفسانە ئێسك سووکەی پێشکەش نەکردووین، بەڵکو تاقی کردنەوەیەکی بە پیتی ئەفسانەیی سەرکەوتووی دیکەیشی پێشکەش کردووین و، ئەفسانەی (لەدایك بوون)یك مان بۆ دەخوڵقێنێ و ئاوو هەواکەیشی کوردەواری یەکی تەواوەو ڕەنگ و ڕیشەی بەلای ئەفسانەی تری لە دایك بوون نا ڕوێن و، بەم جۆرە کارەکەی ئەنجام دەدات و دەڵێ:ـ

جاران زەوی
وەك دڵی من داکوترا بوو
بەڵام شەوێك ژانی هاتێ و لە تاوانا
لەبن و بێخەوە هەڵکەنا

گەرا ، نۆ ساڵ گەرا، نۆ هەزار ساڵ
(خودا) نەبوو بەمامانی
(شەیتان) نەبوو بە مامانی
(فریشتەیێ) زاتی نەکرد ئارەقەی بۆ بسرێتەوە
ئەو دەگەرا و منیش لە ناو ئاگردانی هەناوی‌دا
بەیانی‌یەك منداڵدانی دایکم تەقی‌و
نۆ بەرەکەی کەوتە خواریێ!
رەشەبایێ، بوو بە پەلی (خدری زیندە)و گرتمیەوە!!
(مەشخەڵێ)هات ناوکی بریم!
چەند کۆرپەیەکی سەیر بووم
یەکەم هاوارم (زریان) بوو
یەکەم پووشینەم (بەفر) بوو
یەکەم دایانم (چیا) بوو
مرۆڤێکی چەندە سەیرم؟!
بە سەقەتی لەدایك بووم
بە سەقەتی هەنگاو دەنێم
بەسەقەتی دەبێ بمرم[٢٣]!!

قوبادی شاعیری رۆشنبیر لە پرۆژەی دروست کردنی ئەم ئەفسانەیەی لە دایك بوونی سەیری‌دا، هەڵوێستی کەم تەرخەمیی هەموو هێزێکی میثولۆژی خێر خوازی میهرەبان و شەر خوازی خراپەکاری دژبەیەکی بە رامبەر بەم لە دایك بوونەی دەردەخات. بەڵام بە پێچەوانەی هەڵوێستی ئەو رەمزو نموونانە، دەچێ بە شێوەیەکی ئیجابی دەوری هێزە سروشتی‌یەکانی وڵاتەکەی بۆ لە هانا هاتنی زەوی (دایکی)و بۆ داڵدەدانی مەلۆتکەکەی دەردەبرێ‌و، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە چۆن لەگەڵ لە دایك بوونی‌دا (رەشەبا)ی نیشتمانەکەی لێ بووە بە (خدری زیندە)و لە ئاسمانەوە گرتوویەتی‌یەوەو، لە کەوتنە خوارەوەو مردن رزگاری کردووەو مەشخەڵێکی رووناك لەجیاتی مامان ناوکی بریوە،بۆیە کۆرپەیەکی سەیری لێ دەرچووەو یەکەم هاواری گریانی زریان بووە، یەکەم پۆشینەی مەلۆتکەی ساوایی بەفری کێوان بووەو، یەکەم دایەنی چیای سەرکەش بووەو بەخێو بێری بە خێوی کردووە، بۆیە لەو ساوە مرۆڤێکی نا ئاسایی لێ دەرچووە.

هەر کەسێکی لە ئەفسانەی لە دایك بوونە سەیرو عاجباتی‌یەکەی شاعیر وردبێتەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێ: ئەفسانەی لە دایك بوونە نا هەموارەکەی نەتەوەکەیەتی‌و، لە مەوە بۆمان دەردەکەوێ کە (قوبادی جەلی زادە) شاعیرێکی لێهاتووی نوێ کارە، بە ئەندێشەی قووڵ‌و بەهرەی شاعیری و رۆشنبیریی خۆی ئەفسانەیەکی بەهێزی لەدایك بوونی کۆمەڵ و نەتەوەیەك لە کەرەستەی ئاسایی وەکو مانگ و خۆرو ئەستێرە و رەشەباو مەشخەڵ و زریان و بەفرو چیاو کەرەستەی بە هێزی وەکو (خودا، فریشتە، شەیتان) دە خولقێنێ و بە جوانی لە تاقی کردنەوەکەی‌دا سەر دەکەوێ.

## سەرەنجام:

خوێنەری بەرێز، لە خوێندنەوەی ئەم باسەدا ئەو راستی‌یەت بۆ دەردەکەوێ کە ئەمرۆکە ئەفسانە لە قاڵبە کۆنەکەی خۆی دەرچووە، کە دەبوایە هەر بەرهەمی سەردەمێکی کۆنی ژیانی ئادەمیزاد بێ‌و، هەر ئەو جۆرە حیکایەتانە بگرێتە خۆ، کە لە خواوەند و نیمچە خواوەند و بوونەوەری عاجباتی‌یەوە دەدوێت، بەڵکو شاعیری بە هەرەداری رۆشنبیر بۆی هەیە ئەم جۆرە بابەتە لەشتی ئاسایی و وردیلەش بخولقێنێ، بە مەرجێ سرووش بەخش بن و، کاری سەیر و عاجباتی‌یان پێ بسپێردرێ‌و بە شێوەیەکی هونەریی لەناو شیعردا بە کاریان بێنێ‌و، لەم باسەش دا هەستتان بەوە کرد کە چۆن شاعیری نوێ کاری کورد ئەم ئەرکەی بە جوانی بە جێ گەیاندووەو، بەرهەمی بە هێزو پتەوی لە هۆنراوەی نوێ دا

خوڵقاندووەو بە دوو جۆری سەرەکی ئەفسانەی بەکار هێنانەوە، یان ئەوەتا بە شێوەی دارشتنەوەی ئەفسانەی کۆن لە قاڵبێکی نوێدا، ئەمەش یان وەکو هەیکەلی سەرەکی ئەفسانەکە دابرێژرێتەوە، بەڵام هەندێ دەسکاریو گۆرانکاری بەنیازی پتەوکردنی بابەتەکەی تێ دا بکرێ، ئەمەش جۆری دارشتنەوەی (پۆزەتیڤە)و بۆ ئەم جۆرەش نموونەمان لە شعیری (صلاح شوان)و ( محمد ئەمین پێنجوێنی) هێنایەوە.

یان ئەوەتا بە پێچەوانەی دەوربینی رەمزکانی ئەفسانەی کۆن دای دەرێـژێتەوەو ئەمەش پێی دەگوترێ دارشتنەوەی (نیگەتیف) و نموونەمان بۆ لەشیعرەکانی (سەلام محەمەد)و (کەریم دەشتی) هێنایەوە.

یاخـود ئەوەتـا شاعـیر بە کار تێکـردنی ناوو هەوایێکی ئەفسـانـەی گریك یا رۆمان یان بابل وەیا خود کە لە بووری ئایینی، یان لە خۆیـەوە ئەفسـانـەیـەکی نوێ دەخـوڵقێنێ و هۆنـراوەیـەکی بە هێـز و پتەومان پێشکەش دەکات و بۆ ئەم خوڵقـانـدنـە نوێیەی ئەفسانەش نموونەمان لە هۆنراوەکانی نەوزاد رەفعەت)و (لەتیف هەڵمەت)و (قوبادی جەلی زادە) هێنایەوە، هیوادرین توانیێتمان شتێکی تازەو سوود بەخش لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی نوێی کوردی پێشکەش بە ئێوەی ئازیز بکەین.




**سەرچاوەو پەراوێز:-**

١ - د. عبالحمید یونس - معجم الفولکلور - بیروت ١٩٨٣، ص ٣٤

٢ - احمد ابو زید واخرون - دراسات في الفولکلور - القاهره ١٩٧٢، ص١٣

٣ - د. صموئیل نوح کریم - اساطیر العالم القدیم - القاهرة ١٩٧٤، ص٧

٤ - رۆلان بارت - الاسـطورة الیوم - ترجمة حسن الغرفي - بغداد ١٩٩٠، ص٦

٥ - هەمان سەرچاوە، ل:٧

٦ - عبدالجبار عباس - السیاب - بغداد، ١٩٧٠، ص١٩٣

٧ - د. احسان عباس - فن الشعر - بیروت ١٩٥٩، ص٢٧

٨ - د. عنـاد غزوان - الشکـل والمضمون في الشعر العربي المعاصر - من کتاب (الشعر والفکر المعاصر) - بغداد ١٩٧٤، ص٢٣

٩ - د. محمد مندور - الادب و مذاهبه - ط٢، القاهرة: ١٩٥٧، ص١٢

١٠ - عبدالعزیز شرف - الرؤیا الابداعیة في شعر البیاتي - بغداد ١٩٧٢، ص ١٢٥

١١- صلاح شوان - دڵدارەکەم پایزە گەواڵەیەك نىیە - بەغدا ١٩٧٨، ل٥٧

١٢ - محمد امین پێنجوێنی - دیوانی کەگڵ ئەبێتە هیموگلۆبین - بغداد ١٩٨٧، ص٨٣،٨٢

١٣ - هەمان سەرچاوە، ل: ٨٣

١٤ - سەلام محمد - دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە - بەغدا ١٩٨٨، ل٨٠،٨١

١٥ - کەریم دەشتی - تەمە سپییەکانی رۆح - بەغدا ١٩٨٨، ل:٥،٦

١٦ - د. عبدالحمید یونس - معجم الفولکلور - بیروت ١٩٨٣، ص:١٩٩

١٧ - نەوزاد رەفعەت - نیگەرانی - بەغدا ١٩٨٥، ل:٥٤

١٨ - فریـدریش فۆن دیر لاین - الحکایة الخرافیة - ترجمة الدکتورة نبیلة عبید - بیروت ١٩٧٣، ص٩١

١٩ - لەتیف هەڵمەت - گەردە لوولی سپی - بەغدا ١٩٧٨، ل:٨٦

٢٠ - قوبادی جەلی زادە - قەڵەمێکی ردێن سپی - بەغدا ١٩٨٨ ل:١٥١،١٥٢

٢١ - وزارة الاعلام - الموروث الشعبي في اثار الجاحظ - بغداد ١٩٧٧، ص١٠٥

٢٢ - د. عبالحمید یونس - معجم الفولکلور - بیروت ١٩٨٣، ص١٩٤٦

٢٣ - قوبـادی جەلی زادە - قەڵەمێکی ردێن سپی - بەغـدا ١٩٨٨، ل٥٤،٥٥،٥٦

لێکۆڵینەوە

Katharsis

# پاکژ بوونەوە

عطا قانع



کاثارسس زاراوەیەکی یۆنانی‌یەو واتای خاوێن بوونەوە دەدات، یان دەروازەیـــەکــە بۆ دەرپـــەڕیـنـی هەست و سۆزێکی بە هێز[1] .کاثارسس وەك و زاراوەیەکی پابەند بە ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی‌یــەوە لە سەردەمی ئەرستۆتالیس دا دەرکەوت گەرچی پێشتر لە دوو تیشکە نیگای ترەوە سەیر دەکراو واتاو مەدلولی خۆیی هەبوو لە زماندا. لایەنی یەکەمی ئەو سەرنجدانەش لەو بۆ چوونەوە بوو کە وەك و زاراوەیەکی پزیشکی Medical Term بەکار دەهات و واتای پاکژبوونەوەی جەستەی مرۆڤی دەگەیاند لەو شتـە زیـادانەی کە پێویست نین[2] . ئەمەش چەند جۆرو قۆناغێکی هەبوو کە دواتر دەگەڕێینەوە سەریان و باسیان لێوە دەکەین بەکارهێنانی دووەمی زاراوەی پاکژبوونەوە لە ڕوانگەی ئاینەوە بوو کە ئەمەش واتای پاك بوونەوە لە گوناه دەگەیەنێت[3] دوای پەشیمـان بوونــەوەو دان پیانان بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەرستـۆ پشتی لەم دوو بەکـارهێنـانەی پاکژبوونەوە کردو لە ڕوانگەیەکی ترەوە مامەڵەی لەگەڵ کرد ئەو لە ڕوانگەی ئەرکی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیەوە ڕوانیە پاکژبوونەوە. ئێمە لێرە بە دواوە بەپـێـی توانـــاو سەلیـقــە پێ شکـــان هەوڵ دەدەیـن ڕونـاکی‌یـەك بخـەینـە سەر پاکـژبوونەوەو لە قۆناغی بەر لە ئەرستـۆو دوای ئەرستۆشدا[4] لە کاتێکدا لە ئەدەبی کوردیدا تاك و ئێستا باسێکی ئەو تۆی لێوە نەکراوە جگە لە کورتە باسێك نەبێت لەلایەن هونەرمەندی جوانەمەرگ هیوا جافەوە.

بێ گومان ناخی مرۆڤ ئەو جیهانە ئاڵۆزەیە کە تێگەیشتنی هەروا کارێکی سووك و سانـا نی‌یـە گەرچی ئێستاو لەم دوا چارەکـەی سەدەی بیستـدا زانست و زانیـاری بە شێوەیەك برەویان ستاندووە ئەگەر لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بەکاربخرێن ئەوا سەرجەم بنیادەم ئاسوودەو بەختەوەر ژیان دەگوزەر بێنن .. بەڵام سەرەڕای ئەم پێشکەوتنە مەزنانەو جۆرەها داهێنان و ئافراندن و شان بەشانی زانستی دەروون ناسی و هەموو تیۆرە جۆراو جۆرەکـانی ئەم بوارە هەر لە فرۆیدو باڤلۆڤ و یۆنگ و ئەدلێرو سکنەرەوە .. هێشتا ناخی مرۆڤ گەلێك تاقی کردنەوەو لێکۆڵینەوەو پشکنینی تری پێویستە هەتا پەی پێ ببرێت.

مرۆڤ لە گەردونـــدا ئەو ئافـریـدە بووەیـە کە لە هەمـوو بوونەوەرانی دی باڵاترەو جۆرەها ڕێگاو هۆکار بەکار دەهێنێت بۆ خۆ دوور خستنەوەو قوتار بوون لە ئێش و ئازارو دەیەوێت لە هەموو کاریگەرییەکی دەرەوەو کارتێکردنی لاوەکی توندو تیژو ئازار هێنـــەر بە دوور بێـت، ئەم ویـســتـــەش بوویـــەکی خۆرسکی‌یـــەو دوور لە توانـــای مرۆڤ کاری خۆی دەکـاو لە پرۆسێسێکی بەردەوامـــدایــە بەڵام بەرامبـــەر بەم داواکارییە خۆرسکـەی مرۆڤ دیاردەیەکی پێچەوانەش هەیە کە ئەویش ئازاری مێشکی‌یە Mental Suffering کاتێ مرۆڤ بێزار دەبێ و مانـدوی و شەکەتی و پەشێوی لە ئەنجامی بەدی نەهاتن و مسـوگـەر نەبـوونی پێـداویستی‌یە مادی و ڕۆحیەکانیدا باڵی ڕەشیان دەکێشنە سەریدا، کە دڵتەنگ دەبێ و هەوری دێزو چڵکنی خەم و خەفـەت و دوو دڵی و گومان ڕووی ئاسۆی لێ دەشارنەوە .. ئالەو ساتەدا حەز بەوە دەکات کە جۆرە جوڵاندن و پرۆسـێـسـێـکی بزوانـــدن لە مێشکی دا ڕووبـــدات، ئەو جوڵانـدنەش پروسێسێکی شێوە ئازار دان بە خۆی دەگرێت چونکـە لەم ئازار چەشتنـــە مێشکی‌یـــەدا دواجـار هێمنی و حەوانەوەو جێگیرییەك لە ناخی ئەو کەسەدا دروست دەبێت.

ئەم هێمن و مەوانەوەیەش لە ئەنجامی کارلێکی توندو سەختی هێـزە دژەکـانی ناخی مرۆڤـدا بەدی دێت کە ئەمـــەش پێ‌ی دەگوترێت پاکژبوونەوە.

ئەرستـۆ لە کاتی موتـاڵاکردنی ئاراکانی پلەتێودا (ئەفلاتون) یەکـــەمـین جار نەیـوویست تەنهـا وەڵامی ئەوە بداتـــەوە کە

ئەفلاتوونی هونەری بە لاسایی کردنەوەی نمرە سێی راستییەکان دادەنا، بەڵکو خۆی لە قەرەی ئەو وەڵامەش دا کە داخۆ هونەر شتێکی تێك شکێنەرە چونکە راستەو خۆ بەندە بە هەست و سۆزەوە ئاودێرییان دەکات[٥] بەڵکو لە سەروی ئەمانەوەی ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە هونەر ئازار یان خاوێن بوونەوەیەك لە ناخدا بە ئاکام دەگەیەنێت ئەویش بە هەژاندنی سۆزو ترس Fear and Pity تیاماندا لە هەمان کاتدا[٦].

بەم پێیە ئەرستۆ رای وایە کە پاکژبوونەوە لە ئەنجامی بنینی تەراژیدیایەکی پەسەندەوە دروست دەبێت، بە واتایەکی تر پاکژبوونەوە دەگەرێتەوە بۆ کاریگەری نمایشێك یان خوێندنەوەیەکی تراژیدیا لەسەر بینەر یان گوێ گر، چونکە لە کاتی بینینی نمایشی تراژیدیدا بینەر لەگەڵ پاڵەواندا یەك دەگرێتەوەو پێکەوە گرێدانێك Identification دروست دەبێت، یان بینەر وا تێ دەگات کە پاڵەوان رۆڵی ئەو دەبینێت یان گوزارشتی ئێش و ژانەکانی ئەو دەکات ئەمەش یەکێك لەو سیفاتە بنەرەتیانە کە پێویستەو دەبێ شانۆی تەقلیدی بەدی بهێنێت[٧] هەر لێرەشدا جێگای خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە شانۆی برێختی پێچەوانەی ئەم بۆ چوونە دەوەستێت و بڕوای بە جووت بوونی ئەکتەرو بینەر نی یە واتە Idenification چونکە مەبەستی ئەم ئەوەیە کە جەماوەری شانۆ بخاتە سەر کەڵکەڵەی بیرکردنەوەو دیار کردنی هەڵوێست.. دواتر بۆ ئەم خاڵەیە دەگەرێینەوە.

دیسان ئەرستۆ لای وایە لە کاتی بینینی نمایشی تراژیدیدا ساتێ کە رووداوێکی پرمەترسی و خوێناوی روو دەدات و پاڵەوان روو بە رووی چەڵمەیەکی پر مەترسی دەبێتەوە ئەوا بینەر هەست بە ترس و لەرزێکی بێ پایان دەکات و لەوە دەترسێت کە ئەو رووداوە جەرگ برە بەسەر خۆیدا بهاتایە یان لە داهاتوودا بەسەری بێت، لە هەمان کاتدا سۆزو بەزەیشی دەجوڵێن و بەزەیی بە پاڵەواندا دێتەوە کە دوو چاری گێرمەو کێشەیەکی ئاوا هاتووەو ئازاری پێوە دەچێژێت بەپێی بۆ چوونی ئەرستۆ پاکژبوونەوە لە ئەنجامی کێشەو پەیوەندی نێوان ترس و بەزەییەوە دروست دەبێت، بەڵام ئەوەی گرنگە درێژ بوونەوەی ئەم بارەی مێشك زۆر ناکێشێ و لەگەڵ تەواو بوونی بینینی دیمەنە تراژیدیەکەدا ئەویش تەواو دەبێت بەم پێیە پاکژبوونەوە تەنها ئەوکاتە روو دەداو بەردەوامە کە بینەر بەرامبەر تەختەی شانۆ دانیشتووەو ئەکتەر دەور دەبینێت، لەگەڵ تەواو بوونی کردەی Action نواندندا وەك برینی هێڵی کارەب کاریگەرییەکەی لەسەر مێشکی نامێنێت ئەمەی لە سەرەوە باسمان لێوەکرد کاکڵەی بیرو بۆچوونەکانی ئەرستۆیە دەربارەی پاکژبوونەوە کە لە کتێبی (شیعردا ـ Poetic)

باسی لێوە کردووە.بەڵام تەنها بەم باسە وازی نەهێناوە بەڵکو لە هەردوو کتێبی رامیاری poletics و بەلاغەشدا Rhetorical دیسان دەربارەی پاکژبوونەوە دواوە. لە رامیاریدا پاکژبوونەوە دەبەستێتەوە بە بیستنی جۆرە مۆسیقایەکی تایبەتیەوە کە توانای ئەوەی هەیە مێشکی ئەو کەسەی پەیوەندی بەتینی لەگەڵ واقیعدا پچراوە بگەرێنێتەوە سەر باری ئاسایی خۆیی و دیسانەوە پەیوەندی بە واقیعەوە زیندوەکاتەوە..

لە بەلاغەشدا دەربارەی بیرو بنەمای پاکژبوونەوە دیسانەوە چۆنێتی بەدی هاتنی دواوە.

لە تێکرای ئەو باسانەی ئەرستۆ دەربارەی پاکژبوونەوە کردوونی ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە پاکژبوونەوە تەنها لە ئەنجامی بینینی تراژیدیەوە دروست دەبێت، بێگومان تراژیدیاش لای ئەرستۆ بریتی یە لە لاسایی کردنەوەی چالاکی یەکانی مەردووم، هەروەك لە پێناسەکەیدا بۆ تەراژیدیا دەڵێت: تراژیدی لاسایی کردنەوەی کردەی مرۆڤە کە شتێکی هەتەرەو serous خاوەنی سەرەتاو ناوەراست و کۆتاییەوە بە زمانێکی پاراوو قەشەنگ دارێژراوەو.. دەبێتە هۆی دروست کردنی ترس و بەزەیی و ئەمەش لە کۆتاییدا پاکژبوونەوەیەکی تەواو لەو هەست و سۆزو. هەڵچونە دروست دەکات[٨].

بەڵێ ئەرستۆ بە پێچەوانەی ئەفلاتوونەوە دەروانێتە تراژیدی و دژی راو بۆ چوونەکانی دەوەستێت ئەویش لەو گۆشەنیگایەوە کە تراژیدی لای ئەفلاتوون لاسایی کردنەوەی نمرە سێی بیری بالایە From Reality Thrice Removed واتە وەسف کردنی کورسی یەك لە لایەن شاعیرەوە پلەی سێیە پلەی یەکەم بوونی بیرۆکەکەیە کە راست و تەواو بێ کەم و کورتی یە، پلەی دووەم ئەو کورسی یەیە کە دارتاشێك بە لاسایی کردنەوەی Imitation بیرۆکە بنەرەتیەکە دروستی کردووە، وەسفی شاعیرەکەش

سێیەمە بەڵام ئەرستۆ هەموو دیاردەو ڕووداوەکان لە خلالی پرۆسێسیکی وابەستەو پابەند بە مرۆڤ و چالاکیەکانی مرۆڤەوە لێك دەداتەوە لەم ڕووەوە پاکژبوونەوە بە یەکێك لە ئەرکەکانی ئەدەب دەزانێت بۆ نموونە گەر بێین و بڕوانینە شانۆنامەی هاملێتی شکسپیر وەك یەکێك لە تراژیدیە هەرە بەڵاکانی ئەدەبی جیهانی ئەوا لە کاتی ئازار چەشتنی هاملێت دا ئێمەش ئازار دەچێژین و لێوی خۆمان دەکرۆژین لە هەمان کاتدا ئەو دەبینین لە دەمی هەڵچون و تووڕە بوونیدا یان لە کاتی [illegible] خواردنەوەیدا دەمێ بیر لە تاوانەکەی دایکی و مامی دەک[illegible] دەیەوێت تۆڵەی باوکی بسێنێت ترس دامان دەگرێت.. خۆمان بە بەشێك [illegible] هاملێت دەزانین و لەگەڵ کەسایەتیەکەیدا یەك دەگرینەوە [illegible]ەشترسین لەوەی کە ئەو ڕووداوە بە سەر خۆماندا بهاتبایە یان [illegible] داهاتوودا بە سەرمان بێت .. چاودڕوانی تۆڵەی هاملێت دەکەین ئێش و ژانەکانی و بارە دەروونیە شلۆقەکەی بەرامبەر [illegible]ایکی و مامی لە لایەك و ئۆفیلیای دەزگیرانیشی لە لایەکی ترەوە [illegible]دشێ نزیك بێتەوە لە ئازارەکانی بینەرو بینەریش وا هەست بکات کە هاملێت لەسەر تەختەی شانۆ ڕۆڵی ئەو یاری دەکات بەڵێ لەم کاتەدا لە ئەنجامی پەیوەندی دیالکتیکانەی نێوان ترس [illegible] بەزەیی بارێکی هاوسەنگ لە ناخی بینەردا دروست دەبێ کە حەوانەوەی پێ دەدات ئەو بارەش پاکژبوونەوەی ناخە لەو ڕق و ترس و بێزاری و دڵەڕاوکێیەی کە بەهۆی کاریگەری تراژیدیاکەوە کەوتنە بارێکی پێکدادان و کارلێ کردن و لە ئەنجامدا هاوسەنگ بوون، واتە پاکژ بوونەوە بەدی هات.

لە داستانی شیرین و فەرهادی خۆشماندا .. هەموو لەگەڵ ئێش و ئازارەکانی هەریەکە لە شیرین و فەرهاددا ئازار دەچێژین ، هەریەکەمان هەست دەکەین خۆمان یەکێك بین لەو دوانە .. بەزەییمان پیایاندا دێتەوەو لە چارەنووسیان دەترسین یا مەترسی ئەوە دامان دەگرێت کە ئێمەش دووچاری چەڵەمەیەکی لەو بابەتە ببین و پیرەژنی فەرهاد کوژمان بۆ زیندوبێتەوە، بەڵێ ترس و بەزەیی وامان لێ دەکات لە کاتی بینینی «شیرین و فەرهاد» دا لەسەر تەختەی شانۆ هەست بە حەوانەوەیەکی ڕۆحی بکەین و بکەوینە بارێکی هاوسەنگی دەروونیەوە کە ئەمەش بە ئەنجام هاتنی پاکژبوونەوەیە تا ئێرە گەرچی بە شتێکمان دەربارەی کاکڵەی بابەتەکە لە سەردەمی ئەرستۆدا خستە ڕوو، لێرە بە دواوە گەرچی بە کورتیش بێت باسی پاکژبوونەوە لە پێش ئەرستۆو Pre Arstotalain دوای ئەرستۆدا Post Arstotalain دەکەین.

**پاکژبوونەوە لە پێش سەردەمی ئەرستۆدا**

لە پێش ئەوەی ئەرستۆ بێت و ڕاو بۆچوونەکانی دەربارەی پاکژبوونەوە ئاشکرا بکات کە سێ لە ڕوانگەی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیەوە دەربارەی ئەو بابەتە نەدوابوو بەڵکو زاراوەی پاکژبوونەوە تەنها لە ڕووی پزیشکی سادەو ساکاری ئەو سەردەمەوە دەناسرا هەر لەسەر ئەو بنەمایەش لێکدراوەتەوە کە گوایە چارەسەر کردنێکی پزیشکییەو نەخۆش لە بارێکی پەشێوو نائاسییەوە دەگەڕێنێتەوە بارێکی ئاسایی و هاوسەنگ و [illegible]ەوانەوەیەکی پێ دەداو لەو نەخۆشیەی دووچاری بووە ڕزگاری دەکات ئەمەش چەند جۆرە بەکارهێنانێکی هەبووە کە گرنگەکانیان ئەمانەی خوارەوەن.

یەکەم هۆمیۆپاثی Homeopathy کە بریتییە لە چارەسەرکردنی نەخۆش بە هەمان شت کە تووشی بووە، بەڵام بە شێوەیەکی سووك لەگەڵیا بەکار دەهێنرێت هەتا لەگەڵی ڕادێت و دەگاتە سنوورێکی ئەوتۆ کە مێشکی بەرەو باری ئاسمایی بگەڕێتەوەو پەیوەندی لەگەڵ [illegible]دا دروست بێتەوە، بەم پێیە ئەم چارەسەر[illegible] چارەسەرکردنێکی مێشکی یان دەروونییە کە نەخۆش دە[illegible] باری گونجاوی پێش دووچار بوونی.

[illegible] هیپۆکرەتیك میدسن Hippocratic Medicen ئەمەش هەر چارەسەر کردنێکی پزیشکییە کە ئەو کەسانەی لەم بوارەدا کاریاز دەکرد لایان وابوو مرۆڤ لە ئەنجامی تێکچوونی باری هاوسەنگی نێوان ئەو چوار شلە سەرەکیەوە دروست دەبێت کەلە لەشی مرۆڤدان [یان لەشی مرۆڤ] پێك دێنن کە ئەوانیش (سەنگوین (خوێن) و میلانمۆلی (السوداوی) و کۆلێری (زەرداو) و فلیگماتی (بەڵغەم) هەرکاتێ باری هاوسەنگی نێوان ئەو چوار شلەیە تێك چوو ئەوا ئەو کەسە تووشی بارێکی دەروونی شلۆق دەبێت و ئێش و ژان ڕێك و ژاروو دەم دەژەنێنە هەناوی تاکە چارەسەریش گێڕانەوەی باری هاوسەنگییە بۆ شلەکان بۆ نموونە ئەگەر کەسێك ڕێژەی خوێنی لە ئاستی ئاسایی زیادی کرد ئەوا دووچاری ئەو بارە شلۆقی و پەشێوە دەبێت ، تاکە ڕێگای چارەسەرکردنیشی دەرمێنانی خوێنە زیادەکەیە کە

ئەمەش لەسەردەمی بەر لە ئەرستۆدا پێی کوتراوە پاکژ بوونەوە.
بێ گومان لە کوردەواری خۆشماندا ئەم چارەسەرکردنە باو بووەو.
بگرە تاك"و ئەم ساڵانەی دوایش هەر سوودی لێ دەبینرا ئەگەر کەسێك تووشی برینێك ببوایە یان ئاڵۆش و خروکە بەشێکی لەشی بگرتایە ئەوا دەیان گووت خوێنی پیسی تێدایە. دەهاتن شاخی گاجووتێکیان

دەهێنــاو ئەم سەرو ئەوســەریــان کون دەکــردو خاوێنیــان دەکــردەوەو نزیـك برینــەکــەیان شوێنەواری ئاڵۆشەکەیان بە گوێـزان یان چەقـۆی تیـژ بریندار دەکردو کەسێکی شارەزا سەرێکی شاخەگاکەی دەنایە برینەکەوەو لە سەرەکەی تریەوە هەڵی دەمژی تا خوێنە پیسەکەی رادەکێشایە دەرەوە. هەمان شت لە کاتی مارو دووپشــك پێــوەدانیشــدا بۆ رزگــارکردنی نەخۆشەکە لە مەرگ بەکار دەهات. ئەو شاخەگایەی کە بۆ ئەم کارە بەکــار دەهــات پێی دەوترا کەڵەشاخ و ئەوەشی بەکاری دەهێنا کەڵەشاخ گر.
سێیەم بەکارهێنانی پاکژبوونەوە لە روانگەی پزیشکییەوە پێی دەوتــرێت مۆسیقــای پاکژکردنەوە. Cathansis Music کە جۆرە مۆسیقــایــەکی تایبــەتیەو بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنرێت، ئەمەش زیاتر لە کڵێسەکاندا ئەنجام دەدرا. نەخۆش دەخرایە ژوورێکی تەنــگ و تاریکــەوەو کەسی لە دەور نەدەمــاو ئەم مۆسیقــایــەی بۆ لێدەدرا هەتــا هۆشی دەکــردەوەو دەهــاتەوە سەرباری ئاسایی خۆی.. بێگومان ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دەنگ و ئیقاعە مۆسیقیەکە توانای وورووژاندنی ترس و بەزەیی لە ناخی نەخـۆشــەکــەدا هەبووەو کاریان لەو بارە شلۆقیەی دەرونی کردووەو بارێکی هاوســەنگیــان تێـدا دروستکردووەو حەوانــەوەیــەکیــان پێــداوە، کە ئەمــەش مانای پاکژبوونەوەو بەدیهێنانیمان پێ دەگەیەنێت
لە کوردەواری خۆشمــانــدا ئەم جۆرە چارەســەرکــردنــە زۆر باوبووە، ئەگەر کەسێك دووچاری نەخۆشی دەرونی بهاتبایە، بە واتای ئەو سەردەمە شێت ببوایە ئەوا هەندێ کەسی تایبەتمەند هەبــوون لەســەر ئەم شێـوەیــە چارەســەریــان دەکــرد.
نەخۆشەکەیان دەخستە ژوورێکی تەنگ و تاریکەوەو دەرگیان لێ دادەخستو بەر قامچیو شوڵکیان دەداو داوایان لێدەکرد ناوی جنـۆکـەکانی هاورێی بڵێ.. تا نەخۆشەکە لە ترسی لێدانەکە قەنــاعــەتی ئەوەی لادروست دەبــوو کە چەنـدین جنـۆکـە هاورێیــەتیو یەك لە دوای یەك ناوی دەهێنــان و بە حساب کابراش دەیکوشتن. پاش کوشتنی هەموو جنۆکەکانی هاورێی کابــرای شێتــە باری دەرونی ئاســایی دەبووەوەو بەرەو چاك بوونەوە دەچوو، چونکە مێشکی لەو ئەندێشەیە پاکژکرایەوە کە گوایە جنۆکە تێکیان داوە.
دوای ئەم کورتەیەی سەرەوە دەربارەی پاکژبوونەوە لە روانگەی پزیشکی کۆنــەوە دەگــەرێیــەوە سەر قۆناغی دوای ئەرستۆ هەوڵ دەدەم بە پێی توانــا گەرچی بە کورتیش بێت شتێـك دەربارەی پاکژبوونەوە لەم قۆناغە درێژ خایەنەدا باس بکەم.
بێگــومان شتێکی ئاشکرایە کە ئەدەب لە دوای ئەرستۆوە تا ماوەیەکی دوورو درێژ هیچ پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بە خۆیەوە نەدیت، تا ئەو دەمەی ئیمپراتۆری یۆنانی بەرەو هەرەس هێنان رۆیشت و فەرمــان رەوایی جیهــان لە دەستی یۆنــانیەکانەوە گواســترایــەوە دەستی رۆمــانیــەکــان لەم سەردەمــەشــدا.. فەرمانرەواییەکی ئەرستۆکراتی بەهێز دێتە مەیدانو هەموو شتێ وا دەردەکەوێ کە هەتا هەتایە جێی خۆی گرتووەو بزواندنی بۆ نییە، لەو سەردەمەدا گەورەترین رەخنەگری رۆمانی هۆراس Horace دەردەکەوێ. هۆراس هاورێیی ئۆگستۆسی پاشا بوو کە حوکمــەکــەی بەڵێنی ئاشتییــەکی گەردوونیو هەمیشــە بەردەوامی دەدا[9] بەڵێ هۆراس گەورەترین رەخنەگری دوای ئەرستۆیە بەڵام ئەم ئەدەبی تەنها لەو روانگەیەوە دەبینی کە لە خزمــەتی رژێمی ئەرستوکراتی ئۆگستۆسدا بێت و زیاتر لەوە بیری لە ئەرکی ئەدەب نەدەکــردەوە، هەر بۆیــە دەربــارەی پاکـژبــوونەوەش نەدەدوا. ئەم وەك و ئەریستۆ نەیدەروانیە ئەدەب بەوەی کە دەبێ کار لە ناخی مرۆڤ بکاو ئاسوودەییەکی پێبدات[10]، وەك و ئەفلاتوونیش شاعیرانی شاربەدەر نەدەکردو شیعــری بە ویـران کەرو روخێنــەر نەدەدایــە قەڵەم[11]. ئەم ئامۆژکاری ئەوانەی دەکرد کە دەیانەوێت ببنە شاعیرو رێگای نیشان دەدان، بەڵام خۆی لەبەر ئەوەی وا بەستەی سیستەمی ئەرستـۆکـراتی ئۆگستۆس بوو کۆنە پارێزو کۆنەپەرست بوو،

بڕوای بە هیچ گۆڕانکارییەك نەبوو. ئاوەڕۆك دەبوو لە خزمەتی ڕژێمی ئۆگستۆسدا بوایەو پێویست بوو نووسەرانیش خۆیان بە کەلەپوورو میراتەوە ببەستنەوە، هەر ئەم بۆچوونە ڕێگای پێ نەدەدا بیر لە ئەرکـی ئەدەب بکـاتـەوە بۆیـە دەربـارەی پاکـژبـوونـەوەش هیـچ شتێکی دیار نییە..دوای هۆراسیش لەسەر ئاستی جیهان تاکە نووسەری دیار یان تاکە ڕەخنەگری دیـار لۆنجـاینـایە Longinea کە بە تەواوی ساخ نەبۆتەوە کە کێیەو لە چ سەردەمێکدا ژیاوەو سەر بە چ ڕەگەزێکەو لە کام نەتەوەیە، تەنها ڕای زیاتر بۆ ئەوە دەچێت کە لۆنجاینا لە دیوانی ڕەنـوبیـای شاژنی تەدمـوردا بوو بێت و حەزی لە شاژن کردبێت، هەرچەندە ئەمەیان گرنگ نییە بە لای ئێمەوە بەڵکو مەبەستی سەرەکی من ئاماژە کردنە بۆ ڕاو بۆچوونەکانی ئەم ڕەخنـەگـرە دەربارەی ئەرکی ئەدەب لۆنجاینا بە هیچ کلۆجێ دەربـارەی پاکژبوونەوە نەدوا، بەڵکو باسی کاریگەری ئەدەبی کرد، گرنگی دایە ئەو کارتێکردنەی ئەدەب کە مرۆڤ دڵخۆش و خەنیو ئاسوودە دەکات، بەڵێ گرنگی بە خەنیکردنی خوێنەرو بینەرداو یەکەمین تیۆری کاریگەری ئەدەبی بە دەست هێنا[۱۲]. کە ئەویش پێی دەوتـرێـت (تـسـامی ـ Sublime) واتـە گواستنەوەی خوێنەر یان بینەر لە ئاستێکیوە بۆ ئاستێکی باڵا دیارە ئەمەش پێچەوانەی پرۆسێسی پاکژبوونەوەیە. بە پێی ڕاو بۆچوونی دایڤد دەچز لۆنجاینا لە سەدەی سێیەمدا ژیاوەو لە دوای ئەویش لە مێژووی ئەدەبدا هەتا سەردەمی بوژاندنەوە Renaissance کەسێکیتر دەرنەکەوت.

لەم سەردەمـەدا واتـە چەرخی بوژانەوە شەپۆلی جوڵاندنەوەو بەخۆدا هاتنەوەو ژیانەوەی ئەدەب و فەلسەفەو زانست و.. هتد لە ئیتالیاوە سەری هەڵداو بەرەو فەرەنساو ئینگلتەرەو ئەڵمانیاو وڵاتـانیتـری ئەورووپـا خۆیکێشا، پاش تێپەڕبوونی چەند سەدەیـەکی خامـۆشی جارێکی دی مرۆڤـایـەتی کەوتەوە نێو جیـهـانی پڕ کێشـەو ئاڵۆزی هونـەرو ئەدەبـەوە زانست و فەلسـەفـەش شان بە شانی بوارەکـانی دی لەبرەوستاندندا بوون. ئا لەم سەردەمەدا واتە لە سەدەی پازدەدا تراژیدی لە هەموو لایەنەکانی تری ئەدەب زیاتر برەوی پێ دراو پێشکەوت و چەندین شاکاری نەمر دەرکەوتن دیارە ئەم بەخشە مەزنەش لەسەر دەستی کریستۆڤەر مارلۆو کیدو شکسپیردا هاتە گۆڕێو بگرە چەند قۆناغێك پێش تراژیدیای گریك کەوت. دەیەها پیەسی تراژیدی مەزنی لە جۆری دکتۆر فاوست و هاملێت و ماکبێث و ئۆتـیللۆو شالیرو.. لە دایـك بوون . من لێرەدا تەنهـا باسی سەرهـەڵدانی تراژیدیام کردو هەموو لایەنەکانی ترم فەراهەم کرد، ئەویش لەبەر ئەو هۆیەیە کە سەرچاوەی باسەکەی ئێمە (پاکژ بوونەوە) بە پێی پێناسەکەی ئەرستۆ تەنها تراژیدیایە. بەڵام پاکژبوونەوە لە چەرخی بوژانەوەدا شێوازێکی پێچەوانەی پێنـاسەکەی ئەرستۆی بە خۆی گرت گەرچی ڕای باو لەسەر ئەوە سوور بوو کە لە ئەنجامی بینینی نمایشگی تراژیدیەکی چاك و پەسـەنـدەوە بە ئەنـجـام دێـت، بەڵام لە شێـوەی لێکـدانـەوەیدا پێچەوانەی پێشتر بوو. ئەم دەیگووت (واتە لە چەرخی بوژانـەوەدا).. بینـەری تراژیدیا لە ئەنجامی بینینی دیمـەنی خوێنـاویو پڕ مەترسی سەرتەختەی شانۆوە ڕادێت ئەگەر لە ژیانی ئاسایی ڕۆژانەیدا دیمەنی لەو جۆرەی بینی یان بە سەر خۆی هات بەهیچ جۆرێك لێی نەترسێو بەرامبەری چاو قایم و خۆڕاگر بێت ، ئەمەش پێی دەوترێت (بە بەرد بوونە تێور Hawding theory بەڵام ئەمە واتا جێۆلۆجیەکە ناگرێتەوە بەڵکو مەبەست سست بوون و لەناوچوونی هەستی ترسنۆکیو سۆزو هەڵچـون دەگـرێتەوە ئەویش لە ئەنجامی ڕاهاتنەوەی لەگەڵ دیمـەنـە پڕ مەتـرسیەکاندا. بۆ نموونە سەربازێك بەر لەوەی بچێتە مەیدانی جەنگ زۆر دەترسێت ، کاتێ یەکەم جار دەبینێ کەسێ لە تەنیشتیا دەکوژرێت و چاوی بە ڕووداوەکە دەکەوێ نزیکە زنوقی بچێت ، هێدی هێدی ڕادێت تا دواجار. وای لێدێت نەك هەر بەسەر لاشەی کوژراواندا باز بدات بەڵکو بشیان کاتە سەنگەرو شەڕیان لە پاڵدا بکات.

ئەم تێڕوانینـەی بە بەرد بوونە تیۆر هەتا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم بەردەوام بوو.. بە تایبەتی لە سەردەمی کلاسیزمی نوێدا Neo Classism زیاتر لە هەموو کاتێ بن بەست بوو هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵی ئاوەزو مێشك لەم سەردەمەدا تێکرا ئەدەب پشتی لە هەست و سۆزو هەڵچوون و ورووژاندن کردو هەمـوو گرنگیو نرخ پێدانێکی بۆ ئاوەزو مێشك و بیرکردنەوە بوو. تراژیدیا لەم قۆناغەدا تەنها بە مەبەستی داشۆرین Satire دەنـوسراو وەك و ڕەخنـەیەکی کۆمەڵایەتیش لێکدەدرایەوە بۆ

نموونە گەر سەرنجی هەڵبەستەکانی درایدن و پۆپ و سۆمۆیل جۆنسن بدەین سەرجەم بە مەبەستی داشۆرینی سیستەمی کۆمەڵایەتی‌و پەیوەندی ناتەبای ئەو سەردەمەو دەستەو تاقمە دەسەڵاتدارەکان و فەلسەفەی باوی ئەو کاتەو.. هتد نووسراون و ڕەخنەن لەباری ژیانی ئەوکاتە. سۆمۆیل جۆنسن لە هەڵبەستە تراژیدیە بەناوبانگەکەیدا بە ناوی «هیچ و پووچی ژیان» داب و نەریت و خوو ڕەوشتی کۆمەڵ بە گشتی‌و چینی ئەرستۆکرات بە تایبەتی دەداتە بەر توانج و ڕەخنەو دایدەشۆرێ. جۆنسن لای وانیە کە بابەتێکی لەم جۆرە هەست و بەزەیی خەڵك ببزوێنێ بەڵکو رقی ڕەشی ئەو خەڵکە بەرامبەر ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتیە برەو پێ دەستێنێ‌و حکـوومتـرو توونـدو تیـژتـری دەکـات. سەردەمـەکـە سەردەمی بەکـارهێنانی ئاوەزو مێشکەو سۆزو هەڵچوونی ڕۆمانسیانە جێگای نابێتەوە پاکژبوونەوەش گەرچی هەر شێوەی بەهێزی بە بەرە بوونە تیۆرە بەڵام هێندی هێندی خۆی بەرەو پاکژبوونەوەی کۆمەڵایەتی دەکوتێ. کە دواجار ئەم لایـەنـە لای ئیبسن و برێخت بە ئاشکرا دەردەکەوێت. لەم سەردەمی کلاسیزمی نوێیەدا .. ڕەخنەگران لایان وابوو کە تراژیـدیـا زانیاری‌یەکی نوێ پێشکەش دەکاو ڕازی بوونێکی ئێستاتیکیشی دەبەخشێ‌و بارێکی لە پێشتر چاکتریش لە زەینی بینەردا دەئافرێنێ‌و ئەم بارەش بەردەوام دەبێت.[14] واتە ئەو باری بەکار هێنانی ئاوەزە لەگەڵ بیرکردنەوەو مێشك بەکارهێناندا کە بینینی یان خوێنـدنـەوەی تراژیـدیەکە دروستی دەکات. بۆ نموونە گووتمان شیعرەکەی جۆنسن بارێکی زەینی جێگیر واتە هەڵوێستێك لای خوێنەر دروست دەکات کە بەرەو دژوەستانی ئەو واقعیە کۆمەڵایەتیە کێشی دەکات کە شیعرەکە دایدەشۆرێ‌و ڕەخنـەی لێ دەگرێ. ئەدەب بە گشتی‌و شیعر بە تایبەتی لە سەردەمی کلاسیـزمی نوێدا وەك و شتێکی ڕەوشتی سەیـر دەکـرا ئەوەتـا دکتـۆر جۆنسنی ڕەخنـەگرو عەمیدی ئەدەبی ئینگلیـزی دەڵێت.. مەبـەستی ئەدەب فێرکـردنـەو مەبەستی شیعریش بەشێکە لە مەبەستی ئەدەب بە بەکارهێنانی کێش و ئیقـاع .. مەبـەستی سەراپـای شیعریش (هونەر) فێرکردنی خۆشەویستی‌و ئاسودەییە .. مەبەستی سەرەکیش لەفێرکردن چاك کردنی ڕەوشتە.[15] کەواتە دکتۆر جۆنسن بەشێکی بیرو بۆ چوونـەکـانی ئەفلاتوون و بەشێکی ئەرستۆی وەرگرتووەو لە

بارەی پاکـژبـوونـەوەشەوە هەمان شێوەی سێر فلیپ سدنی‌و درایدن و پۆپ سەیر دەکات و لای وایە هەر بەرهەمێکی تراژیدی بینەر یان خوێنەر ڕادێنێ بۆ بەرگەگرتن و خۆراگرتنی دیمەنی پڕەترسی‌و خوێناوی یان کارەساتی جەرگ بڕ گەرچی ببینێ یان لە خۆی ڕووبدات.

هەروەك ئاشکرایە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەدا هێدی هێـدی گەشەکردنی ژێر خانی کۆمەڵایەتی برەوی ستاندو .. کێشـەی نێـوان دەرەبەگ و جووتیاران زیاتر زەق دەبووەوە.. چینی ناوەنـدیش لەگـەڵ ئەم گەشەکردن و گۆڕانی ژێرخانی کۆمەڵایەتیەدا بەرەو خۆ دروست کردن و دەرکەوتن دەچوو. لە ئەنجامی پێداویستی‌یەکانی کاری ڕۆژانەو ژیاندا، لەگەڵ لە دایـك بوونی چینی نوێدا واتە چینی بۆرژواو سەرهەڵدانی ئایدۆلۆژیای نوێی ئەم چینە کوژمێکی بەرەو پێشەوەی دایە قۆنـاغی مێـژووی‌و ئەوە بوو لە ئەنجـامی ئەم بەرەو پێشەوە چوونەدا کێشەکان زیاتر چڕو خەست بوونەوەو هەتا شۆڕشی گەورەی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ ئەو هەڵقـەیـەی فەرمـانـی دەرەبـەگـایـەتی شکـانـدو لەگـەڵ فەرمان ڕەوایی بۆرژوادا دروشمی برایەتی‌و یەکسانی‌و هاریکاری هاتە گۆڕێ. هاتنی ئەم سیستەمە کۆمەڵایەتیە نوێیەش لە سەرخانی کۆمەڵدا بە ئاشکـرا بەدەرکەوت و لە پێش هەموو لایەنەکانی تریشدا لە ئەدەبدا ڕەنگی دایەوە. بەڵێ کەوتنی ڕژێمی باستێل و هاتنی ڕژێمی نوێ هەموو شتی گۆڕی .. بیروئارای کلاسیزمی نوێی لە گۆڕناو ئەدەبی ڕۆمانسی چاوی هەڵهێنا، هەر لەگەڵ بە چاپ گەیاندنی Lyrical Ballad لەلایەن وردزۆرث و کۆلرجەوە قۆناغی ڕمانسی بنج بەست بوو. بەڵام ئەوەشی گرنگە ئەوەیە کە هەر لەم

ساتەدا بە بەرد بوونە تیۆر جێی پێ لێژکراو بە تایبەتیش دوای ئەوەی کە شۆڕشی فەرەنسی لە بڕیـارەکـانی پاشگەز بووەوەو نەیتوانی پەیمانەکانی خۆی بۆ گەل بەدی بهێنێت. شاعیرەکان بێ ئومێـد بوون و زیـاتـر کەوتنە نوسین و هەڵدان بە باڵای خۆیانداو ئێش و ئازارو ژانەکانی خۆیانیان دەلاوانەوە.. بەڵێ ئەدەب ڕاستەو خۆ کەوتە دواندنی هەست و سۆزو هەڵچوونی ناخی مرۆڤ و پەیوەندی بە سروشت و جوانی‌و ئافرەت گەڕانەوە بۆ ڕابـردووی بێگـەردی منداڵی دڵێرەدا مەبەست گەڕانەوەی

رۆمانسیانەیە نەك گەرانەوەی فرۆید انە، زیاتر خوردبوونەوە لە خودی جوانیو بە مەبەستی دۆزینەوەی چێژێکی قوڵترو حەقیقەتی ژیانی جوان و دەگمەن.. بێگومان لەم جیهانە ناسکەی رۆمانسیدا هەرگیز جێگای بە بەرد بوونە تیۆر نابێتەوە بۆیە کۆچ و کۆچباری پێچاپەوەو بەرەو نەمان هەنگاوی هەڵنا. لەم قۆناغەدا پاکژبوونەوە بە تەواوی شێوەی گۆرا، واتە شێوازێکی پێچەوانەی قۆناغەکانی بەر لە خۆیی وەرگرت، مەبەستیش لەم پێشەکیە درێژەی قۆناغی رۆمانسی هەر ئەوەبوو کە لەگەڵ گۆرینی سیستەمی کۆمەلایەتیو ئەدەب و ئایدۆلۆژیای سەردەمدا گۆران لە میزاجی بنووسیو خوێنەریشدا روویداو کاریگەری ئەم گۆرانەش لە ئەرکی ئەدەبیشدا رەنگی دایەوە کە پاکژبوونەوە یەکێکە لەو ئەرکانە پێشتر پاکژبوونەوە لای بینەریان خوێنەر رووی دەدا بەلام لە قۆناخی رۆمانسیدا پاکژ بوونەوە شاعیر یان بنووس دروست دەبێت. شاعیر دەکەوێتە دواندنی ناخی خۆییو هەست و سۆزو ژانەکانی خۆی دەلاوێنێتەوە، لە ئەنجامی دەربرین و پەخش کردنی ئازارە دەرونییەکانی خۆیو چەڵەوە. تایبەتییەکانی هەست دەکات باری شانی سووکتر دەبێت، هەوری خەم و خەفەت لە ئاسمانی تەرە دەبن و پاش ئەوەی کە نووسینەکە تەواو دەبێ وا زەمن دەکا دەگاتە دەستی خوێنەرو، خوێنەر لە چەڵەمەکانی ناخی ئەم ئاگادار دەبێت ئاسوودەییو حەوانەوەیەك بە ناخی دەگات، تا سنوورێك پەیوەندی بە واقیعی دەورووبەرییەوە ئاسایی دەبێتەوە، هەر بۆیە لەم قۆناغەدا پاکژبوونەوە بۆ شاعیرە. ئەوەتا مامۆستای گەورەو شاعیری مەزن گۆران دەفەرموێ:

بڵێن بە یار
سەد هەزار جار
منی هەژار
خۆزگەم بە پار
خۆزگەم بە ساڵی رابردوو
عومری کورتی دڵداری بوو

تا دەگاتە کۆتای شیعرەکە گۆران ئازارەکان لە ناخیدا پەنگی خواردۆتەوە لە رێگایە، دەلاقەیە دەروازەیەك دەگەرێت دەرکی داخراویان لێ والاکات، ئاشکرا کردنی ئەم ئازارو ژانەی ناخی گرتووە ئاسودەییەکی پێدەگەیەنێ، گەر کەسێکیش ئاگاداری ناخی ئەم بێت ئەوا کەمێك باری شانی سووکتر دەبێت. ئەوەتا داوا لە خەڵکی دەکات بڵێن بە یارەکەی پاری کە ئەم دەرونی کەیلەو سەد هەزار جار خۆزگە بە پار دەخوازێت، خۆزگە بەو دڵدارییەی ئەوسا دەخوازێت گەرچی تەمەنیشی کورت بوو.. لێرەدا گۆران ئازارەکانی خۆی بە دوو ئاستی بەرامبەری دەگەیەنێ، یەکەمین ناوەندەکە (خەڵکی) کەئەم داوای ئەوەیان لێدەکات بینە هۆ بۆ ئاگادارکردنی یارەکەی پاری کە ئەم ئێستا چەند پەشێو حاڵە.. ئاگاداربوونی ناوەندەکە (خەڵکی) کە باری شانی گۆران سووك دەکات و حەوانەوەیەکی بۆ دێت کە ئەمەش بە ئاکام گەیاندنی پاکژبوونەوەیە واتە دەرپەرینی ئەو هەموو ئێش و ژانە پەنگ خواردووەی ناخی. ئاستی دووەم یارەکەی پارییەتی کە بەهۆی ئاستی یەکەمەوە (ناوەندەکە) ئاگاداری دەکات. ئاگادار بوونی کۆنە یار لەو ئێش و ژانە جەرگ برەی ناخی گۆرانی گرتووە دەبێتە حەکیم و برینەکەی هەتوان دەکات. ناخی شاعیر لەو هەموو ئێش و ئازارە خاڵی دەبێتەوە. دوای تەواو بوونی شیعرەکە مامۆستا گۆران دەحەوێتەوەو دەکەوێتە بارێکی دەرونی هاوسەنگەوە.. بەلام ئەم بارە هاوسەنگییە لای شاعیری رۆمانسی هەستیار ئەوەندە بەردەوام نابێت، بەڵکو هەرزوو ئازارەکان سەرهەڵدەدەنەوەو دیسانەوە شاعیر دەبێ جارێکیتر خۆی لەو بەلا جەرگ برەی ناخی رزگار بکات. ئەویش تەنها دەربرینی ئازارەکانە بۆ خەڵکی واتە دەبێ شیعر بنووسێ شیعرێ کە ئێش و ژانەکانی ناخی لەگەڵ خۆیدا تووردداتە دەرەوەو جارێکی دی ناخی شاعیر خاڵی بکاتەوە بیخاتەوە بارێکی حەوانەوەو هاوسەنگییەوە. هەر مامۆستا گۆران هەندێ جار بەلای خۆیەوە شێوەیەکی وەها جوان نادۆزێتەوە کە شایانی ئەوە بێت هەرچی ئێش و ژان و هیواو خەمەکانیەتی لە دوو تویێدا کۆبکاتەوەو بیگەیەنێتە خوێنەر.. ئەوەندە پەشێوە ئازارە دەروینەکەی بە شێوەیەك هێرشی بۆ هێناوە هەست دەکات ناتوانێت ئەوەی لە ناخیدایە دەری ببرێت هەر بۆیە دەڵێت [هەرچەند دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم بۆم ناخرێتە نێو چوار چێوەی هەڵبەستم] وا هەست دەکات دەربرینەکەی بەو پێیە نییە کە ببێتە پردی پەرینەوەی ئازارو ژانە پەنگ خواردووەکانی ناخیو دیارە لەم بارەشدا پاکژبوونەوە

لای شاعیر بە تەواوەتی بەدی نایەت. بایرۆنی شاعیری مەزنی ئینگلیزیش لە هەڵبەستی [ئەو کاتەی کەوا لێك جیابووینەوە]. دەنگ هەڵدەبڕێو ئێش وژانە پەنگ خواردووەکانی لە دوو تویێی ئەم شیعرەدا گوزارشت دەکات ئەوەتا دەڵێ:

**بە نەهێنی دەچووینە ژووان**
**ئێستاش بە بێ دەنگ**
**ئازار دەچێژم**
**دەشێ ئێستا تۆ بیرت نەمابێ**
**گیانیشت لە ژێر پەردەی فریودان**
**خۆی حەشاردابێ**
**بەڵام گەرهات و دوای ساڵەهای ساڵ**
**پێك شادبووینەوە**
**بە چ شێوازێ پێشوازیت بکەم**
**جگە لە بێدەنگیو**
**بە جووتێ چاوی پڕ فرمێسکەوە**[١٦]

بایـرۆن هەستی پەنـگ خواردووی خۆی ئاشکرا دەکا.. روو دەکـاتـە ئەو کیـژەی پەیـوەنـدی لە گەڵی هەبـووەو ئێسـتـا لێکجیـابـوونـەتەوە. لەو ئاستەوە بۆ خوێنەر دەدوێ، ئێش و ژانەکانی خۆیمان بۆ سەرواڵا دەکات رەنگە شاعیر دوای ئەو رووداوە ناخۆشە لە ناخی خۆیدا هەست بەلاوازی بکات، هەر ئەمەش پاڵی نابێت روو بکاتە خوێنەرو بڵێت خەڵکینە من لاواز نیم، توانیوومە لە گەڵ کیژێ پەیوەندی ببەستم و چەندین جار پەپولەی ماچم لەسەر گوڵی لێوانی نیشتبنەوە.. بەڵێ بەمە باری گرانی سەرشـانی سووك دەبێت و ئێش و ژانـەکـانی کەمتر دەبنـەوەو حەوانـەوەو هاوسـەنگیـەك دەگـاتـە ناخی واتـە دەروونیـکـەیلی لەو هەموو ئێش و ئازارە پاکژ دەبێتەوە. پاش باسی لێوەکردنێکی کورتی پاکژ بوونەوە لە قۆناغی رۆمانسیدا دێینە سەر ئەم بابەتە لە روانگەی بیرو فەلسەفەی نیتشەوە Neithzche هەروەك ئاشکرایـە نیتشە لە چەمکی بروا بوون بەهـێـزەوە Believe in Force دەروانـێـتـە ژیـان و

سروشت و دەوروبەرو لای وایە بزوێنەری مێژوو تەنها هێزە هەر هەمان بروابوونی بەسەر ناخی مرۆڤێشدا دەچەسپێنێو لە هەمان رووانگەوە لێکی دەداتەوە. لای وایە ناخی مرۆڤ لە دوو هێز یان دوو لایەنی بەرامبەرو دژیەك پێکهاتووە کە هەمیشە لە کێشـەیەکی توندو تیژدان و هەریەك دەیەوێت بەسەر ئەوی تریـاندا زاڵ بێو خۆی باڵا دەست بێت« هێزی یەکەم پێی دەوترێت Apullonain کە پاڵنەری گونجاندن و جوانیو فەرمان و جوان رۆییە. دووەمیش پێی دەوترێت Diongsain کە پاڵنەری کاولکـاریو روخـاندنو کاری نامرۆڤانەو ناپەسەندو تێرکردنی خودەو غەریـزەی ئاژاڵانەی مرۆڤ دەنوێنێت[١٧]» لە ئەنجامی کێشـەی توندو تیژی نێوان ئەم دوو هێزە بارێکی ئاسایی و هاوسـەنـگ لە ناخی مرۆڤـدا پێـك دێت چونکـە ئەم کێشەو پێکـدادانـە لە کۆتـاییدا دەبێتـە هۆی دروست بوونی بارە هاوسەنگی یەکەی هەردوو هێزی دژبەیەك یەك بەرامبەر ئەوی دی لە ئاسـتێکی تەبـادا دەوەستن و پێکـەوە سازانێـك لە نێوانیاندا دروست دەبێت. ئەم ئاستە تەبایەش دروست بوونی هێـزی سێیەمە کە دەرئەنجامی پێکدادان و کارێکی هەردوو هێزی دژیەکی پێشووە کە هێزی دەرپەڕیوو خۆ گونجێن و هێمن و هێورەو ناخ دەحەوێننەوەو لەو بارە شلۆقیو کێشمە کێشمە رزگـاری دەبێت. واتـە پاکـژبـوونەوە بە ئەنجام دێت. هیگڵی فەیلەسوف ئەڵمانیش بڕوای وایە هەموو شتێك لەم گەردوونەدا دەرئـەنجـامی کێشەی نێوان دوو هێزی جیاوازەو بەردەوامی ژیانیش هەر لە ئەنجامی ئەو کێشەیەوە دێت. هێزی یەکەم ناو دەنێت Thesis و هێـزی دووەمیش Antithesis . لە ئەنجـامی کێشەی دیالێکتیکانەی نێوان هەردوو هێزەوە بارێکی هاوسەنگی لە گەردووندا دروست دەبێت و ئەویش ئەو بارەی ئێستایە کە تێیدا دەژین و دەبینین کە لە ئەنجامی دروست بوونی هێزی سێیـەمـەوە بە دەست دێت کە پێی دەوتـرێت Synthesis . دەتـوانین کێشەو کارێك و ئەنجامی دەرپەڕیووی هاوسەنگی تیـورەکەی هیگڵ لە شێوەی هاوکێشەیەکدا نیشان بدەین کە ئەنجامە هاوسەنگەکەی پاکژبوونەوە دەنوێنێت. هاوکێشەکەش لەم شێوەیەی خوارەوەدا دەبێت.

**(هێزی سێیەم) ئەنجام (دژی یەکەم) هێزی دووەم هێزی یەکەم.**

**Thesis = Antithesis = Syntesis**

هێـزی سێیـەم کە ئەنجـامی کێشەو کارێکی هێزی یەکەم و دووەمە لەگەڵ دروست بوونیا بارێکی هێورو هێمن دەخوڵقێنێو

ئەگەر لەم بۆچوونەوە سەیری دەروونی مرۆڤ بکەین ئەوا هەمان شێوەی ئەو بارە هاوسەنگیەمان دەستگیر دەبێت. کە لە ئەنجامی هەژاندنی ترس و بەزەییدا لە هەمان کات دا دروست دبێت. واتە پاکژبوونەوە لە روانگەی چەمکی تێروانین و فەلسەفەی هیگڵەوە ئەو بارە هاوسەنگی‌یەیە کە لە ئەنجامی کێشەی توندی دیالکتیکانەی نێوان هێزە دژەکانی گەردوندا دروست دەبێت بۆ نموونە لە ئەنجامی کێشەی توندی دیالکتیکانەی دەرەبەگ و جوتیاراندا چینی ناوەند دروست بوو کە ئەمە بە گوێرەی بارو ئایدۆلۆژیای باوی قۆناغی فیودیالی پاکژبوونەوە دەگەیەنێت. یان ناخی مرۆڤ کۆیلەی کێشەی بەردەوامی نێوان خێرو شەرە.. ئەم کێشە بەردەوامە ش وای کردووە کە مرۆڤ لە بارێکی ئاسایی‌و هاوسەنگدا بێت. واتە لە نێوان هەردوو لایەنەکەدا لایەنی سێیەمی لێ دەردەچێت کە لە هەردوو باری پێشوو جیاوازە.

ئێستاش لایەک بەلای راو بۆچوونەکانی فرۆیددا دەبارەی پاکژبوونەوە دەکەوینەوە بەڵام بەر لەوەی لەم بابەتە بدوێین پێویستە سەرنجێک لە پێکهاتنی کەسایەتی یان ناخی مرۆڤ بە پێی تیۆری فرۆید بدەین. چونکە کاکڵەی بابەتەکەمان لەوەوە سەردەگرێت بە پێی تیۆری دەروون شیکاری فرۆید مێشکی مرۆڤ یان کەسایەتی مرۆڤ دابەش دەبێت بۆ ئید Id ئەو بەشەی مێشک دەگرێتەوە کە ئارەزووە ئاژەڵیەکان و غەریزەی ئاژەڵی‌یەو Animal Instinct پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بە شێوەیەک رەفتار بکات کە هیچ نرخ و بەهایەک بۆ کۆمەڵ و یاسا کۆمەڵایەتیەکان و خێزان و پەیوەندی خێزانی‌و ئایین و یاساو داب و نەریت و خوو رەوشت دانەنێت. بە دوای (ئید)دا یان بەرامبەری (بەرزەمن Super Ego) هەیە ئەمیش ئەو پاڵنەرەیە کە گرنگی بە کۆمەڵ و خێزان و ئایین و داب و نەریت و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان دەداو لایەنە بەرزو مرۆڤایەتیەکان دەگرێتەوە واتە بەرزە من پاڵنەری کاری چاکەو خزمەتگوزاری‌و جوانرۆییە. لە ئەنجامی کێشەی توندو لەبن نەهاتووی ئیدو سوپەرئیگۆردا کە هەر یەکەیان دەیەوێت خۆی بالا دەست بێ‌و دەسەلات بکات لایەنی سێیەمی ئەنجام دێت کە ئەویش (من Ego) یە، هەروەک بێ هێزی هەریەکەیان جۆری کەسایەتیەکە دیاری دەکات. ئیگۆ باری هاوسەنگی کەسایەتی مرۆڤەو لە ئەنجامی پێکدادان و دژوەستان و کێشەی توندی نێوان هەردوو هێزی پێشوو پێک دێت. واتە ئەنجام هاتنی ئیگۆ هەمان شێوەی هاوسەنگی‌و حەوانەوەی ناخی مرۆڤە دوای کێشەی توندی نێوان سۆزو بەزەیی کە ئەرستۆ لە کاتی پێناسەکەیدا بۆ پاکژبوونەوە ئاماژەی بۆ کردووە. کەواتە ئەنجام هاتنی ئیگۆ لە خۆیدا پاکژبوونەوەیە، واتە دەرئەنجامی کێشەی نێوان غەریزەی چاکەو خراپەکاری ئیگۆیان لێ پێک دێت. ئەوەی شایانی باسە لێکچوونێکی تا سنووری نزیک لە نێوان لێکدانەوەی نیتشەو فرۆیددا هەیە بۆ ئەنجامی هاتنی پاکژبوونەوە.

بەڵام ئەگەر لە روانگەی تیۆری دەرونزانی بافلۆفەوە بروانینە ئەم بابەتە واتە پاکژبوونەوە ئەوە دەبێ کرۆکی بۆچوونی بافلۆف وەربگرین و لەو تیشکە نیگایەوە مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکەدا بکەین. هەروەک ئاشکرایە بافلۆف بە پێچەوانەی فرۆیدەوە بچوکترین جوڵەو رەفتاری بنیادەم دەبەستێتەوە بە ژیوارو پەیوەندی‌و باری کۆمەڵایەتیەوە.. دیارە راهاتنیش لای ئەم لە پێش هەموو شتێکەوەیەو مرۆڤ لەگەڵ هەر دیاردەو مامەڵە لەگەڵ کردنێکدا رادێت. ئەنجا دەبێ ساتێ بەرامبەر تەختەی شانۆ دادەنیشێ‌و نمایشی تراژیدیەک دەبینێت لەگەڵ پاڵەوانی تراژیدییەکە یەک بگرێت وا هەست بکات کە پاڵەوانەکە بە شێکە لەم، یان ئێش و ژانەکانی ئەم گوزارشت دەکات؟ ژمارەیەکی دیاری کراو لە هەردوو رەگەزی نێرو مێ‌و لە تەمەنی جیاوازدا کۆدەکەینەوەو بۆ ماوەیەکی دیاری کراو هەموو رۆژێ بەرامبەر نمایشی شانۆگەری هاملێت دایان دەنێین تا بزانین دواجار چیان بەسەر دێت. ئایا هەر لەگەڵ پاڵەواندا جووت دەبن (Idntific-ation)، لەگەڵ فرمێسک رشتن و خۆ خواردنەوەو لێو کرۆشتنی هاملێتدا دەگرین و خۆیان دەخۆنەوە.. بێگومان پاش چەند جارێ دووبارە کردنەوە هەروەک سەگەکە نەک بە لێدانی زەنگەکە لیک بەدەمیاندا دێتە خوارەوە بەڵکو هەر کە دەچنە هۆڵی نمایشی کردنەوە خۆیان بۆ فرمێسک رشتن و لێوکرۆشتن ئامادە دەکەن و واش هەست ناکەن کە پاڵەوان ژانەکانی ئەمان گوزارشت دەکات.

هەروەک چۆن لە تراژیدیای کۆمەڵایەتی ئیبسن دا پاکژ بوونەوە،

پاکـژبـوونەوەی کۆمەڵایەتیە بێگومان لە ڕوانگەی دەروونزانی بافلۆفیشەوە پاکژبوونەوە، پاکژبوونەوەی کۆمەڵایەتی‌یە. تەنها مرۆڤی نەخۆش هەست بە ئێش و ژان و خەم و ئازاری دەروونی یان مێشکی دەکات. هەر ئەم مرۆڤە نەخۆشانەش پێویستیان بە چارەسـەرکـردن هەیـە ، تاکـە چارەسـەر کردنیش لابـردنی هۆیـەکـانی دروستـ‌بوونی ئەو نەخـۆشیـانەیە دیارە ئەوەش ئاشکرایە کە مرۆڤ تەنها لەو کۆمەڵگایانەدا دووچاری ئەم ئێش و ئازارە دەروونیانە دەبێ کە ویستە مادی‌و ڕوحیەکانی مسۆگەر نابێت. دەشێ برسی بێت، باری دارایی چاك نەبێت، یان برسی سێکسی‌و خۆشـەویستی بێت. بەڵام گەرهـات و هەمـ... ئەم پێـداویستیـانەی بۆ دابین کرا ئەوا ئەوسا هەرگیز هەست بە ئازارو ژان و خەم و خەفەتی دەروونی ناکاو بە کۆمەڵ نامۆ نابێت، واتە خۆی لەخۆیدا پاکژ دەبێت. بەڵام مسۆگەر کردنی‌و بەدی هێنانی پێداویستیە مادی‌و ڕۆحیەکانی مرۆڤ کەی بە تەواوی بە ئاکام دەگات؟ بێگومان هۆی سەرەکی ئەمەیە کە بافلۆف لە ڕوانگـەی پەیـوەنـدی کۆمـەڵایـەتی‌و دابـین کردنی هەمـوو ویستـەکـانی مرۆڤـەوە سەیـری تاك دەکاو هەر لەو تیشکە نیگـایـەشـەوە خۆی دەهـاوێتـە بواری لێکدانەوەی دەروونی مرۆڤەوە لە کۆمەڵی نەخۆشدا تاکەکانیش هەموو نەخۆشن، بە پێچەوانەشەوە لە سایەی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆدا کە هەموو پێداوویستی‌یەکانی تاك مسۆگەر بکات نەخۆشی دەروونی زۆر دەگمەنە. کەواتە پاکژبوونەوە لای‌بافلۆف هەمان چەشنی ئیبسن پاکژبوونەوەی کۆمەڵایەتی‌یە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ئیبسنی نەرویجی جارێکی دی گەڕایەوە بۆ لای تراژیـدیـا. هەروەك پێشتـریش باسمـان لێـوەکـرد بەپێی پێنـاسەکەی ئەرستۆ پاکژبوونەوە لە ئەنجامی بینینی نمایشی تراژیدیایەکی پەسەندەوە بە ئاکام دەگات ئیبسن لە تراژیدیا کۆمـەڵایـەتیـەکـەیـدا جەمـاوەری شانۆ وا لێ دەکات لەگەڵ پاڵەوانەکانیدا بگرین ساتێ دکتۆر ستۆکمانی پاڵەوانی دوژمنی گەل[18] بەردە باران دەکـرێ و تەنـەکـەی بۆ لێ دەدرێ‌و لە خانووەکەی دەرکردەێ.. جەماوەر بە بێ ویستی خۆی هەست و سۆزی بۆی دەجوڵێ‌و بێگومان ـ هشترسێت لەوەی کە ئەو لە جێگای دکتۆر ستۆکمان بوایە. لێرەدا سۆزو بەزەیی بەرامبەر بە ترس ڕاوەستـاون. بەڵام ئیـبسـن شانـۆ وا نابـینێت کە

نەخـۆشخـانەیەکی دەروونی بێت و بینەر یە بینینی نمایشەکە حەوانـەوەی بۆ بێت. بەڵکو بڕوای بەوەیە کە ئێمەی مەردووم هەردەم گیرۆدەی دەستی یاسا کۆمەڵایەتیەکانین و کۆمەڵ کۆت و پێوەندی کردوین و ڕێگای لە ویست و خۆزگەکانمان گرتووە. دکتۆر دەیەوێت شارەکەی لە دەست گیرفان بڕو خاوەن گەرماو خانـووەکـان ڕزگار کات. بەڵام ئاسوودەی مرۆڤ لای ئەو لە ئەنجامی هەڵگەڕانـەوەی سیستـەمی کۆمـەڵایەتیەوە دێت. ئێرینای پاڵەوانی شانۆگەری «کاتێ ئێمەی مردوو بە ئاگادێین» ئافـرەتێکـە تینـوێتی دروست کردنی خێـزانێکی ئاسـوودەو بەختـەوەرە، بەڵام مێردەکـەی هیـچ گرنگیشی پێ نادات، لە کۆمـەڵگـایـەکـدا کە سیستـەمی کۆمـەڵایـەتی نەخۆش بێت تاکـەکـانیش ئاسـوودەو بەختـەوەر نین. ئەوسـا خێـزانی بەختـەوەریش دەگمەنە بوونی هەبێت. نوراش لە سیستەمی کۆمـەڵایـەتی بێـزارەو مێردەکـەی کە چینی سەرەوەی کۆمەڵ دەنووێنێ ئازادی پێ‌ڕەوا نابینێ هەربۆیە نورا بە ڕووی ئەو کۆمەڵ دا دەتەقێتەوەو دەرگاکە بە ڕوویدا دادەخات.. دیارە مەبـەستی ئیبسن سووك و ڕیسـوا کردنی ئەو سیستـەمـە کۆمـەڵایـەتیـە کەواتە ئیبس دەزانێ هەتا کۆمەڵ پاکژ نەبێت ئاسـوودەیی‌و حەوانـەوەو بەختـەوەری بوونیـان نابێت. ئەم پاکژبوونەوە کۆمەڵایەتیەش لە ئەنجامی کێشەی دیاکلتیکانەی توونـدو تیـژی نێوان هێزە کۆمەڵایەتیەکانەوە دروست دەبێت چینێکی کۆمـەڵایـەتی دەسـەڵات دەگرێتە دەست کە بتوانێ ئاسوودەیی بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بەدی بهێنێت. ئەو چینە کۆمەڵایەتیەش لە ئەنجامی کێشە توندو تیژەکانی نێوان هێزە کۆمەڵایەتیەکانەوە لە دایك بووە. هەتا ئەمەش بە ئەکام نەگات پاکـژبـوونـەوە بەدی نایـەت و مرۆڤ هەر لە بارە شلۆق و دڵەڕاوکێکـەیـدا دەمێنێتـەوە. هەر بۆیە ئیبسن لەم بارەیەوە دەڵێ.. لە دایك بووین تا ئازارو سزا بچێژین، لە دایك بووین بۆ ئەوەی دوور خراوەی ئاسۆو ڕووی ڕۆژ بین، هاواری ئاسمان دەکەین بەڵام کەڵکی هیچ ناگرێ.

داخـۆ پاکـژبـوونـەوە لای برێخت چۆنەو چۆن دەروانێتە پەیوەندی نێوان ئەکتەرو بینەری شانۆ؟ هەروەك لە پێناسـەکەی ئەرستـۆدا دەرکـەدەکـەوێت پاکژبوونەوە لە ئەنجامی جووت بوونی بینـەرو لەگـەڵ پاڵەوانی شانـۆی تراژیدیدا بەئەنجام

دەکـات. بەڵام برێخت دژی ئەو جووت بوونـە Identification دەوەستێت و بە گەورەترین لایەنی لەنگی شانۆی تەقلیدی Traditional Theater دادەنێت و لەم بارەیەوە دەڵێت: شانۆی ئەرستۆتالیسی هەوڵ دەدات بۆ دروست کردنی ترس و بەزەیی لای بینەر، بۆ خاوێن کردنەوەی هەست و سۆزی‌و ئەمەش وای لێدەکـات پاکـژ بێتەوەو ئارام بگرێت[21] بەڵام دژی ئەم پرۆسێسە دەوەستێت و لای وایە شانۆ دەبێت فێرگەیەکی کۆمەڵایەتی بێت و بینـەر لێـوەی فێربێت نەك نەخـۆشخانەیەك بێت بۆ خاوێن کردنەوەی ناخی پڕ لە ئێش و ئازارو ژانی. ئەو بڕوای وایە کە شانـۆ پێویستە ببێتە هۆی ڕێکخستنی کۆمەڵگاو قوتابخانەی گۆڕانـە کۆمـەڵایـەتیـەکـان بێت[22] جەماوەری شانۆ لەگەڵ پاڵەوانـدا جووت نابێت بەوەی کە گوایـە نوێنـەری ئێش و ژانەکانیانە، بەڵکو بە پێچەوانەوە برێخت لای وایە بینەر دوای چوونـە دەرەوەی لە هۆڵی نوانـدن دەپـرسێ چی ڕووی‌دا؟ بۆ ڕووی‌دا لە هەمان کاتدا ڕادەمێنێ، بەڵێ چی؟ ڕووی داو چۆن ڕووی‌دا؟ ئەو ڕامـانەوا لە بینەر دەکەن بیربکاتەوە، بێگومان بیرکردنەوەش بەرەو وەرگرتن و دیاری کردنی، هەڵوێستی دەبەن کەواتـە بینـەری شانـۆی برێخت دەبێ پاش بینینی نمایشی هەڵوێستی لادروست ببێ. بەم پێیە پاکژبوونەوەی لای برێخت پێچـەوانـەی تیۆری ئەرستۆیەو جووت بوون و پابەند بوونی موگنـاتیسی Identification and Hyphtizing لە نێـوان بینـەرو پاڵەوانـدا دروست نابێت. برێخت لای وایـە شانۆ تەنها ئەوە نی‌یە خۆراکی هەست و سۆز بێ‌و ئاودێریان بکات. چونکە ئەو شانۆیی‌یەی کە تەنها خۆراکی مێشك دەداو ئاودێری هەست و سۆز دەکا هەرزوو لەبیر دەچێتەوە، لەبۆچوونی برێختەوە نابێت. هەست و سۆزی بینەر بورووژێنرێ، بەڵکو دەبێ وای لێ بکرێ بیر بکاتەوە، بەڵام دەمێ کە جووت بوونی نێوان بینـەرو پاڵەوان ڕوودەدات.بیرکـردنـەوە دەبێتە شتێکی چاوەڕوان نەکـراو[23] هەر بۆیە جەماوەری شانۆی ئەرستۆیی هەرگیز داوای بیرکردنەوەو هەڵوێست دیاری کردنیان لێناکرێت بەڵکـو هاتـوون هەتاله ئازارە دەروونیەکانیان ڕزگاریان بێت.. بینـەر کە ڕۆحی بەرەو لای ئەو پاڵەوانـە کێش بووەو ئاسایی بەدوای کۆمـەڵێـك ڕووداو دەکەوێت کە جێگای گومان و بڕوا پێنـەکردنیشن کەچی ئەم بینەرە وەك و ڕاستی‌یەك کە لەبەر چاویدا ڕوودەدات وەری دەگرێت و نەکاتێکی ئەو تۆی هەیە نە ئازادی‌یـەکـی بیرو بۆچـوون تا بەخـۆیـدا بچـێتـەوەو لە تیشکەنیگایەکی ڕاستی ڕەخنەگرانەوە لەسەر ئاستی وابەستە بوونی کۆمەڵایەتی‌و ڕەوشتی ئەو ڕووداوانە پێچەوانە بکاتەوە. ئەمـەش هەمـووی لە ئەنجـامی ئەوەوە دێت کە نووسـەرو ئامـادەکەرو ئەکتەرانیش پیلانێکیان ڕێکخستووە بۆ دروست کردنی وەهمێکی بەهێز لە ڕاستی[24]

برێخت بێ دەنگ نابێ‌و بۆ ڕەت کردنەوەی ڕایەکانی ئەرستۆ دەربارەی کاریگەری تەراژیدیایەکی چاك لەسەر بینەر دەڵێت.. شانـۆ نابێت تەنهـا هەوڵی ئافراندنی ئەم جۆرە وەهمە بدات، بەڵکو پێویستە هەموو هەوڵ و تەقەلایەك بدات بۆ هەڵوەراندنی خونچـەی هەر وەهمێك کە لەسەر ڕاستی دروست دەبێت[25]

لێرەوە بە ئاشکرا ئەوەمان لا ڕوون دەبێتەوە کە برێخت دەیەوێت بینـەری شانۆ وەك و بینەر سەیری نمایش بکات و لە هەمان کاتدا ئاگاداری ئەوەش بێت بووە کە لەبەردەمیدا ڕوودەدات نواندنەو بۆیە پێویستە ئاگاداری زنجیرەی ڕووداوەکان بێت و بینینی [illegible] پرسیاری لادروست بکات و ڕابینینی [illegible] هەڵوێستی خۆی دیاری بکات.

بۆنموونە [illegible] لە شانۆگەری دایکە ئازاکەو منداڵەکانی دا دەبینین دایکە ئازای کاریگەری ... پاڵەوانە [illegible] کە چاوچنۆکی ... هەرچی ڕەنگاییە لە پێناوی دەست کەوتنی پارەدا دەیگۆڕێتە پاره. خۆی دووچاری هەزار دەردەسەری‌و هەڵوێستی ناهەموار دەبێ، منداڵەکانی یەك بە دوای یەکدا دەکوژرێن، هیچی بۆ نامێنێتەوە، دەستەو ئەژنۆ دادەنیشێ.

بەڵام برێخت کەسایەتی دایکە ئازاکەی وا دارشتووە کەمتر مرۆڤ بەزەیی پێدا دێتەوە بگرە زۆربەی هەڵوێستەکانی وا لە مرۆڤ دەکا ڕق و کینەی لێی بێتەوە. هەرچەندە باری جەنگ وای لە دایکە کردووە کە بەها مرۆڤایەتیەکان بێ نرخ و هیچ و پوچ ببینێت، بەڵام هێشتا کەسێکی چاو چنۆکەو لە هەمان کاتدا چاو نەترس و دڵرەقیشە ئەوەتا دوای کوشتنی هەموو منداڵەکانی دەڵێت: هیوادارم هەرخۆم بتوانم عەرەبانەکە پاڵ نێم، بەڵێ دەبێ وا بکەم ئێستا شتێکی واشی تێدا نی‌یە.

پێـویستیشـە جارێکی دی دەست بەکـار بکـەمەوە.. دەست دەکـاتـە پاڵنانی عەرەبانەکەی [٢٦] ئەم هەموو ڕووداوە جەرگ برانـە کاری لێ ناکـات. مادەم ژیان بەردەوامەو مێژوو ڕەوتی ئاسایی خۆی دەکاو ئێمەی مرۆڤیش درەنگ و زوو هەر دەمرین، کەواتە مەرگ شتێکی ئاساییەو پێوست ناکات بۆی نیگەران بین. ئەم کارەساتانە بینەر وا لێ دەکا بیربکاتەوە. ئەی داخۆ لە کاتی ئەو دیمـەنە پڕمەترسیانەدا بەزەیی بە دایکەدا نایەتەوە ناترسێ لەوەی خۆیشی دووچاری ئەو گرفتانە بێت؟ بەڵێ ئەمەیە کە برێخت نکـوڵی لێدەکاو پێمان دەڵێ بینەر نابێت وا هەست بکـات کە پاڵەوان گوزارشتی ئێش و ژانـەکانی ئەو دەکات و لەگـەڵی یەك بگـرێتەوە. بەڵکو لێرەدا ئەو پرسیارەی لادروست دەبێ، دایکە بۆچی هەموو منداڵەکانی دا بەکوشت؟ ئایا پارە ئەوە دەهێنێ ئەوەی لە پێناودا بکرێت؟ ئەو بارە کۆمەڵایەتیەی کەوای لە دایکە ئازاکە کردووە چییە؟ تاوانەکە ئەوە؟ کێ ئەو بارەی خوڵقـانـدووە؟ لە پێنـاوی چیـدا خوڵقاندوویەتی؟ دوا چارەسەر چییە؟ بەڵێ بینەر لە شانۆی برێختدا ئەم پرسیارانە دەکـاو بێ گومـان بیرکردنەوەش وای لێدەکات کە بپرسێت و دواجاریش هەڵوێستی خۆی دیاری بکات.. ئایا لەگەڵ دایکە ئازاکەدا دەوەستێت یان دژی دەبێت؟ هەر ئەم هەڵوێستەش لای برێخت جۆری بیرکردنەوەکەی بینەر دیاری دەکات. کەواتە وەکـو پێشتـریش ئامـاژەمـان بۆ کرد برێخت شانـۆنـاکـاتە نەخۆشخانەیەك بۆ چارەسەرکردنی ئازارە دەروینەکانی بینەر یان دامـاڵینی ئەو ئازارانـە بۆ ساتە وەختێك، بەڵکو شانۆ بە قوتـابخـانـەیـەك دادەنێ کە بینـەر دەخـاتە سەر کەڵکەڵەی بیرکردنەوەو هەڵوێست دیاری کردن. هەر ئەم بیرکردنەوەیەش دەشێ مرۆڤ بە گشتی بەرەو خاوێن بوونـەوە ببـات. چونکـە ئەودەمەی کە بیردەکاتەوە دەشێ بەرەو ئەو ئاراستەیە بکەوێتە جوڵان کە پاکژ بوونەوەی کۆمەڵی تیا مسۆگەر دەبێت واتە دوای دابین کردنی ئازادی تاك و تەبا بوونی ڕەهاتی هەموو مەردووم.


## پەراوێزەکان

1.Oxford Dictionary .P.133

٢ـ لاسل ابركرومبى، قواعد النقد الادبي.ترجمه. د.محمد عوض. ص١٠٨.

٣ـ هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

4 – Addnan Khalid. Lectures On Criticism.

5– David Daiches Critial Approaches to Literature P 35

6– Ibid P 39

7– Brecht: Achoice of EviLs P 123

8– David Daiches Critical Approaches to Literature P 26

٩ ـ نووسەری کورد. ژمارە (٩) خولی (٢) ١٩٨٠ ل ١٧٤

10 – David Daiches Critical Approaches to Literature P 18

11 – Ibid P 35

12 – Ibid P 46

13– Addnan Khalidph D Lectures on Criticism

14 – David Daiche. Critieal Approaches to Literature P 40

١٥ ـ د.عبد الجبار المطلبي. مواقف من الادب والنقد. ص ١٥١

16– English Verse. V. IV. P.P. 219 – 220.

17– Addnan Khalid ph D Lecturs on criticism

18 Ibsen Ghosts and other Plays PenguinBook 1946The Text

19– Ibid The Text

20 Fielde Rolf, ed.Ibsen (Acollection of Critical Essayes Amarica 1974) P173

21– Brecht, Achoice oF Evils P 109

22 Ibid

23 – Ibid p 110

24 Ibid

25 Ibid

26 Brecht Mother Courage and her Children (London 1972) P 81




نوسینی جان بورجس ویلسۆن
محمد رەنجاو کردویە بە کوردی

ئەو باسانـەی کە لە قوتـابخانەکاندا دەخوێنرێن، دەتوانرێ بکرێنە دوو بەش: **زانست و هونەر.**

ماتماتیك و، جوگرافیاو، کیمیاو، فیزیاو، هی تر لەچوار چێوەی زانستدان. بەڵام وێنەکردن و، رەنگکاری و، هەڵکۆڵین و نەخش دروین، شانۆو، مۆسیقاو، ئەدەب، لەناو خانەی هونەرەکاندان.

**لەمەودای لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتانەشدا وا دەردەکـەوێ کە گرنگترین شتێك لە ژیانی شارستانیەتدا هونەرو زانست بن.**

**تۆ بڵێی ئەو مەسەلەیە راستی تێدا بێت ...!؟.**

**ئەگـەر بێتـو رێژەی رۆژێك، لە ژیانی مرۆڤێکی ئاسایی وەرگرین،**

**هەست دەکـەین ئەم مرۆڤـە شوێنـەوارێکی زۆر کەمی هونەرو زانستەکانی پێوە دیارە.**

**مرۆڤێکی ئاسایی بەیانیان لە خەو رادەبێ ، دەچێتە سەر کار، ژەمەکانی دەخواو، رۆژنامەش دەخوێنێتەوە، گوێ لە رادیـۆ دەگـرێ، دەچێتـە سینـەما، رادەکشێ، دەخەوێ، جارێکی تر لە خەو رادەبێتەوە، دووبارە هەمو شتێ سەر لە نوێ دووپات دەکاتەوە.**

**کەواتـە ئەگـەر کاری تایبەتیمان زانست نەبێت، ئەوا تاقی کردنـەوەکانی ئەزمونگاو هاوکێشە زانستیەکان، بۆ زۆربەی ئێمەمانان بێ مانایە.**

**ئەگەر ئێمە خۆمان شاعیرو وێنەکێش و مۆسیقازان نەبین، یاخود مامۆستای وانەکانی ئەدەب و وێنەو مۆسیقا نەبین، ئەوا وا هەست دەکەین ئەو باسانە تەنها پەیوەندیان بە قوتابی قوتابخانەکانەوە هەیە.**

**سەرەرای هەمـو ئەوانـەش خەڵکی جاران و تویـانـەو ئێستـاش هەر دەڵێن کە [شکـۆی شارستـانیـەتی ئێمـە ئەمەکداری زانایان و هونەرمەندانە]**

**یۆنانی کۆن بەهۆی ماتماتیك زانانی وەك ئەقلیدس و فیساگۆرس و، شاعیرانی وەك هۆمیرۆس و شانۆنویسانی وەك سۆفۆکلیس لە بیرماونەتەوە لەوانەیە هەتا دوو هەزار ساڵی تر، نەهرۆو ئیزنهاوەرو چەرچڵ لە یاد بچنەوە، بەڵام ئەلبرت ئەنشتاین و مادام کۆری و بەرناردشۆو سبیلیوس ، هەتا هەتایە بە نەمری دەمێننەوە.**

کەواتـە گرنگی‌ی زانست و هونەرەکان لە چیەوە سەرچاوە هەڵدەگـرێ؟ من وای دادەنێم تۆ بەنیسبـەت زانستـەکانەوە

وەڵامت پێ یـەو، دەڵێ ئێمـە رادیۆو پەنسلین و تەلەفزیۆن و تەسجیل و ئۆتۆمبێل و فڕۆکەو کۆندەیشن و ... هتد مان هەیەو پێویستیەکی زۆرمان بەوانە هەیە.

بەلام ئەو دەستکـەوتـانـە هەرگیـز یەکـەمین مەرامی زانست نەبـوون، ئەوانـە لە پەراوێزی کارە بنچینەییەکانەوە سەریان هەڵداوە، واتـە کاتێ زانـا کاری سەرەکی‌ی خۆی بە ئەنجام گەیاندبێ. ئەم کارە سەرەکیەش بە لێکدانەوەیەکی ئاسایی ئاوا دەکـەوێتـەوە، لێـوردبوونەوەی بەردەوام و، بەردەوام پرسیار دەکەی - بۆچی - و رازی نەبون تا وەدەست هێنانی وەلامێك.

مرۆڤی زانا بە سەرسوڕماوی بەرامبەر بونی جیهان رادەمێنێ، بۆ نمونە: ئەو دەیەوێت بزانێت کە - بۆچی ! - ئاو لە پلەیەکی دیاریکراودا دەکولێت و لە پلەیەکی دیاریکراویشدا دەیبەستێ ...!، بۆچی پەنـیر لە گەچ جیـایە....!، یا - بۆچی - رەفتاری مرۆڤێك لە رەفتاری مرۆڤێکی تر جیایە ..!؟.

نە تەنها - بۆچی - بەڵکو چی ...، خوێ لەچی دروست دەکرێ؟ ئەستێرەکان چین ..!، مادە چیە !؟.

وەلامـدانـەوەی ئەو پرسیـارانـە وەك پێویستیەك ژیانی ئێمە ئاسانتر ناکەن. وەلامی ئەو تاکە پرسیارەی کە ئایا ئەتۆم پارچە پارچە دەکرێ...؟ بە جۆرێك ژیانی ئێمەی دژوارتر کردوە، بەلام هەرچۆنێ بێ دەبێ ئەو جۆرە پرسیارانە هەر بکرێن.

فەرمانی مرۆڤ ئەوەیە دەبێ لەشتەکانی دەوروبەر وردبێتەوە، هەولبدات حەقیقەتی جیهانی دەوروبەرمان رون بکاتەوە، وەلامی ئەو پرسیارە بداتەوە کە دەڵێ، بەراستی ئەم جیهانە چیەو بەچی دەچێ؟ حەقیقەتی جیهانی دەوروبەرمان.

**ئاوێ بیر لە ووشـەی حەقیقەت بکەنەوە، ووشەیەکە لە بارەی جۆراو جۆرەوە بەکار دەبرێت، تۆ حەقیقەت بەمن ناڵێیت - حەقیقـەتی هەل و مەرج لە روسیا - حەقیقەت ئیستێتیکایەو ئیستێتیکاش حەقیقەت -**

**من ئەمەوێ لێرەدا بەو پێیەی ئەو لەو دیو رواڵەتی دەرەوەیـدا خۆی حەشارداوە بەکاری بێنم. با نمونەیەك بێـنـمـەوە: - خۆر لە رۆژ هەلاتـەوە هەلدێ و لە رۆژئاواشەوە ئاوا دەبێ - ئەوەی ئێمە دەیبینین ئاوایە. بەلام ئەمـە تەنهـا رواڵەتی دەرەوەیـە لە رابوردودا ئەم رواڵەتی دەرەوەیـەیـان بە حەقیقـەت دەزانێ بەلام لە دوایێدا زانایەك هات و لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەی خۆی دەست پێکردو لە دوایێدا ئەوەی راگەیاند کە حەقیقەتی ئەمە بە تەواوی جیاواز بوە لە رواڵەتی دەرەوەی حەقیقەتەکە ئەوەیە کە زەوی دەسورێتەوە خۆریش هەر وەك خۆی وەستـاوە، کەواتـە رواڵەتی دەرەوە، ئێمـەی فریودابوو، درۆی لەگەڵدا کردوین.**

ئەوەی کە لەبارەی ئەو حەقیقەتە زانستیەوە جێگای سەر سوڕمـانـە ئەوەیـە کە بێ سود دێنە بەر چاوان بۆ مرۆڤێکی ئاسـایی هیـچ جیاوازییەك نیە ئاخۆ ئەوە خۆرە دەسورێتەوە یاخـود ئەمـە زەویـە دەسـورێتەوە، هەر چۆنێ بێ دەبێ ئەو بەیـانیان لەخەو هەڵسێ و ئێوارانیش دەست لە کار هەڵگرێ، بەلام ئەگـەر شتێ بێ سود بوو بێگـومـان بەو مانایە نیە بێ نرخیشە. زاناکان تا ئێستاش لەو بروایەدان کە گەران بە دوای حەقیقەتدا کارێکە گرینگیەکی زۆری هەیە. ئەوان چاوەرێی ئەوەنین کە یاساکانی راکێشان و (الجاذبیە) رێژەیی (النسبیە) ئالوگـۆرێکی مەزن لە ژیانی رۆژانەدا بێنێتە گۆرێ، بەلکو وا بیردەکـەنـەوە کە وەلامـدانەوەی پرسیارە بەردەوامەکانیان لە بارەی جیهانی واقیع و بونەوە هەولدان و چالاکیەکی بەنرخە. لەبەر ئەوە ئێمە دەڵێین کە حەقیقەتی شتێ کە ئەوان بە دوایا وێڵن خۆی لە خۆیا نرخێکە. نرخەکەش ئەو شتەیە کە ژیانی ئێمە بالاتر لە ئاستی تەواو ئاژەڵ دادەنێ، بالاتر لەوەی کە هەر خواردن و خواردنەوەو زاووزێ و خەوتن و مردن بێت.

**دنیای نان وەدەست هێنان و، زاووزێ کردن هەندێ جار بە ژیانی سادەو ئاسایی ناونراوە، - نرخ - یش ئەو شتەیەکە ئەو ژیانە سادەو ئاساییە تەواو دەکاو کامڵی دەکات.**

هەنـدێ کەس دەڵێن ژیانی ئێمە ناخۆش و بێ مانایە، چونکە پابەندی هەندێ شتە کە نامێننەوەو نەمر نین، هەندێ شت کە لە ناو دەچن و دەگـۆردرێن: ئێستا لێرە دانیشتوم، پلەیەك یا هەندێ زیاتر دوور لە هێلی ئیستوا..

ئەوەی کەلە دەوروبـەری ژورە گەرمـەکـەمـایە چاوێکی پێدا دەخشێنم، ئەبینم هیچ شتێکی تیانیە، گەر ئاوا بەردەوام بێت، لەوانەیە هێندەی پێ‌نەچێ ماڵەکەم دابرمێ و مێرولە سپیەکان بەتەواوی بیجون، یان تۆف و زریان بێ تەپێنێ ، ئەو گولانەی

ئێستا لەبەردەمم دان سبەینێ دەژاکێن و سیس دەبن ـ بێگومان منیش وام بەسەر دێت ـ ماشێنی تایبەکەشم لەکار کەوتوە، هەر بۆیەشە من عەودالی شتێکم کە نەمرو هەمیشەیی بێت، شتێ کە تا هەتایە بمێنێتەوە. حەقیقەت ـ نرخ ـ ێکە ئیستێتیکاش ـ نرخ ـ ێکی ترە

ئێستا کە قسەمان لەمەڕ زانایانەوە کرد، من دەگەڕێمەوە سەر هونەرمەندان زانایان گرنگیی زیاتر بە حەقیقەت دەدەن، هونەرمەندانیش بە ئیستێتیکا.

ئێستاش هەندێ کەس، ئەو زانا بیردۆزە زیرەکانەی کە بە فەیلەسوف ناوزەد کراون، لەسەر ئەو ڕایەن کە حەقیقەت و ئیستێتیکا یەك شتن.

ئەوانە دەڵێن تەنها یەك نرخ بونی هەیە، ئەوشتە هەمیشەییەی تا هەتایە دەمێنێتەوە، لێرەدا دەتوانین هێمای(×) ی بۆ بەکار بێنین.

حەقیقەت ئەو ناوەیە لەلایەن زاناکانەوە بەسەر ئەو نرخەدا براوە ئیستێتیکاش لەلایەن هونەرمەندانەوە.

با ئەم مەسەلەیە ڕونتر بکەینەوە مادەیەك هەیە پێی دەوترێ خوێ ، ئەگەر مرۆڤێکی نابینابم دەبێ بۆ ناسینی خوێ سود لە هەستی تام کردن وەرگرم، خوێ بەنیسبەت منەوە مادەیەکە دەتوانرێ بە ـ سوێر ـ ناو ببرێت. ئەگەر چاوساغیش بم، بەڵام هەستی تام کردنم نەبێ دەبێ وا باسی خوێ بکەم کە مادەیەکی بلوری سپیە ئێستا هەردوو وەسف کردنەکە بۆ خۆی دروستن، بەڵام هیچ وەسفێکیان بەتەنێ و خۆی لە خۆیا دروست نیە. هەر یەکێ لەو وەسفانە لایەنێکی لە تاقی کردنەوەی خۆی وەرگرتووە، دەتوانرێ بوترێ کە زاناکان [×] بە ڕێگاو شێوازی خۆیان دەسەلمێنن و هونەرمەندانیش بەڕێگای خۆیان.

ئیستێتیکا ڕویەکی [×]ەو حەقیقەتیش ڕوەکەی تریەتی.

بەڵام با بزانین [×] چیە ..!؟

هەندێ کەس ناویان ناوە دوابڵەی حەقیقەت. هەندێکی تریش دەڵێن حەقیقەت و ئیستێتیکا دوو سیفەتن لە سیفاتەکانی خوا.

بەهەر حاڵ هونەرمەندان و زانایان، هەردوولایان بەدوای شتێکا وێڵن کە بڕوایان وایە حەقیقەتە، بەڵام ڕێگای بەدوادا گەڕانیان جیاوازە زانا مێشکی خۆی بەکاردێنێ، بە ڕەوتێکی لەسەرەخۆی پرس و ڕاو توێژینەوەو هەڵە، دوای لێکۆڵینەوەو تاقی کردنەوەیەکی دورودرێژ وەڵامەکەی خۆی وەدەست دێنێ، ئەو ساتانەش ، بەڕاستی ساتێکی پڕ لە شادومانی و خۆشن. تۆ داستانەکەی ئارخمیدس بە یاد بێنەوە کاتێ لە گەرماوەکەوە دەرپەڕی و هاواری کرد Eureka واتە دۆزیمەوە!

هونەرمەندیش وێڵی بەرهەم هێنانی شتێکە، کە شادومانیەکی لەم چەشنە بۆ خەڵکی تر وەبەربێنێ، شادومانیەك کە زادەی دۆزینەوەی شتێکی نوێیە لە [×]ی حەقیقەتدا، لەوانەیە ئەو وێنەیەك دروست بکات، یا شانۆگەرییەك بنوسێ، هۆنراوەیەك بهۆنێتەوە، بەڵام حەز دەکا کاتێ خەڵکی ئەو شتەی ئەو دەبینن یا دەیخوێننەوە یا دەیبیستن، شاگەشکە ببن و دەست خۆشانەی لێبکەن و بڵێن ـ ئاە کە جوانە ـ.

کەواتە دەتوانرێ وەسفی جوانی بەو سیفەتە بزانرێ کە هەر شتێك لە مێشکدا شادومانیەکی دروست کرد ئەوە جوانیە. ئەو شادو مانیەی گرێدراوی جۆرە دۆزینەوەو تاوو توێ کردنە، مەرجیش نیە ئەو شادومانیە لەسەر دەستی مرۆڤێك بێتە بەرهەم.

دیمەنێکی خۆر ئاوابوون، یا چەپکێ گوڵ و درەختێك لە توانایاندا هەیە شادومانیەکی لەم چەشنەتان پێ ببەخشێ و بڵێن ئاە کە جوانە فەرمانی یەکەمی شتە سروشتیەکانی وەك گوڵ و درەخت و خۆر لەوانەیە ئەوە نەبێ کە جوان بن، بەڵکو ئەوەیە کە تەنیا وەك بون هەن.

بەڵام فەرمانی یەکەم و سەرەکی لای هونەرمەند جوانییە با هەوڵبەین زیاتر لەم بزواندنە هونەریە حاڵی ببین. لە پێش هەموشتێکا ئەوە ئەم شتەیە کە بە وروژاندن و بزواندنێکی هاوکێشە ناسراوە. ئەمە وات لێناکا حەزت لە کاری بێ، ئەگەر تۆ بە ئەحمەق بانگی من بکەیت، یا ناوو ناتۆرەم لێ بنێی ، ئەوا ئەو قسانەت من دەوروژێنن و لەوانەیە لەگەڵیشتا بەشەڕ بێم.

بەڵام شادومانی هەژاندنی هەست و تاقی کردنەوەی جوانی ئارامی بە مرۆڤ دەبەخشێ و خۆشحاڵی دەکا بەو جۆرەی کە بیر دەکەیتەوە شتێکت وەدەست هێناوە، ئەم دەستکەوتەش هەر وەکو پێشتریش ڕونم کردەوە وەدەستهێنانی جۆرە دۆزینەوەیەکە، بەڵام دۆزینەوەی چی!؟، دەتوانم بڵێم کە ئەمە

دۆزینەوەی گەلاڵە بون و هەست کردنە بە یاساو ڕێك و پێکی.
جارێکی تریش دەبێ بۆ ڕونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە پەلە بکەم.
ژیـان بۆ زوربەی ئێمەمانان تەنها تێکەڵیە لەگەڵ هەستەکان، وەك ئەو فلیمە هیچ و پوچەی کە نە داستانێکی دروستی هەیەو نە سەرەتاو کۆتاییەکی واقیعیانە، هەروا زۆر لە ناکۆکیەکان ئێمە گێژو واق وڕماو دەکەن.

ژیان هیچ و پوچ و دزێوە چونکە خەڵکی هەمیشە خەریکی یەکتر لەناو بردنن.

ژیان جوانە چونکە زۆر لە خەڵکی خەریکی ئەوەن لە بەرامبەر یەکتریدا میهرەبانی بنوێنن. هیتلەرو غاندی هەردوکیان مرۆڤ بون، ئێمـە ناشیرینی لەشێکی نەخۆش و ڕێکوپێکی لەشێکی ساغ دەبینین.

هەندێ جار ئێمە دەڵێین ـ ژیان باشە ـ هەندێ جاریش دەڵێن ـ ژیان خراپە ـ، باشە لەم دوو ڕایانەدا کامیان ڕاستن ..!؟

لەم ڕوەوە کە ناتـوانـین وەڵامێکی یەك لایەنی بدەینەوە توشی تەنگـوچـەڵەمـە دەبـین، بەرهـەمی هونـەرمەندێك ئەو وەڵامە یەکـلاییەمان بۆ فەراهەم دێنێ بەو شێوەیەی کە ڕێکوپێکیەك لەژیانی ئێمەدا سۆراغ دەکا. بابزانین ئەمە چۆن ڕودەدا.

هونەرمەند کەرەسەی خاوی هونەرەکەی وەردەگرێ و دەیخاتە ناو قالبـێکـەوە. ئەگـەر تابلۆکێش بێ ئەوا لەو جیهـانـەی دەوروبەری ئێمە چەندان بابەت هەڵدەبژێرێ، سێوێك، بوتڵێك شەراب، مێـزێـك، ڕۆژنـامـەیەك، ئەمانە لە چوار چێوەیەکدا دەنەخشێنێ لەسەر شێوەی ژیانێکی مەنگ و ئارام خۆی دەنوێنێ.

هەموو ئەو بابەتە جۆراو جۆرانە وەك بەشێك لە گەلاڵەیەکی ڕێك و پێك خۆیان دەنوێنن، گەلاڵەیەك کە هەر چوار لایەنەکان لە چوار چێـوەیەکدا پێشان دەدا بەبینینی ئەم چوار چێوەیەش شادومان دەبین، ئەو چوار چێوەیەی کە لە چەند بابەتێکی واوە هەڵێنجراوە کە پێشتر هیچ پەیوەندیەکیان بە یەکترەوە نەبوە.
پەیکەرتاشیش بەردێکی سەختی نارێك و پێك دێنێ و لە شێوەی مرۆڤێکـدا دای دەرێـژێ، لێرەدا یەکیـەتیـەك لەنێوان چەند شتێکی بەتەواوی لێك جیاواز دێتە دی،
لاشەیەکی نەرم و نۆڵ و بەردێکی ڕەق و تەق ، لەنێوان مرۆڤێکی بەدیمەن و بەردێکی نارێك و پێك.

مۆسیقـازانیش بە لەرانـدنـەوەی چەنـد ژێیـەك و فوکـردنە شمشاڵێك، دەنگەکان ڕێك دەخاو ئاوازێکیان لێ بەرهەم دێنێ.
**ڕۆماننوس چەند ڕوداوێك لە ژیانی مرۆڤایەتی وەردەگرێ سەرەتاو کۆتاییەکانی بە چەند ڕوداوێك دەوڵەمەند دەکاو بەمە دەبێتە گەلاڵەو نمونەیەکی تر. یەکیەتی و گەلاڵە بون و نمونەکاری، دەتوانری لە ڕێگاکانی تریشەوە دروست بکرێن.**

**لەوانـەیـە شاعـیر دوو شتی بەتەواوی لێك جیا لە ناو یەکتـریـدا ئاوێتـەکاو بەهۆی شێوازی پڕ لە بەلاغەتی خواستن و وێـك چون، لەنـاو یەکتـریدا جۆشیان دات. ئەلیـۆتی شاعیری نوێخواز دوو وێنەی بە تەواوی لێك جیا هەڵدەبژێری ، ئێوارەیەکی پایزی و نەخۆشێك کەلە نەخۆشخانە چاوەڕوانی کارێکی نەشتەرگەریە، بەم جۆرە ئەم دوو شتانە تێکەڵی یەکتری دەکا.**

**ئێستا لێگەڕێ با من و تۆ**
**بڕۆین**
**لەو کاتەی خۆر ئاوا بومو**
**لە بەردەم ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەدا**
**ڕاکشاوە**
**وەك ئەو نەخۆشەی**
**لەسەر تەختی نەخۆشی کەوتوە.**

بیتهۆڤن لە سیمفۆنیای نۆیەمیدا وا دەکات کە کۆرس گۆرانیەك لەسـەر ئاسمـانی درەوشـاوە بە ئەستـێرە بچڕن و ئاوازێکی پێکـەنین هێنەریش کە بەهۆی نای و فلوتەوە لێدەدرێ لەگەڵ گۆرانیەکەدا جۆشدراوە.

لێرەدا دوو بیری جیـاوازو دژ بەیـەك، سروودێکی ئاسمانی و ئاوازێکی گاڵتە جاری بەیەکەوە دێنێ و لەبۆتەیەکدا جۆشیان دەدا.

لە دواییـدا تۆ دەبینی کە ئەو شادومـانی و بزوانـدنـەی لە شاکـارێکی هونـەری وەدی دێت ، شادومـانی و بزواندنە لە تێڕوانینی ئەو پەیوەندیانە کە پێشتر نەبوون.
تێڕوانینی ڕواڵەتی بەتەواوی لێك جیاوازی ژیان کە لە بواری گەلاڵەیەکا یەکیەتیەکیان وەدەست هێناوەو وەك یەکیان لێ هاتوە. ئەمـەش بەرزتـرین جۆری تاقی کردنـەوەی هونـەریە، بەڵام

نزمترین جۆر هەستی رووتە.
خۆر ئاوابون چ دیمەنێکی رەنگینە!؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە رەنگی تیشکی خۆر ئاوابون ئێمەی لەناو خۆیدا نقوم کردوە. تامی سێو چەند بەلەزەتە! مانای ئەوەیە کە هەستی تام کردنی ئێمە پێشتر تروکراوە. لە نێوان ئەم جۆرە تاقی کردنەوەو تاقی کردنەوەی گەڵاڵەکان جۆرێکی تر دێت، خۆشحاڵی بون بەرامبەر بونی هونەرمەندێکە کە دەتوانێ پەی بە هەستەکانی ئێمە بەرێت.

هونـەرمـەند چەند کەرەسەیەك بۆ توێژینەوەو بە خۆوە گرتنی سۆزە هەڵچونەکانمان پەیدا دەکا، شادومانی هەڵچون، خەم و رق لە دوایشدا بەهانامانەوە دێ تا ئەو شتانە لە بونی خۆمان جیا بکەینەوە با ئەم مەبەستە رونتر بکەمەوە، هەمو هەڵچونێکی بە کەف و کوڵ دەبێ هێمن بکرێتەوە.

کاتێ بەختـەوەرییـەك بەسـەرمـان دێت هاوار دەکـەین و لە خۆشیاندا پێ لەزەوی دەکوتین کاتێ توشی پەژارەیەکیش دەبین هەست دەکەین پێویستیمان بە گریانە، چونکە سۆز پێویستی بە دەربـرینـە ـ واتـە بێتـە دەرێ و فیچقە بکات، وەك چۆن لیمۆیەك دەگوشین شەربەتی لێ دێتە دەرێ و فیچقە دەکات شاعیران و موسیقازانەکان زیرەکیەکی تایبەتیان لە دەربرینی هەڵچونەکانی ئێمەدا هەیە، روداوی مردن لە خێزانێکدا، یا پارە لە دەستدان، یا هەر نەهامەتیەکی تر، بە شیعرو مۆسیقا هێور دەبنەوە، وەك ئەوەی کە ئێمە لە وشەو ئاوازەکاندا هۆیەك پەیدا بکـەین بۆ سرینـەوەی خەم و پەژارە لەبـونماندا بەڵام لەسەر ئاستێکی باڵاتـر تەنگـوچـەڵەمە زاتیەکانمان کەم دەبنەوە کە هەست دەکـەین ئەو تەنگـوچـەڵەمـانـە بەشێکی بچـوکن لە نمونەیەك، ئێمە لێرە جارێکی تر یەکیەتیەکمان وەدەست هێنا، یەکیەتی تاقی کردنەوەیەکی زاتی بەشێکە لە یەکیەتیەکی گەورەتر.

کاتێ هەست بەوە بکـەین پێـویست ناکـا لە بەرامبـەر خەمە زاتیـەکانماندا دۆش دابمێنین، ئەوە بەشێکە لە دەستگایەکی مەزن، خەمەکانی ئێمە بەشێکن لەو دەزگایە کە ئەویش جیهانی بوونـە. کاتێ ئەوەشمـان بۆ رونبێتـەوە کە شتێـك پێویستە، سکاڵاشی بۆ ناکەین.

**بابـەتی باسەکەی ئێمە لەمەر ئەدەبەوەیە، بەڵام ئەوەی گرنگی بە ئەدەب دەدا، لەسەریەتی شتێکیش لە مۆسیقاو وێنـەو پەیکـەرتـاشـین و ئەنـدازیـاری و فلیمسازی و شانـۆشـەوە بزانێ. هەموو هونەرەکان هەوڵدەدەن کارو پەیـامێکی یەکتا لە باسەکانی خۆیانا بێننە دی. ئەوەی لەیـەکیـان جیـا دەکاتەوە تەنها لە کەرەسەو شێوەدایە، کەرەسەی بەکارهێنانیش شێوە هونەریەکان دیار دەکات.**

**جۆرە کەرەسەیەك هەن هەست پێکراوو مەلموسن وەك بەردوو قور، ئەمـانە ئەو کەرەسەیەن کە بەشێوەی مادە تەعبیرەکان دەردەبرن.**

هەنـدێ کەرەسـەش هەیـە لە زەمینـەی ـ کات ـ دایـە وەك وشـەکان و سەماو جوڵانەوەی شانۆیی. واتە هەندێ بابەت دەخـرێنـە خانـەی ـ شوێن ـ وە هەندێ بابەتیش دەخرێنە خانـەی ـ کات ـ وە تۆ دەتـوانی یەکسـەر هەست بەجوانی تابلۆیـەك یا تەلارێـك یا پەیکـەرێـك بکەی بەڵام گوێگرتن لە سیمفۆنیایەك یا خوێندنەوەی شیعرێك پێویستی بە ـ کات ـ ە زۆر جاریش بە کاتێکی دوورو درێژ. هەر بۆیە مۆسیقا و ئەدەب پەیـوەنـدیان بەهێزە وزۆر روی هاوبەشیان هەیە هەردوکیان کەرەسـە کەم تەمـەنـەکـانی دەنگ بەکار دێنن. مۆسیقا وەك کەرەسـەی سەرەتایی سود لە دەنگە بێ ماناکان وەردەگرێت ئەدەبیش لە دەنگە مانادارەکان کە بەووشە ناو دەبرێن.

بەکـارهێنـانی ووشـەکـان بەدوو شێـوەیـە، شێـوەیـەکی هونـەرمـەنـدانەو شێوەیەکی ناهونەرمەندانە، واتە دەتوانرێ بەدوو شێوەی جیاواز تەماشای ووشەکان بکرێت لە راستیشدا هەموو ووشەیەکیش مانایەکی فەرهەنگی هەیە ئەوەی کە مانا زمانەوانی و فەرهەنگیەکەی دەخوێنرێتەوە، یا دەلالەت و چەند تەداعیـاتێـك کە ووشـەکە لەماوەی بەکارهێنانی دوورودرێژی خۆیدا بەدەست دێت.

بۆ نمونە ووشەی دایك لەبەرچاو بگرە. فەرهەنگی زمان یارمەتی ئێوە تەنها بۆ ئەوە دەدات تا لەمانای ئەم ووشەیە بگەیت. مانای ئەم وشەیە ئاوا لێکدەداتەوە، رەگەزی مێینەی دایك و چاوگی گیاندارێك، ئەمە لێکدانەوەیەکی فەرهەنگی ماناکەیە بەڵام ئەم ووشەیە بەو هۆیەی کە ئێمە لەسەرەتاوە بە هاوپێوەندی لەگەڵ دایکـەکـانی خۆمـانـدا بەکاری دێنین زۆر مانای تر بەخۆوە دەگـرێ، گەرم و گوری، پەناگەی بروا پێکردن، ئاسودەگی،

خۆشەویستی ، هەست بەسۆزو خۆشەویستیەکی زۆری دایکەکانمان دەکەین. بەکارهێنانی وشەی دایك هاوپێوەندە لەگەڵ هەندێ شتی تر، ئەو شتانەی سۆزو خۆشەویستیمان بەرامبەریان یەکجار زۆرە، وەك نیشتمانەکەمان ، قوتابخانەکەمان بەدایکی ئازیز ناو دەبرێن. بۆیە دەبێ ئەوە بڵێین کە دایك زۆر دەوڵەمەندە لەو ناوە ناراستەوخۆیانەی کە هەیەتی، مانا ناراستەوخۆکانیش دەگەڕێنەوە بۆ هەستەکان و، دەلالەتەکانیش بۆ عەقل.

بەم جۆرە ئەو چالاکیە هەمە چەشنانەی کە بەکارهێنانی ووشە بەخۆوە دەگرن کاریان ئاراستەکردنی دەستورو ڕاگەیاندنە بۆ نمونە دیاریکردنی یاساکانی یانەیەکی وەرزشی هەوڵدەدرێ تا ووشەکان تەنها لەمانا دەلالەتیەکانی ئەواندا سنور دارێژراو بن.

**نوسەری کتێبێکی زانستی و ئەوانەی یاسا بنچینەییەکانی وڵاتێك نوێ دەکەنەوە ئەوانە گوێ نادەنە هەست و سۆزو هەڵچونەکانی خوێنەر بەڵکو هەڵسوکەوت لەگەڵ عەقڵ و بیرکردنەوەیان دەکەن، چونکە ئەوان ئەدەب نانوسن.**

**نوسەری ئەدەب زیاتر گرنگی بە ماناو ئیشارەتی ناراستەوخۆ دەدات ، بەو ڕێبازە دەتوانێ بە ووشەکانی جۆش و هەڵچون و شادومانیت تێدا بخولقێنێ. ڕەنگ و جوڵەیان لێ وەبەربێنێ. لێرەدا دەتوانرێ ماناکان بە هێشوی دەنگەکان تەشبیە بکرێت.**

**ماناو ئیشارەتە ناراستەو خۆکان دەتوانرێ بەوە تەشبیە بکرێن کە کاتێ نۆتەیەك لە پیانۆیەك دەلەرێتەوە کۆمەڵێك دەنگ دەبیستی، نۆتەی سی نێومراست بە بەهێزی بجوڵێنەرەوە، ئێستا زۆر زیاتر لە نۆتەیەك دەبیستی، تۆ چەند نۆتەیەکی لاوازو ئارام دەبیستی کە پێیان دەوترێ ـ هارمۆنیکەکان ـ نۆتەکە خۆی دەلالەتەو هارمۆنیکەکانیش مانا و ئیشارەتی ناراستەوخۆن.**

**نوسەری ئەدەب، بەتایبەتی ئەگەر شاعیر بێت بەوە لە زانایەك یا یاسازانێك جیا دەکرێتەوە کە سنور بۆ ووشەکان دانانێت زانا دەبێ ووشە تەنها بۆ مانایەك بەکار بێنێت و مانای تر بەدەستەوە نەدات، یاسازانیش هەر بەم شێوەیە. بەڵام جارجارە ووشە ـ وەك ئەوەی نۆتەی دایك لە سەر پیانۆ لێبدرێ ـ بۆی هەیە تا بە ئازادی هەڵبەزێتەوەو بێت و بچێ نەك تەنیا تەداعیاتێك پێویست دەکا بەڵکو هەندێ جار چەند مانایەکی لێك جیاوازیش دەبەخشێ لەوانەیە مانای تریش بەخۆوە بگرێت لێرەدا دوو نمونە دێنمەوە:**

**رابون و کار وەك ئاوازمیەك**
**کەلە شەیپوری دێتە دەرێ**
**بانگم دەکا**
**دڵی منیش لەگەڵ دەنگیا**
**دێتە دەرێ**

ئێمە ئەوە لە مانای زماندا بە بەهێزو ساغ ، یا دەستگایەکی پتەو بەکاردێنین، یاخود هەر پارچەیەکی ڕەق و پتەو، پارچەیەك ئاسن یا تایەکی ماتۆر.

ئێستا لەبواری نوسینێکی زانستی یا یاسایی دەبێ وشە یەك مانای هەبێ.

یان بە مانای یەکەمی ئەم شیعرە بێت یان مانای دووەمی. بەڵام لە نوسینی ئەم شیعرەدا، سنور بۆ دانراوو بەستراوە نین. ئەم وشەیە دەتوانێ دوو مانا بەدەستەوە بدا، دەتوانێ دوو شتی جیاواز لەیەك کاتا بێنێتە دی.

کەواتە ئەم کۆپلە شیعرە ئەم مانایە دەداتە دەست:

من بۆ کارکردن بانگهێشتن کراوم ، خۆم ئامادە دەکەم ، قایشی کۆڵە پشتیە سەربازیە کەم و فیشەکدانەکانم توند دەکەم، بەڵام لە هەمان کاتدا من دەترسم، دڵم وەختە لە هەناومەوە بەربێتەوە، وەك تایە پاسکیلێك کە لەکاتی کەوتندا دەردەپەڕێ و دەکەوێ.

**نمونەی دووەم**

**She Has gone and Me arms are empty**
**I Survey Only awaste Of Wasted Years a head.**

**ئەو ڕۆیشت و**
**ئامێزی من چۆڵ و هۆڵە**
**من عەودالم**
**ئەوەی لەڕوی منیشایە**
**تەنیا خڵتەی ساڵانێکی لە دەست چویە**

دەتۆ سەرنج بدە ووشەی Waste لێرەدا شاعیر چۆن ئەم ووشەیە

بۆ دەنگدانــەوەی قســەکانی خۆی دوبارە دەکاتەوەـ دەڵێ وشەیەکی تر دێنێتە ئاراوە، هەمان دەنگی هەیە، بەڵام نەخشەو ماناکەی جیابە ئەویش وشەی Waist واتە کەمەری بازوەکانی ئەو ئیتر کەمەری دڵدارەکەی لە باوەش ناگرێ.

ئیتر جگە لە بێدەنگی و کپی شتێکی تر نیە.

ئەم نمونانە یارمەتیمان دەدەن بۆ رونکردنەوەی ئەوەی بەرهەم هێنەری ئەدەب چۆن وشەکانی لەسەر کاتەوە جوڵانە پێدەکاو قوڵێتیان پێ دەبەخشێ.

ئەمە تەنها مانای فەرهەنگی بێ چەندو چونی وشەکان نیە ، ئەمە دەنگ و ئاوازە، هێنانە مەیدانی مانای ترە وشەی ترە هەر بەو شێوەیەی کە لەناو هێشوی هارمۆنێکدا ناراستەوخۆ دەخوێنێتەوە.

ئەدەب چەوسێنــەرەوەی وشەکانە، بەڵام ئەدەبیش لقی هەمە جۆری هەیە، هەندێ لق وشە زیاتر لە لقەکانی تر دەچەوسێننەوە.

شیعر زیاتر پشت بە هێزو توانای وشەکان دەبەستێ، بەماناو تێکەیشتنــە جۆراو جۆرو هەمــە لایەنەکانی ئەوان، ئێستاتۆ دەتــوانی بڵێیت کە شیعــر ئەدەبی ترین لقی ئەدەبە ئەدەبی ترینیــانە، چونکە زیاترین مەودای کەرەسە خاوەکانی ئەدەب بەکار دەهێنێ، کە وشەیە.

**رۆژگاری کۆن تاکە جۆری ئەدەب کە هەبوە شیعر بوە، بەڵام پەخشان تەنها بۆ نەخشەی یاساکان و بەڵگەنامەو تیــورە زانستیــەکان بەکار دەهێنرا. لەسەردەمی یۆنانیە کۆنــەکــانــدا شیعــری غەزەل ... شانــۆیی ... حەمــاسی لەشیعــری غەزەلدا شاعــیر بە لێکدانــەوەی هەڵچــونە تایبەتیەکانیەوە خەریك دەبو، عیشق، نەفرەت ، بەزەیی ، ترس ، هەمیشــە پشتی بە پتــەوی وشــەکان دەبەست شاعیر لە شیعری شانۆییدا ناچار نەبو بەو شیوەیە پشت بە وشــەکــان ببــەستێ ـ هەرچــەنــدە شانــۆی یۆنــانی بەشیعری لاوازی لیریکی ئاوێتە ببو ـ لە شانۆدا روداوو داستــانی مرۆڤ لە ئارادا بوو. لە شیعــری حەمــاسیدا، شاعیر دەیتوانی داستانێك بگێڕێتەوەو، سودی لە روداوو پاڵەوان وەردەگرت .**

**خۆی وەك گێرەرەوەیــەك وەدەردەخــســت و توانــای** **نوسینیشی تێداّ پێشان دەدا.**

**ئێمە تا ئەم رۆژگارەی ئەمرۆش ئەو سێ بابەتەمان هەن، بەڵام دوانیان بەشێوەی شیعر جار بە جار نەبێ نانوسرێن شیعری حەماسی و داستان ئێستا بونەتە رۆمان وبەپەخشان ئێستا جار جارە شاعــیران داستــانی شیعــری دەهــۆننــەوە، بەڵام ئەو رەواجــەیــان نیــە.ئێستــا شیعری شانۆیی بۆتە فلیم و دەقی شانــۆیی، زۆر بە دەگمــەن ئەمــرۆ شیعری شانۆیی بەرچاو دەکــەوێت شیعــری غەزەل و لیریــك تاکــە جۆری شیعرە کە ماوەتــەوە ئەمــرۆ شیعــری داستــان و شیعری شانۆیی زۆر دەگمەن بەرچاو دەکەون.**

**شاعیر بە پێچەوانەی شانۆنویس و رۆماننوس، شیعری لیریك** دەنوسێ و لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوی دەکاتەوە، **زۆریش بە تەمای پارەیــی ئەوتۆ نیە لەو رێگەوە جنگی کەوێت.**

**هیچ شاعیرێك** نیە لە رێگەی **شیعرەوە بژێوی ژیانی مسۆگەر بکات.** ئەمەش نیشانەیەکی خراپە، **لەوانەیە ئەمەش ئەوە بداتە دەست کە شیعر پاشەرۆژی روناك نەبێت، بەڵام ئەم باسە قسە زۆر هەڵدەگرێت.**

**ئەدەب لقی تریشی هەیە، هەروەها چەند شتێکی لە ئەدەب نزیك ، یا بەرهــەمی نیمچــە** ئەدەبی.. **کە نابێ ئەوانیش فەرامۆش بکرێن، بەتایبەتی ووتار** نوسین، **وتارنوس کەسێکە کە توانای شیعرو رۆماننوسینی نیە**، یا بەواتایەکی تر لە نوسینی

ووتاردا **گوێ ناداتە شیعرو** داستان.

**لە کۆتاییدا حەز دەکەم سێ چەشنە بنچینەکەی ئەدەب، رۆمــان، شانــۆ، شیعــر، وەبیرخۆت** بێنیتەوە کە زۆربەی **ئاوادارەکانی ئێمەیان لە سەدەکانی** رابوردوەوە بە خۆوە **گرتبو. بەڵام لەو سەردەمەی ئێمەدا** وا دێتە **بەرچاوان کە رۆمان تاکە شێوازێکی ئەدەبیە بەزیندویی دەمێنێتەوەو خوێنــەری شیعــریش بەرەو لاوازی دەروات. زوربــەی خەڵکیش لەزەت لە فلیمێك وەردەگرن تا لە شانۆییەك.**

**بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ، پێشبینی کردنی ئاییندە، بەبێ ئەوەی بە رابوردودا بچینەوە زۆرجار هێندە دادی ئێمەمانان نادات.**

●

# شۆرشی ئاگری داغی
# لە گۆرانییە مێژووییەکاندا

نووسینی: ئوردیخانێ جەلیل
وەرگێرانی لە رووسییەوە رەشاد میران

شۆرشی ساڵی ١٩٢٥ کە بەناوی شۆرشی شێخ سەعید موە لە مێژوودانا سراوە، زۆر بەروونی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی دەستەی فەرمانرەوایانی تورکیای بەرامبەر بە میللەتی کورد دەرخستووە. لە دوای شۆرشیشدا هەمان سیاسەت نەک هەر بەردەوام بوو، بەڵکو گەلێ توندو تیژتریش بوو[1] لە ساڵەکانی ١٩٢٧ - ١٩٢٩دا کۆمیتەی نەتەوەیی تورکیا چەند فەرمانێکی بۆ گواستنەوەی کوردەکان لە ویلایەتە رۆژهەڵاتییەکانەوە بۆ ناوەراستی تورکیا دەرکرد. ئەو دەست و بردەی فەرمانرەوایان هەوڵدانێك بوو بۆ تواندنەوەی ئەو خێڵە کوردانەی کە هەرگیز ملکەچ نەدەبوون، بەتایبەتی فەرمانەکانی ژمارە ١٠٩٧ لە ١٩ی تەموزی ١٩٢٧، ژمارە ١١٧٨ و ١٥٠٥ لە ٢ی حوزەیرانی ١٩٢٩[2] دا دەرهەق کوردان زۆر بێ رەحمانە بوون. لەماوەیەکی کەمدا، بەپێی فەرمانی یەکەم، زیاتر لە ملیۆن و نیوێك لە دانیشتوانی کوردستان بۆ ناوچەکانی ناوەراستی تورکیا گوێزرانەوەو گەلێ ناوچەیان لەوێ پێ ئاوەدان کرانەوە[3]. گرتن و کوشتنی شۆرشگێرەکانی ساڵی ١٩٢٥ و گواستنەوەی خەڵکی بێ تاوان پێنج ساڵی خایاند. لەو کاتانەدا پاشماوەی هێزەکانی شۆرشی شێخ سەعیدو هەموو ئەوانەی لە سیاسەتی رەگەز پەرستانەی تورکەکان نارازی بوون لە ناوچەکانی باکووری رۆژهەڵاتی تورکیا، کە دەکەونە بەینی چیاکانی ئەراراتی گەورەو ئەراراتی بچووك، خۆیان حەشار دابوو. لە دواییدا ئەو شوێنە بوو بە بنکەی سەرەکی شۆرشی تازە[4].

ئەم شۆرشە بەناوی شۆرشی ئەراراتەوە، یا شۆرشی چیای ئاگری (ئاگری - ناوی کوردی چیاکانی ئەراراتە) لە مێژوودا بەناوبانگە. لە ٥/١٠/١٩٢٧دا کۆنگرەیەکی گەورەی پارتە کوردییەکان گیرا. لەم کۆنگرەیەدا نوێنەرانی: پارتی کوردستانی تەعالی کورد تەشکیلات ئیجماعی جیمایس و کورد میللیەت فیرقەسی، لە ناویەك پارتی سیاسی تازە بەناوی (خۆیبوون) یەکیان گرت، ئەو پارتە ئەرکی ئامادەکردن و هەڵگیرسانی شۆرشی پێ سپێردرا.

هێزەکانی شۆرش بە جۆرێکی سەرەکی لە جووتیارە هەژارەکان پێك هاتبوون، ئەوانەی کە جەورو ستەمی فەرمانرەوایە تورکەکان و دەرەبەگە کوردەکانیان لەسەر ئەستۆ بوو. جەماوەری گەل کە سوپایەکی شۆرشگێری پێك هێنا بوو، رزگارکردنی وولات لە چەنگی کۆلۆنیالیزم و شۆڤینیزمی تورکە لاوەکان و دامەزراندنی کوردستانێکی ئازادو سەربەخۆ ئامانجی هەرە سەرەکیی بوو بە بریاری کۆمیتەی چەکداری و سیاسی پارتی (خۆیبوون) سەرکردایەتی شۆرش بە ئیحسان نوری پاشا سپێردرا، کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی شۆرشی شێخ سەعید ئیحسان نوری پاشا لە ماوەیەکی زۆر کورتدا توانی هێزەکانی خێڵی جەلیلی بە سەرکردایەتی ئیبراهیم حەسکێ تیلو - کە بە ئیبراهیم پاشا (برۆ) بەناوبانگ بوو - رێك بخات و بناغەی دەوڵەتە کوردییە تەمەن کورتەکە دابنێت.

لەسەر لووتکەی چیای ئاگری ئالآی کوردان هەڵکرا ئیبراهیم حەسکی تیلو بوو بە سەرکردەی بەڕێوەبەرایەتی ئەهلی. ڕۆژنامەی (ئاگری) بە زمانی کوردی دەرچوو ئەم ڕۆژنامەیە لە کانوونی دووەمی ١٩٣٠دا ووتارێکی ئیحسان نوری پاشای بڵاوکردەوە کە بانگەوازێك بوو بۆ هەموو کوردێکی دڵسۆز بۆ یارمەتی دانی شۆڕشگێڕان بە چەك و ئازووقە[٥] جووتیارە رووت و پێخواسەکان بە چەك و شیرو خەنجەری خۆیانەوە بەرەو ئاگری هەی پێیان لێکرد.

فەرمانڕەوایان هەستیان بە مەترسی تەقگەری نەتەوەیی کورد کرد، کە ڕەنگ بوو ببێ بەهۆی هەڵسانی میللەتانی تری ژێردەستیان بۆیە هەر زوو دەست و بردیان کردو دیسان ـ هەروەکو هەموو جارێك ـ پەنایان بردە بەر کفتوگۆی دووردرێژو یەك لە دوای یەك بۆ ئەوەی دەرفەتی کۆکردنەوەی سوپایە پەرت و بڵاوەکەیان بۆ برەخسێ. لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٧دا کفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش دەستی پێکرد، لەو ماوەیەدا سوپایەکی ٤٥ هەزار کەسی بەتازەترین چەك و تفاقی ئەو کاتە کەمارۆی چیای ئاگری‌و ناوچەکانی تری دابوو سێیەکی هەموو سوپای تورکیا لە دژی شۆڕگێڕەکان خرابووە کار[٦] لە مانگی گوڵانی ١٩٣٠دا دوو تیپی سوپای تورکەکان چیای ئاگریان ئابلووقە دابوو، هێرشی سەرەکی شۆڕگێران لە مانگی حوزەیرانی ١٩٣٠دا دەستی پێکرد. لە شەرەکاندا جگە لە هێزی پیادەو تۆپهاوێژی تورکی هەروەها هێزی ئاسمانیش بەشداری کرد، کوردەکان زۆر ئازایانە دەجەنگان، ئەوپەڕی پاڵەوانیەتی‌یان دەنواند، بەچاکی دەستیان لە تورکەکان دەوەشاند. لە ١١ی حوزەیرانەوە تاکو ١٢ی تەمموزی ١٩٣٠ هەزارو حەوت سەد سەربازو ئەفسەری تورکی‌یان بەدیل گرت شەست مەترەلۆزیان دەست کەوت، بیست و چوار تۆپیان تێکشکاندو بیست و چوار فرۆکەیان خست[٧].

فرۆکەی تورکەکان لە کاتی بۆمبارانداندا بە بۆمبایە سووتێنەرەکانیان زۆر گوندیان سووتاندو گەلێك ژن و منال و پیریان ئەنجن ئەنجن کرد. بەپێی هەندێ سەرچاوە، سوپای تورکی تەنها لە شەرەکانی ١٩٣٠دا (١٥) هەزار کەسیان کوشتووەو ٦٦٠ گوندیان وێران و کاول کردوە[٨] هێزەکانی سوپای تورك بە یاریدەی هێزی ئاسمانی توانییان شۆڕگێڕەکان بەرەو چیاکانی سنووری ئێران ـ تورکیا بکشێنەوە[٩].

لەو کاتەی کە کوشتنی بە کۆمەڵ هەر بەردەوام بوو و میللەتانی جیهان لەم دڕندایەتی واقیان وڕمابوو لە ٣٠ی ئابی ١٩٣٠دا ئینتەرناسیونال (الاممیة)ی دووەم لە کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی‌دا ئەم کردەوانەی تورکەکانی ڕسوا کردو پرۆتێستی بەرامبەر بە کوشتنی خەڵکی بێ تاوان دەربڕی[١٠] بەڵام هەر لەو کاتەشدا سەرۆك وەزیرانی تورکیا عیسمەت ئینۆنۆ و وەزیری داد مەحمود ئەسعەد و کە لە فەرمانبەرانی تر هەرەشەو گورەشەی شۆڤێنیانەیان لە میللەتی کورد دەکرد. لە ٣٠ی ئابی ١٩٣٠دا عیسمەت ئینەنۆ گووتی: تەنها نەتەوەی تورك لە وڵاتەکەماندا مافی ئەوەی هەیە کە خۆی بەنەتەوەو نەژادێکی ڕەسەن بداتە قەڵەم، هیچ کەسێکی تر ئەو مافەی نی‌یە[١١] وەزیری دادیش پاش چەند ڕۆژێك گووتی: لە وڵاتەکەماندا تەنها تورك ئاغەو خودانن. ئەوانەی کە بە ڕەسەن تورکی پاك نین تەنها مافی ئەوەیان هەیە ببن بە خزمەتکارو کۆیلە! با دۆست و دوژمن ئەم ڕاستی‌یە بزانن، هەروەها با چیاکانیش گوێیان لێبێ[١٢]

ئەم سیاسەتە پڕ لە ڕق و کینەیەی دژی مرۆڤایەتی ڕۆژنامەو چاپەمەنی‌یەکانیش گرتبووە، یەکێ لە گۆڤارەکان نووسیبووی:

باشترین شوێن بۆ ئۆتۆنۆمی (مەبەستی شۆڕشی میللەتی کوردە لە پێناوی مافی چارەنووس و دەوڵەتی سەربەخۆدا. نووسەر) ناوەراستی ئەفریقیایە یا یەکێك لە بیابانەکانی لەو شوێنانەی کە ئادەمیزادی نیوە مەیموون ئەژین[١٣]. ئەم جۆرە هەرەشەو پروپاگاندانە گیانێکی پڕ لە دوژمنایەتی‌یان بەرامبەر بە کەمایەتی‌یە نەتەوەییەکان، کە لە سەر خاکی باو باپیرانی خۆیان ئەژین، خولقاند بوو پێش هەمووشیان بەرامبەر بە کوردەکان.

ئەبێ ئەوەمیش بڵێین کەوا لە شۆڕشی چیای ئاگریدا، هەروەکو

له شۆڕشی شێخ سەعیدیش دا، پیاوە ئایندارەکان دەورێکی باڵایان لە دژی ستەمی تورکەکان بینی ، ئەوەش کارێکی گەورەی کردە سەر شۆڕشگێڕەکان.

لێرەدا بەرژەوەندی هەردوولا (واتا بەرژەوەندی ئایندارەکان و جەماوەری رەش و رووتی شۆڕشگێڕ. وەرگێڕ)یەکیان گرتبووەوە. بۆ ئەوەی هەموو رێگەیەك لە شۆڕشگێڕان بگرن، بەتایبەتیش لەوانەی کە شێخەکان سەرکردایەتیان دەکردن، مەجلیس (واتا کۆمیتەی نەتەوەیی تورکیا. وەرگێڕ) چەند مادەیەکی لەدەستووردا هەڵگرت، یەکێك لەوانە ئەوەی دەڵێت کەوا ئاینی دەوڵەتی تورکیا ئیسلامە[14] . بەم جۆرە هەموو جۆرە نارەزایی‌یەك یا بزووتنەوەیەکی رزگاری و نەتەوایەتی یاخود لایەنگری کردنی پیاوە ئایندارەکان دژبە دەوڵەت دەژمێردران. ئەو بڕیارەی مەجلیس رێگەی بۆ دەوڵەت خۆش کرد کەوا هەموو جۆرە دەربڕینێکی نارەزایی خڵتانی خوێن بکات، لە رۆژگارێکی وا ئاڵۆزدا سەرکردە ئاینی‌یەکان دروشمی (گەرانەوە بۆ دەوری خیلافەت)یان هەڵگرتبوو کە لەگەڵ دروشمی سەرەکی شۆڕشی (ئازادی بۆ کوردستان) نەدەگونجا.

لە ئەنجامی شۆڕشەکەی ١٩٣٠دا کەڵێ گۆرانی میللی لە دایك بوون کە ژان و باری سەخت و ناخۆشی میللەتیان دەرئەبڕی. ئەم گۆرانی‌یانە چریکەی دەروونی میللەت بوون، پرۆتێستیان بەرامبەر بە درندەیی دەسەلاتدارە تورکەکان دەکەیاند.

لە ماوەی ٢٢ ساڵدا (١٩٥١ ـ ١٩٧٣) لە هەشت کەس جیاوازەوە (بەتەمەن و بەپیشە) چواردە گۆرانیم دەربارەی شۆڕشی ئاگری داغ و قارەمانەکانی تۆمار کرد. لەو هەشت کەسە دوانیان ئەرمەنی بوون ـ کارە پێتی خاچۆ ئۆکانیان ئیسرائیل ـ لە کوردستانی سوریاوە بۆ ئەرمەنستانی سۆڤیەت گەرابونەوە. ئەوانی تر کوردی سۆڤیەتی بوون لە کازاخستان و ئەرمەنستان و کرخیزیای سۆڤیەتی‌دا ئەژین.

ئەم گۆرانی‌یانە لەناو خەڵکی کوردستاندا زۆر بلاوبن، بە گەواهی کارەپیتی خ. و ئۆکانیان ئی. گۆرانی دەربارەی شۆڕشەکەی ئاگری داغ لە هەر چوار پارچەی کوردستاندا هەیە.

ئەم گۆرانی‌یانە کەوا تێکستەکانیان لەلای من هەن، تەنیا بەشێکن لەو کۆمەڵە گۆرانی‌یانەی کە بەسەر شۆڕشی ١٩٣٠دا هەڵگوتراوون.

گۆرانی کورت کورتن، هەروەکو هەموو گۆرانی‌یەکانی سەرەرێ لە١٠هەتا ٤٥ دێرن. لە هەر چواردە گۆرانیەکاندا باسی شەرەکانی ئەراراتی گەورەو ئەراراتی بچووك دەکرێ، ئەو شەرانەی کە لە گوندی پاشکەند، ئارچیش.

کۆڵپ، دەربەندی زیلاند، لەخوار شارۆچکەی ئیگدیر، گردی گاوگاو... روویانداوە.

دیارە کە هەمووشیان هی ساڵەکانی دوایین، واتا هی پاش شۆڕشن. لە هەموو سترانەکاندا بەسەر قارەمانەکانی شۆڕش هەڵدەگوترێ.زۆر بەرێزەوە ناوی سەرکردەکان ئەهێنرێ ـ ئیحسان نوری پاشا، ئیبراهیم پاشاو هیتر. هەروەها زۆر بەشانازی‌یەوە باسی فەرزەند بەگ ، شێخ زەمان،شێخ یاسین، عەبدولرەحمان، قولی خانی گاسۆ، شێخ قادر، کیرام کەلە قازی، چیلکاوی، عبدالباقی، یەزیدی شێخ سەعید و گەلێکی تریش ئەکرێت . بەلام بایەخی هەرە گەورە بە میللەت و ئازایەتی رۆڵەکانی دراوە میللەت لە گۆرانی‌یەکاندا بە جۆرێکی گشتی بە (رۆڵەکانی عەشیرەت) ناو دەبرێ. جگە لەمەش لەباسی ئەم رووداوانەدا ئەو سەرکردانەش دەست نیشان ئەکرێن کەوا دژی شۆڕشگێڕان جەنگاون وەکو کەمال پاشا، قەرە قاسم پاشا، مستەفا چاوەش.

هەروەها تیایاندا زۆر بەروونی ناوی جوگرافی تۆمار کراون وەکو ناوی گوند و زێ و دەربەند، ئەو شوێنانەی شەریان تێدا کراوە، لە هەموویاندا باسی ئەراراتی گەورەو ئەراراتی بچووك ئەکرێ، چونکە ئەراراتی گەورە ـ هەوارگەی خێڵ و عەشیرەتە کوردە کۆچەرەکان و ئەراراتی بچووك بنکەی شۆڕشگێڕەکان بوو.

هەموو بەندبێژەکان لەوەدا یەك دەگرن کەوا شۆڕش چەند ساڵێك لەدژی زۆرداری‌و ستەمی تورکان بەردەوام بووە و هەموو کوردستانی گرتبووە، هەروەها بە قسەی بەندبێژان، ئامانجی شۆڕشگێڕان دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆبووە یەکێکیان ئەڵێ کەوا شۆڕش حەوت ساڵان بەردەوام بووە، ئەوەش زۆر لەراستی ئەچێ، چونکە پاش

کوژانەوەی ئاگری شۆرش لە جێگای جیاجیادا کاری پارتیزانی هەتا ساڵی ١٩٣٢ش هەر مابوو.

**لەو گۆرانییە مێژووییانەی دەربارەی شۆرشی ئاگری داغ گوتراوون، بەجۆرەکی تایبەتی هەستێکی پڕ لە شانازی بە کوردستانەوەیان تێدا دەربراوە. شەهیدبوون لە پێناوی** کوردستاندا نەمرییە - ئەمەیە ناوەرۆکی سەرەکی گۆرانییەکان لە سترانەکەی کارا پێتی خ. ئەڵێ: ووشەی (راکردن) ووشەیەکی پڕ شوورەیییە و نابێ لە ڕیزی ووشەی (کوردستان)دا بنرێت.

ناتەبایی لە بەینی دەستەو کۆمەڵانی شۆرشگێران وای کرد کە لە بەرهەمەکاندا جگە لە گیانی شۆرشگێری و نیشتمان پەروەری هەروەها ئەو دەنگەش بەرز بێتەوە کە داوای گەرانەوە بەرەو دواوە، بەرەو یاساو رژێمی کۆنی دەوری خیلافەتی ئەکرد ئەو دەنگە نارەزایی دەربەگ و سەرکردەی عەشیرەت و پیاوە ئایندارەکانی دەربڕی کە بەنەمانی خیلافەت زۆرشتیان لەدەست چوو و دەسەلاتیان بە سەر جووتیار و رەش و رووتدا کەم بووەوە. هەر ئەوانەش بوون لەگەڵ پاشماوەی حەمیدیەکاندا شین و رۆرۆیان بوو بۆ سوڵتان عەبدولحەمید و دروشمی (گەرانەوە بەرەو خیلافەت)یان هەڵگرتبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەمانە نەیانتوانی کەسێك لەوانە بۆ لای خۆیان رابکێشن کە دروشمی سەربەخۆیی کوردستانیان بەرزکردبووەوە.

**ئەم گۆرانییانەی کە بەسەر شۆرشی ١٩٣٠ دا گووتراوون پێویستییان بەبایەخی پسپۆران هەیە، ناوەرۆکەکانیان جگە لە پرۆتێستی سیاسیی هەروەها لایەنی کۆمەڵایەتیش دەر ئەخەن. لە باسی ئەو رووداوەگرنگانەی کە دەوریان هەبوە لە دیارکردنی چارەنووسی میللەت، زۆر بە ئاشکرایی هۆش و هەستی جەماوەری میللەتیان تێدا رەنگ ئەداتەوە.**

## شەرێ ئاگریداخێ[١٥]

**دەلۆ -لۆ، لۆ -لۆ، لۆ -لۆ، لۆ -لۆ، لۆ -لۆ، لۆ -لۆ[١٦] دە دایێ، من نزانبوو شەرت و شوروتێ دەولەتێ تەزە وێ**

**- ل مەومیە من نزانبوو شەرت و شوروتێ دەولەتێ تەزەوێ ل مەوا بە، حەیفام تێ ل تەشکیل و ئاغایێ عەشیرەتێ کەکێ عەدۆ، سیارێ - عەرەب، باقێ مەمەد بەگێ، کەکۆ، وێ ل مەنابە[١٧]**

**٥- شێخ زەهار ئەفەندی گۆ:[١٨] گەلی لاوێ عەشیرێ، چێبن، چێ - بخەبتن، ئێندادامە توکەس تونە، ئێندادامە مایە خەلقێ عالەمێ - رەبێ زۆرین، بەلکی کوردستانا عەرەب[١٩]،کەکۆ، وێ خوَل مەرابە،**

دەلۆ - لۆ، لۆ -لۆ، لۆ -لۆ ل من لۆ- لۆ بێ دەلۆلۆ، بێ دەدائێن، شەرەکێ لە قەومییە گریداخا کاڤل وێ ل هەمبەرە،داعوەکێ ل مە قەومییە گریداخێ، کەکۆ، وێ لهەمبەرە، شێخ زەهار ئەفەندی، ئیبراهیم پاشا، ئیحسان نوری بەگی،گەلۆ[٢٠] سەکینیە گرەگرێ عەشیرا تەمامویێ ل سەرە،

١٠- شێخ زەهار ئەفەندی گۆ: گەلی لاوێ عەشیرێ، چێبن، چێ بخەبتن ئێندادا مە توکەس تونە، ئێندادا مەمایە خەلقێ عالەمێ -رەبێ زۆرین، کەکۆ، بەلکی ڤێ سبێ کوردستانا عەرەب وێخو ل مەرابێ.

بێ دەلۆ -لۆ، وێ لۆلۆ، لۆ - لۆ، لۆلۆ، لۆلۆ، لۆلۆ، لۆلۆ، لۆلۆ، لۆلۆ دەدایی شەرەکی لە مەقەومی یەگریداخا کاڤل کە کۆ، وێ ل بەیارا داعوەکێ ل مە قەومییە گریداخاکاڤل ل بەیارا شێخ زەهار ئەفەندی ب سێ دەنگا ل لاوێ عەشیرێ کرە گازی، گۆ: تڤدارەکێ خۆبکن ئەمێ بکشن سەر ئەسکەرێ ڤان نەیارا.

١٥- لاوێ عەشیرێ گۆ: شێخ زەهار ئەفەندی، مالاتە خەراف بە، ئیرۆ سێ رۆژ و سێ شەڤە چاڤامە بریە میراتێ تەیارا، ل پێش مە تێ دەنگێ تۆپا، میراتێ قومارا

مە نەکریە شەرێ تو دەولەتا، مەکریە دەعو و دۆزێ هینگرمێ دوو دوالا، کەکۆ

بێ دەلۆ - لۆ ، وی لۆ - لۆ، لۆلۆ، ویلۆلۆ، لۆلۆوێ، دە دایێ، دێدانێ، ڤێ سبێ شەرەکی ل مە قەومییە ل گەلیێ زیلا[٢١] قەزا ئەردیشێ[٢٢]، ڤێ سبێ سەرخەلاتێ

٢٠- دەنگی تۆپ و تەیارێڤی جان تورکی،[٢٣] کەکۆ، سەرمەدا

چما وه ل هەواتێ، شێخ زەهار ئەفەندی، ئیبراهیم پاشا دوو سێ دەنگا کرنە گازی، گۆ: بابێ بافێ منۆ، چێبن، چێ بخەبتن، گەلۆ تقـدارەکێ خۆ بکن ئەمێ هەرنـە ئیمـدادا هێرشێ وێ عەشیرەتێ، کەکۆ بێ دەلۆ ـ لۆ، وێ لۆلۆ، لۆلۆ، وی لۆلۆ،لۆلۆ دە، دایێ،شەرەکێ ل مەقەومی‌یە ل قەزا ئیدرێ[٢٤] ، کەکۆ، ل باشکەندێ، لۆ، ل بەری پرێ،

دەستێ لاوێ تورکـا دنـێری گشکی وا ب ماکینە،تەماتیسقن
دەستێ لاوێ کوردا دنێرم ڤێ سبێ، گشکی چاپێ ومخۆ ناگرن،

٢٥ـ دو ڤێ چاخێ شێخ سەیدێ ئێزدیا باشکەندێ بو،ئێرۆ سێ رۆژە لاوێ عەشـیرێ شەر خومشکـرێ‌یـە لە سەر قەزا ڤێ ئیدرێ، کەکۆ.

دە لۆلۆ ، لۆ ـ لۆ، لۆ ـ لۆ، لۆ ـ لۆ، لۆ ـ لۆ،ل من، لۆ ـ لۆ بێ دەلۆ ـ لۆ، لۆ ـ لۆ، لۆ ـ لۆ،وی لۆ ـ لۆ، لۆ ـ لۆ

دە دایێ، وی دێرانێ، شەرەکێ ل مە قەومی‌یە ل قەزا ئیدرێ، ل ڤێ ئەدرێنی،

کولێ، تو تێکەڤێ مالا مشیرێ ملازمێ رۆما گەورێ، گەلۆ ڤێ سبێ‌چما (٠٠٠٠٠) دو هەزار عەسکەر دەرباز کری‌یە وێ ژ گرانیشێ،

٣٠ـ ڤێ سبێ توکەسەك تونە دەشێ بریندارێ عەشیرێ بگرە بگەرینە ل دوختەرا، ل لوقمانا، کەکۆ ، لۆ ل ڤێ بالنیسێ دەلۆلۆ، لۆلۆ، ل من، لۆلۆ بێ دەدایێ، وی دێـدانێ، شەرەکێ ل مە قەومی‌یە گریداخا کافل گەلۆ، لۆ ل قونا چی‌یێ،داعوەکێ ل مە قەومی‌یـە گریـداخا کافل، برانۆ، ڤێ پێ، لۆل قونتارا چی‌یێ دەنگی تۆپ و تەیارێ ڤێ جان تورکی تێ فێزا مەدا وێ فێزا بەلەکێ

٣٥ـ دێو خوشکێ بریندارا ب رەبەنن، کەکۆ، توکە سەك تو نینە سەرێ بریـندارێ عەشیرێ هلدە ل عەردێ، قاسەکن سەردا بێژە، برانۆ، قەیدێ حافزێ

دەلۆلۆ، لۆلۆ، ل من، لۆ ـ لۆ
بێ دە دایێ، وی دێـدانێ، شەرەکێ ل مەقەومی‌یە گریداخا کافل، کەکۆ، وێ ل هەمبەرە،

داوەکێ‌ل مە قەومی‌یـە گریداخاکافل، کەکۆ، وێ ل هەمبەرە، شێـخ زەهـار ئەفـەندی، ئیبراهیم پاشا ـ سەکێنە، گرەگرێ عەشیرێ تەمام وێ ل سەرە،

٤٠ـ شێخ زەهار ئەفەندی دوسێ دەنگا کرمگازی، گۆکەلی لاوێ عەشـیرێ، ئینـدادامە تو کەس تونە، ئیندادا مەمایە خەلقێ عالەمێ ـ رەبێ زۆرین، حەزرەتێ عەلی ـ سیارێ دوندلی‌یە، کەکۆ حەسەن، حوسێن، هەیلۆ برانو، ڤێ سبێ، زاڤێ پێغەمبەرە هەی دەلۆلۆ لۆلۆ لۆل منێ

## فەرهەنگۆك

بالنیسە ـ نەخۆشخانە
بخەبتن ـ کار بکەن، تێبکۆشن
بەیار ـ زەوییەکی بەپیت
ـ پ ـ
پرێ ـ پرد
ـ تە ـ
تقدارەك ـ تەدارەك، دەست و برد
ـ چ ـ
چاخێ ـ کاتێ
ـ ح ـ
حەیفام تێ[١] ـ حەیفە
(حافز[١] ـ قورئان خوێن
ـ خ ـ
خەلات ـ شوێنێکە
ـ د ـ
داعوەکێ ل مە قەومی‌یە ـ شەڕەکی ل مەقەومی‌یە
دوال ـ دەولەت
دۆز ـ بیر
دێرانێ ـ بەدبەخت
ـ ر ـ
رەبەن ـ بێ‌بەخت.

ـ س ـ
سەکنی‌یە ـ راوەستاوە.
سیار ـ سوار
ـ ق ـ
قاسەك ـ هەندەك
قومار ـ قومبارە
قونا چیایێ ـ بنی چیا.
قونتارا چیایێ ـ دامێنی چیا.
قەید ـ ئاواز، گۆرانی
ـ ك ـ
کافل ـ کاول، وێران

کرمکازی ـ بانگ کرد

کو لێ ـ نەخۆشی‌یەکە (کولك؟)

ـ گ ـ

گرانیش ـ سنوور

گرە گرە ـ گەورە گەورە

کشکی ـ کشتی

گەور ـ خەلکی

ـ م ـ

مالا تەخەراف بە ـ مال خەراب

میراتێ ـ مەلعون

ـ ن ـ

نەیار ـ دوژمن

ـ و ـ

وێ ل مەوە بە: بۆ ئێمە ـ

وێ حوّ ل مەرابە: پشتگیریمان بکات، لە گەڵ ئێمە هەڵستێ.

ـ هـ ـ

هێسیر ـ بەخسیر، دیل.

هێنگرم ـ گران.

هەمبەر ـ بەرامبەر.

ـ ئی ـ

ئیندادـ () ئیمداد، یارمەتی.

## سەرچاوەکان


**1– Facpatah M.A. Norutuka Typeukux npatriyux kpyzob no OTHowenurok kupgckomy Hacerehueo 1924 – 1936, Kpatkue cooawenurunc – TuTuTa Hapohob A3un, T.XXX, M.1961 C. 120 137**

حەسرەتیان م.ئا. سیاسەتی فەرمانڕەوایانی تورك بەرامبەر بە دانیشتوانی کورد لە ١٩٢٤ ـ ١٩٣٦دا. کۆڤاری کورتە دەنگ و باس دانشگای میللەتانی ئاسیا. بەرگی ٣٠، مۆسکۆ ١٩٦١ ل. ١٢٠ ـ ١٣٧

Hobureb A.O Typusur, Kpatkar Uctopur M.1965, C175

نۆفیچیف ئا.د. تورکیا، کورتە مێژوویەك. مۆسکۆ ١٩٦٥ ل ١٧٥

Abger Dmaabap 6agep Fapyp, Kypgckoe Hausuo Hal,Hoe gbumeHue – and Typ... sun Memgy gbyur Mupobainu bouHamu, guce. Ha Couck, Y2. cTen. KaHg. uc... Hauk, M. 1977, c. 118 - 155

عەبدول جەبار قادر غفور، بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیا لە بەینی هەردوو جەنگی جیهانی‌دا. نەترووحەی دکتۆرا. مۆسکۆ، ١٩٧٧ل 118 –155

2– Dustur, cilt 9, Ankara,1948

3– Rambouti.,les Kurdesetle Droit, Paris, 1948,S.31 - 32

هەروەها حەسرەتیان م. ئا. ل ٢٩

4– TacpaTm M. A., Obeuikobac.A. Tlepocrm to.A. Ozepku ucTopnn Typrun ,M.1983, c.183

حەسرەتیان م. ئا، ئەرێشکۆڤا س. ئا، پیترۆسیان یو.ئا. کورتەی مێژووی تورکیا، موسکو ١٩٨٣ ل ١٨٣.

(×) راستی‌یەکەی (کۆمەڵەی تەعالی و تەرەقی کوردستانە)- وەرگێر.

هەمان سەرچاوە –5

هەمان سەرچاوە –6

7– Angust k. , Le payys de Kamal Ataturk, Leipzig, 1938,p.30 Rambout 30

8– Ta3.3apr BocToka oT 20 uapTa 1931 ErosseThi npeccti Cpegnozo BocToka TawkeHt No.12, 1936,c.14

رۆژنامەی (ئاسۆی رۆژهەلات ـ زاریا ڤەستۆکە) لە ٢٠ی ئازاری ١٩٣١.

هەروەها، نەشرەی رۆژنامەگەری رۆژهەلاتی ناوەراست، تاشقەند ژمارە ١٢، ١٩٣٦ ل ١٤.

٩ـ حەسرەتیان ، سیاسەتی ... ل ١٨٣

10– Rambout,G.30

11. Fa3. Muluet ,OT 31 atzyta 1931 . رۆژنامەی (میللەت) لە ٣١ی ئابی ١٩٣١ Ramtout.4. 31

12– Fa 3.Muluet, oT 19cemTglopk 1931 .

رۆژنامەی (میللەت) لە ١٩ی ئەیلوولی ١٩٣١دا.

IsuT no Ramtout g.31

13– IsuT no Myp. 71 ottu BocTon , M.1930, kH.29 c.xxxiii

14– Ozepka ucTopun Typisun.....c.182

کورتەی مێژووی تورکیا، ل ١٨٢


١٥ـ ئاگریداغ ـ ناوی کوردی چیاکانی ئەراراتە.

١٦ـ لۆ ـ لۆ ـ ئامرازی بانگکردنە بۆ پیاو. لە گۆرانی مێژوویی‌دا ناخۆشو ژان و باری سەخت دەگەیێنێ.

١٧ـ عەدۆ و بابێ مەمەد بەگی، بەشدار بووانی شۆرشن.

١٨ـ شێخ زەهار، یەکێك لە قارەمانەکی شۆرشی ئەراراتە، بەندبێژ شێخ عەبدول باری دەلێت کەوا ئامۆزایەتی.

لەهەموو ئەو گۆرانی‌یانەی لای من شێخ زەهار وەکو قارەمانەکی سەرەکی رووداوەکاز باس دەکرێ.

١٩ـ کوردستانی عەرەبی، مەبەست کوردستانی عیراقە، کە لەماوەی ١٩١٨ ـ ١٩٣٢ چەند بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی و دژ بە ئیمپریالیزمی تێدا بەرپا بوو.

**٢٠ـ ئیبراهیم پاشا، ئیحسان نوری بەگ، سەرکردەی شۆرشی ئەرارات بوون.**

**٢١ـ گەلی زیلا ـ گەلی‌یەکە لە بەینی زنجیرە چیایەك بەهەمان ناو، چیاکانی پشت قەققاس لە چیاکانی ئەرمەنی جیادەکاتەوە.**

**لەم گەلی‌یەدا کاری زۆر بێ‌رەحمانە دەرحەق کوردەکان کراون.**

**٢٢ـ قەزا ئەرەیش ـ قەزا یاقود ناوچەی ئەرەیش**

**٢٣ـ جان تورك، تورکە لاوەکان (تورکیا الفتاة)**

**٢٤ـ ئیدری ـ شارێکە لە ژێر چیاکانی ئەرارات.**

**٢٥ـ لەسالی ١٩٧٠، لە کوندی ئینگیجا لە ناوچەی ئەراراتی لە ئەرمەنستانی سۆڤیەتی‌دا ئەم گۆرانی‌یە تۆمارکراوە.**

**شێخ عەبدول باری (تەمەنی ٦٣ ساڵە)کە خۆی رووداوەکانی بینیوە لە ئەزبەر ئەم گۆرانی‌یەی گووت. نوسخەی ئەسلی گۆرانی‌یەکە لەلایەن نووسەر هەلگیراوە.**

**«شاعیری هیچ قازانجی بۆمن نەبووبێ، ئەو قازانجەی هەبووە کە ئەو ناوە دووورودرێژەی. سەید حەمەد ئەمینی شێخە لیسلامی موکری. لە کۆڵ کردوومەتەوە»**
**هێمن**

**« بیرەوەریی رۆژانی ئاوارەیی و دەربەدەری»**

● سعید یحیی ●

# یادی مامۆستاهێمن

**پایزی ساڵی هەزارو نۆسەدو شەست و هەشتە. لەشکری گەرما ئەو تین و هێزو تاقەتەی نەماوەو خەریکە لە بەرانبەر تەوژمی بای گەڵاوەریندا خۆی نەگرێ و ورە بەربدا.**

**لەدەوروبەری کۆنە گۆرستانەکەی گوندی « ناوپردان»ی سەربەقەزای چۆمان، چادرێکمان هەڵدابوو، جێی دوو تەختی تێدا دەبۆوە. یەکێکیان هی‌من بوو، ئەوەی تر «دڵشاد مەسرەف»ی لەسەر دەنوست. بەنزیکمانەوە چەند چادرێکی دیکەیش هەبوون. ئەوکاتە « ناوپردان» مەڵبەندی سەرکردایەتی شۆرشی کورد بوو، جگە لە بارەگای بارزانی، هەموو دەزگا باڵاکانی شۆرشیان بەرێوە دەبرد لەوێدا گیرسابوونەوە.. مەکتەبی سیاسی پارتی، مەکتەبی تەنفیزی، بەشی عەسکەری، دارایی، راگەیاندن، داد، بێتەل .. هتد..تەنانەت نەخۆشخانەی ناوپردان لە رووی دەرمان و دختۆرەوە لە نەخۆشخانەکانی تر،**
بەتواناتر بوو. لە هەندەرانەوە پزیشکی پسپۆری دەهاتێ[1]

فەرمان بۆمن و دڵشاد دەرچوو، بەیەکجاری بچینە ئێزکەی دەنگی کوردستان. ئەو پێشتریش گۆیندەی بەشی کوردی بوو. منیش بینا لەسەر داوای مامۆستا هەژار دەچمە ئەوێ‌و بەختی خۆم لەبەشە عەرەبییەکەیدا تاقی دەکەمەوە. ئەوحەلە بەپێی رێککەوتنامەی (٢٩)ی حەزیرانی ساڵی ١٩٦٦ کە لەگەڵ عبدالرحمن البزازی سەرۆك وەزیرانی ئەو دەمە مۆرکرابوو، ئێزگە لە کارکەوتبوو. سەیریش لەوە دایە، هەرچی حکوومەتی دەهاتە سەر حوکم، یا نیازی وتوویژی لەگەڵ شۆرشدا بوایە، یەکە داوای ئەوە بوو، چەکی قورس و ئێزگە تسلیم بە حکوومەت بکرێنەوە!

بۆ مەسەلەی چەکی قورس، زۆر ئاگادارنیم.. بەڵام لەسەرەتاکانی دەست پێ کردنی شۆرش، خەڵك شتی سەیریان دەگێرایەوە بۆ نموونە دەیانگوت لە بارەگای فلانە هێز یا

بەتالیۆن، ستوونێکی تەڵەفەنۆنیان بە چادر پۆشیوەو لوولەکەیان بەدەرخستووە. بۆ ئەوەی خەڵك بڵێن تۆپیان هەیەو ورەیان بەرزبێتەوەو ئەگەر دوژمن بیری لە هێرش هێنان کردەوە حسێبی بۆ بکا. بۆ مەسەلەی ئێزگەش دوژمن زراوی لەراگەیاندن دەچوو.. دەبێ چ ئامێریکی پێشکەوتووبێ، دەنگی ئەو کوردە دەگەیەنێتە ناوچە عەرەب نشینەکانی خواروو؟ دەبێ ئێزگەی شۆرش کەل و پەلی لە کوێوە بۆ بێ؟
ئەوەی من ئاگاداربم،تا رۆژی مۆرکردنی پەیمانی « الجزائر» لە نێوان ئێران و عێراقدا ساڵی ١٩٧٥ ، ئێزگەی شۆرش بریتی بوو لە چەند ئامێریکی گەلێ سادەو لە بازارەکانی ئەورووپادا سەربەستانە دەفرۆشران و زۆربەی شارو دامەزراوو زانکۆو کۆمپانیاکانی ئەوێ لەو ئامێرانەیان هەبووە. کوردی بێ پشت و پەنا، کەس رۆژێك لە رۆژان ئێزگەیەکی پێشکەوتووی پێ نەبەخشی چ بەخۆرایی‌و چ بێپارە. ئەوەندە هەبوو ئەندازیارو کارگێرە شۆرشگێرەکان شەوو رۆژ لەبیری پێش خستنی بوون و خەونیان بە « کیلۆسایکل» و «کیلۆ هێرت» و «شەپۆلی کورت» و « شەپۆلی درێژ»وە دەبینی، لەپێش هەموانیش خوالێخۆشبوو عبد الخالق معروف، کە نەخۆی و نەهەڤاڵانی لە هەموو بارو دۆخێکدا لە تاقیکردنەوە نەدەکەوتن و وەکو شانەی هەنگ بەردەوام لە کارکردندا بوون. هەر پارچەیەکی ئێزگەت دەگرت، بەرهەم و ساختی کۆمپانیایەك بوو! وەکو چێشتی دەروێش و راتبەی فەقێکانی جاران وابوو . برادەرێك رێگەی بکەوتبا هەندەران کاك خالیق «یادیان بەخێر ماموستا هەژار وای بانگ دەکرد» لیستەیەکی بۆ پردەکردەوە کە هەر هەموویان کەرەستەو پارچەی یەدەگی هاکەزایی بوون و لە دوکان و فرۆشگەی رادیۆ سازو وەستاکانی ئەوێدا، دەست دەکەوتن. من بۆ خۆم جارێکیان رێگەم کەوتە وولاتێکی ئەو نزیکانەو بەپارەی ئێزگە « مسجلە»یەکی «بەکرە»م بەچل دینار بۆ کرین و تاماوەیەکی زۆر ئەو دەست و ئەم دەستی دەکرد و هەواڵ و چاوپێکەوتنیان لەسەر تۆمار دەکرد! هەژاریی ئێزگە گەیشتبووە رادەیەك لە بەرانبەر «تشویش»ی دەوڵەتدا قورگی بنووسێ و دەنگی کپ بێتەوەو ناچار ئێرەو ئەوی بکاو هەرکاتەی « فوادە بچکۆلانە» لە چۆمانەوە تەلەفۆنی کردو گوتی: دەنگ نەما.. ئەوە برایانی ئێزگە میلی شەپۆل بادەن و لەبەر «هانی هانی»[٢] رابکەن.. خۆ ئەگەر ئێزگە بەهێز بوایەو لەهی خەڵکی دیکەی بکردبا، لائەقەلا، لەدەوروبەری خۆیدا بەچاکی دەبیسترا!

تەمووزی ساڵی ١٩٦٨ حزبی بەعس حوکمی خستە ژێر رکێفی خۆیەوەو وەزیریکی کوردی‌سەر بە شۆرش لە کابینەی وەزیراندا دەست نیشان کرا.. ئەوەندەی نەبرد یارولایەنگرانی خۆیان وەدەرنان ووەزیرە کوردەکەیش هاتەوە ئیدی ناوە ناوە لێرەو لەوێ سوپا هێرشی دەهێناو لەگەڵ پێشمەرگە بەگژ یەکتردا دەچوون. جاکە ئێمەیان رەوانەی ئێزگە کرد، هێشتا قسەی لێوە نەدەکرا. زۆری نەبرد ماموستا هەژار هات و کادرو میلاکی لێ کۆبوونەوەو چاوەرێی ئەوە بووین فووی دەمیکرۆفۆنی بکەین. چەند رۆژێك و پیاوێکی باڵا بەرزی رەقەڵەی بەتەمەناچووی کورتەباڵە. شەرواڵ دەستووری موکریان دەبەر بەسەرو جامانەوە لە هەژاری میوان بوو. بۆسبەینێ بە ئێمەیان ناساندو گوتیان « مام حەسەن» خەڵکی ناوچە پشدەرەو دۆستی لە مێژینەی هەژارە. رەنگە تاماوەیەکی درێژ خایەن بمێنێتەوە،،خوا هەڵناگرێ ئەم ریوایەتە هەر یەك دوو سەعاتان سەری گرت و هەریەکە لای خۆیەوە زەردەخەنەیەکی هاتێ‌و تێگەیشتین بەڵێ ئەم نێوە بۆ ئەوەیە نەبادا پیاوو دارو دەستەی حەمە رەزا شاپێی بزانن و تووشی ئەشکەنجەو ئازاری بکەن. ئەگینا ئەم مام حەسەنە هونەری، من لەزنجیرو تەناف و داروبەند باکم نیە لەت لەتم کەن، بمکوژن هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن»ە.
تەعاروف و چاك و چۆنی و ئێمە خۆش و ئێوە سەر بڵندو کەنگێ هاتی‌و چۆن گەیشتی.. تەواو. مام حەسەن وەکو یەکێك لە کارکەرانی ئێزگە وابوو. پێخەفیان لەژوورەی هەژار بۆ راخست و تۆزی سەفەری پێوە نەماو وەکو میوانێکی خۆشەویست و پایەبەرز بەسەر چاوانیان هێناو داری لەسەر بەرد دانەدەنا.
تا درانگە وەختێکی شەوان سوحبەت و گاڵتەو گەپ و قسەی خۆش و باسی ئەدەبیات و سیاسەت دەکرا. بەرۆژیش تاچێشتەنگاو لەخەو دەماو ئەگەر سەفەری لە پێش نەبوایە، ئەوە لە بارەگادا سەردانی ژووری برادەرانی دەکردو منیشی بێ بەش نەدەکرد.ژوورێکی تەسك و کەس پێ رازی نەبووم بۆخۆم هەڵبژاردبوو. کاریتەکانی ئەوەندە رزیوو رەش هەڵگەرابوون ناچارێ چوارمیتر نایلۆنم پەیدا کردو دامپۆشین. دەڵێن ئەگەر لە چۆڵ و بیاباندا تەنیا تاکە

کەوشێکیشت دەسکەوت لە پێخاوسی باشترە. منیش لەو وەزعەی ئەوکاتە کەسێو چوارو پێنج وەدە بەیەکەوە دەنوستن، قوژبنێکی وام بدەنێ! مەپرسە چەنێ شانازیم پێوە دەکرد. هەندێ برادەر پێیان وابوو بەندە «ئیمتیازم» هەیە!

مامۆستا هێمن عادەتی بەوەگرتبوو، ئەگەر هاتە ژوورەکەی من، جگەرەیەکی بدەمێ و قاوەیەکی نیمچە تاڵ « نسکافە» بخواتەوەو ئەگەر کۆڕو مەجلیسی دیکە نەبوایە، ئەوەتا درانگ دەمایەوە. من ئەوە کاتە لەبێ ئیشوکاری، خۆم سەرگەرمی وێنە کێشان دەکردو هەندێ کەرەستەی تابلۆکێشانم لەم لاولەولاو پەیداکردبوون. پاشان بەهاوبەشی لەگەڵ سمکۆ ناکام و لطیف شاهۆییدا بەیەکەوە پێشانگەیەکمان لە گەلاڵە کردەوە و چەند رۆژێک مایەوەو شەوێک هێمن هات و منیش تەڕ دەستانە قاوەیەکم لەبەردەم دانا. نەختێ بێ دەنگ بوو، سەیرێکی دەوروبەری کردو گوتی: براله جگەرەت نەدامێ! گوتم: بەخوا مامۆستا لە دوێنێ شەوەوە تەرکم داوە. چاوەکانی زیت کردنەوەو خۆی توورە کردو گوتی: جابراله جگەرە چۆن تەرك دەدرێ؟ جگەرە نیشانەی پیاوەتییەو ئەو کەسەی دەعەمەلی نەهێنی کوێی لە پیاو دەکا؟ پاشان نەقلی کابرای موکریانی بۆ گێرامەوە کە «بیلامانێ» وەکو خۆی لاکێش بوو، تەنیا شەمچەو بەردەستێی هەڵدەگرتن.

زستانی ئەو ساڵمان لە «شیناوێ» دابردە سەر، بەهارەکەیشمان هەر لەوێدا پێشوازی لێکردو پاشان بەرێمان کرد. بۆ شەوی نەورۆزیش ئاگرێکی زەلامان لەسەر لووتکەی«مامە رووت»دا داگیرساندو زۆربەی خەڵکی ئەو نێوی پەسنی ئاگرەکەی ئێمەیان دەکرد. دووڕۆژان چەند دارکەرێکی بەتاقەتمان تێ گەیاند بچن داربەروو ببڕن و لەسەریەکی دانێن. دەمە دەمی ئێوارە هەژارو هێمن لە پێشەوە و ئێمەش بەدووایانەوە سەرکەوتین و خەرمانی دار بەڕوومان ئاگرداو بەسروودە نەمرەکەی پیرەمێرد پێشوازی رۆژی ئازادی کرا.

«شیناوێ» کوێرە گوندێك بوو، جگە لە بارەگای ئێزگە، خانوبەرەیەکی دیکەشی لێبوو، کابرایەکی قشووری ناوچەی بادینان بەخۆی و خێزانیەوە تێدا دەژیان .. دوو سێ کوڕی پێشمەرگەی هەبوون و ئەرکی خۆیان لە دوورە ماڵە بابدا دەبینی، ژنەکانیش بەکرێو دەست هەق نان و چێشتیان بۆ دەکردین، بەڵام کە «سڵەمان»ی چێشت لێنەر هات، ئەوان تەنیا نانی ساجیان بۆ دەکردین و چێشتەکە عائیدی سڵەمان بوو.

ئەو کاتە هێمن بەتەواوەتی ئیستراحەتی کردبوو. بەیانیان - بەپێچەوانەی هەژار - ریشی دەتاشیو جل و بەرگی خاوێنی دەپۆشی. ئەگەر یادی دۆستانی بکردابا، چوار پێنج رۆژان وچانی دەدایە خۆیو بەرەو باکوور هەڵدەکشا، بەڵکو هەواڵێکی ئەو دیوی گیرکەوێ تەنیا رووداوێك نەبێ کە ئەوو ئێمەو هەمووانی دڵگیر کرد. شەوێك لەناکاو بوو بەتەقەو هەراو بگرەو بەردە. کوڕو برازاکانی کابرای دراوسێی ئێزگە گومان لە خوشکێکی بێوە ژنی خۆیان پەیدا دەکەن کە پەیوەندی لەگەڵ ناسیاوێکی خۆیان هەیەو وسکی پڕ کردووە. بەر لەماوەیەك ژنە تووشی خوێنبەردان دەبێو ئەوانیش بەپەلە دەیگەیێننە شاری «خانە»ی ئەودیو. پزیشکی خەستەخانە دووای چارەسەرکردن بەدایك و باب و براکانی دەبێژێ: منداڵەکەی لەبەرچوو، بەڵام قەیدی ناکاو ئەوو ئێوە سلامەت بن! ئیدی ئەو شەوە بڕیاریان دابوو.ئەو شەرمە لە سەرخۆیان لابەرن ژنە بەمە دەحەسێو یەکسەر هانا بۆ مامۆستا هەژار دەباو ئەوانیش بەدووایەوە. پرکێشی دەکەن بیهێننە دەرەوە بۆیان ناکرێ، ناچار بڕیارەکە هەر لەوێ جێبەجێ دەکەن و ژنە غەرقی خوێنی خۆی دەکەن و هەر ئەو دەمە تەسلیم بوون. هەژار ئەو کاتە سەرقاڵی وەرگێرانی «شەرەفنامە» بوو، زۆربەی ئێواران هێمن دەخزایەژوورەکانی دیکەو سەرگەرمی تاوڵە دەبوو، بۆیە رووداوەکەی نەبینی.

شەڕ لە نێوان شۆڕش و دەوڵەتدا گەرم بوو، لە زۆربەی بەرەکانی جەنگدا هێرشیان دەهێنا، بەتایبەتی لە دەشتی هەولێرو دۆڵی خۆشناوەتیو ناوچەی رانیەو بیتوێن. فرۆکەیش بەردەوام سەردانی ناوچە رزگارکراوەکانیان دەکرد. شەوێکیان درانگە وەختێك نامەیەکمان لە «م.س»ەوە پێ گەیشت کە رەنگە بەیانی ئێزگەو چەند شوێنێکی دیکە بۆردمان بکرێن. داوایان کردبوو خۆمان قایم بکەین بەرۆژ لە بارەگادا نەمێنین. سەعات (٥)ی سەر لەبەیانی رووەمان کردە قەد شاخ و دۆڵ و نسارەکانی مامە رووت. بۆ نزیك نیوەڕۆ (٢) فرۆکە دەوروبەری گەلاڵەیان بۆردمان کردو ئێمەی نەگرتەوە. هۆی ئەم هێرشە لەناکاوەیش ئەوەبوو، رۆژی پێشتر هێزێکی پێشمەرگە بەسەر

پەرشتیی کاك سامی، دەزگاو دامەزراوە نەوتی‌یەکانی «ستاپ لاین»ی دەوروبەری کەرکوکیان تۆپ باران کردبوو، کۆمپانیا زیانی پێ گەیبوو، لە هەمان کاتدا تیمێکی تەلەفزیۆنی سوید کە بریتی بوو لەسێ کەس وێنەی ئەو رووداوەیان گرتبوو. ئەوانە نزیکەی سێچوار مانگ لە کوردستان مانەوەو زیاتر لە شەست حەوتا سەعات وێنەیان گرت لە حسێبی کۆمپانیایەکی تەلەفزیۆن .. کەچی لە گەرانەوەیاندا ـ وەکو بیستم ـ دەزگاکانی دەوڵەتی ئێرانی ئەو کاتە دەستیان بەسەر داگرت و فلیمیان لێ زەوت کردن.

قسە لێرە دایە، بەهەزار نالی عەلی مامۆستا هەژارمان ئیقناع کرد لە بارەگا بێتە دەرەوەو هێمن دەوری هەبوو. خۆی لێ توورە کردو گووتی: ئەگەر جەنابت لە فرۆکە ناترسی و پێت وایە پێنج و دوو رۆژێك تەمەنت ماوە، شتێکەو وەکو یەکێکی لێپرسراو لە ژیانی ئەم هەموو کورە قۆزانە، ئەوە شتێکی دیکەیە.. ئەگەر ئەتۆمان بەگەڵ نەکەوێ، ئەوانیش نارۆن ..هەژار لەو توورەتر جامانەکەی رێك خست و دەستی دایە گۆچانەکەی‌و گوتی: جا هێمن کێ باسی ئازایەتی کردووە؟ باوکم بەخوا مەسەلە ئەوەندەنیە، بۆ خۆم بێ تاقەتم و توانای راکردنم نەماوە..

ـە رۆژانی ئێزگەدا هەستم دەکرد، هێمن خۆی خەریکی مو ـالەو شیعردانان ناکا.. بەدەگمەن هی تازەمان لێ دبـ ـست و ئەو چەند هەڵبەستانەی ناوە ناوە . دیخوێندنەوە هەموویان پێشتر رێکی خستبوون. ئەگەر . اپەمەنی دەسکەوتبا، ئەوە چاوێکی پێ دەخشاندن و .گەر گۆڤار فارسی بووایە، یەکسەر وشە تێك .ەڵکێشراوەکانی حەل دەکردن، نەبادا قەڵەمی هەژاری .گاتێ و پاشان نێوەرۆکەکەی دەخوێندەوە. پێم وایە د.د غەریبی و بیری خێزان و ماڵ و عەیال و غەمی چا.نووس، کۆسپی بەر رێگەی نووسینی هێمن بوون.

.گەر بە.یکەوت بێ‌و ئەگەر بەتایبەتی، ژمارەیەك گۆڤاری .زکاری، یان بۆ هەژار هێنا، گۆڤارەکە لە سلێمانیدا .ردەچوو.. وتارێکی دژی هەژار بلاوکردبۆوە. هەژار .تەو وشەکانی لێك دەدانەوە رای ئابوو بە پێنووسی .زەبیحی» نووسراوە دەیگوت: زاراوەکانی هی موکریانن و

زمانی خەڵکی کوردستانی ئەو دیوە. هەمان وتار لەبەشە عەرەبی‌یەکەشیدا بلاوکرابۆوە.

لە رۆژانێکی وادا، کۆرو مەجلیس و دانیشتنی شەوانە، لە سیاسەت و لێکۆڵینەوەی بارودۆخ و مەسەلەی کورد، خاڵی نەبوون. باسی وەزع دەکراو جارجارەیش، رەخنەی توندیش دەگیرا. هێمن بۆ خۆی گلەو گازاندەی زۆر بوون.

رەخنەی دەگرت و دەیگوت: بەداخەوە ئێوە ئیش بۆ پیاو دەدۆزنەوە نەك پیاو بۆ ئیش ! جۆ لە بەردەم سەگ دادەنێن و ئێسقان لەبەردەم وولاخ ! دەیگوت: هەر چەندەی بیری لێ دەکەمەوە بۆم ساغ نابێتەوە. ئاخر بنیادەم ئەگەر گوێ نەداتە گۆرانیی کوردی و هەڵپەرکێی رەش بەڵەك هەستی نەبزوێنێ‌و لە فولکلۆری نەتەوەی خۆی نەگات و بەزمانە شیرینەکەی خۆی نەئاخێوێ، چۆن کوردایەتی دەکا؟!

کە بەهار کەوتە نێو تەمەنەوەو گیاو گوڵ خەریك بوون زەرد دەبن، برادەرانیش خەمی هاوین دایگرتن. بەحسێوی کوێستان و شاخ و داخی دەوروبەرمان، شیناوێ کەرمەسێربوو! نە ئاوی ساردبوو، نەهەواکەی فێنك.. گوتیان لەبەر مێشوولەو کێچ خەومان نابێ. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە هەندێ ئامێری ئێزگە لە ئەشکەوتێکدا بوون، دەبوو گوێندەو ئەندازیارو کارگێران بەشاخ هەڵگەرێن و ماوەی چارەگە سەعاتێك سەرکەون. جگە لەوەی کە گەرما لە ئەسڵەوە بۆ ئێزگە خراوە.. ناچار ئەندازیارو هونەرکارانی ئێزگە بەرەو سەروو هەڵکشێن، شوێنێك بۆ ئێزگە هەڵبژێرن. ئەوەبوو لە مانگی پێنج هەندێ خێوەت و چادرمان لە نزیك «حاجی ئۆمەران» بەرزکردنەوە.. لە بەر هەندێ هۆ، مامۆستا هەژار نەهاتە کەمپەکەو پاشان بەیەکجاری پەیوەندیی نەماو لە جیاتی ئەو خوالێخۆشبوو صالح یوسفی بوو بە لێپرسراو..

ئەویش هەر لەناو پردانـدا دادەنیشت و حەفتەی جارێك یا دەهات یانە دەهات و ئیشوکارەکانی بەنامەو راسپاردە هەڵدەسووراند.

ئیدی کە هەژار بچرا، هێمن یش لەگەڵ ئەو لە زێنۆی مایەوە.. هەر چەند رۆژێك و گوتیان، نەك هەر لە شارو دێهاتەکانی دوور

ئێزگە نابیسترێ، بگرە چەند کیلۆمیترێك دەوروبەری خۆمانیش نارِوا. هەمان ئەندازیارانی جاران سەرەو ژێر بوونەوە، ئەمجارە ئاقاری نێوان چۆمان و گوندی «مەمی خەلان»یان پەسند کرد. بۆ رۆژی دوواتر بەڵیندەرو وەستاو کرێکاریان وەکارخستن و تا لە پایز نزیك کەوتینەوە ئەوانیش دوو دانە ژێر زەوی‌یان هەڵکەندوپایەی دوو خانوبەرەشیان بە قوڕو چیمەنتۆ بەرزکردنەوە. ژێر زەوی‌و ساختمانێکی دە ژووری بۆ ئێزگەو هی دووەم بۆ چاپخانەی خەبات وبەر لەوەی رەشەباو تۆفانی پایز هەڵکەن هەردوو لامان چووینە ناوی.. هەژار لێپرسراوی چاپچانەیەو بیناکەشیان هەرسێ‌سەد میترێك دووری بیناکەی ئێمە بوو.

ئەگەر رۆژانەیش نەبووایە، ئەوەلانی کەم حەوتەی دووسێ چاران هێمنم دەبینی‌و پێم وایە ئەو کاتە خۆشترین ماوەی ژیانی ئاوارەیی ئەو بوو «ئەوە ئەگەر ژیانی ئاوارەیی خۆشی هەبێ !». شەوان کۆرجەمەی دەهات و دۆست و ئاشناو میوانانی ئەودیو رووی تێدەکردن. لەتیفەو قسەی خۆش و درۆکانی عەلی عەجەم «مامەلی» خۆیان لە خۆیانەوە هێمنیان سەرگەرم دەکرد. لە زۆربەی حیکایەتە خەیاڵی و دروستکراوەکانی مامەلی‌دا هێمن شایەدبوو. زۆربەشیان بەقسەی خۆی هی دەورانی کۆماری کوردستان بوون و یا هێمن یا هەژار ئاگاداربوون ! دەیگوت: جارێکیان لەلایەن سپای شاوە، پێشەواو ئەو دەستەی لەگەڵدابوون کە خۆمش یەکێکیان بووم ، ئابلۆقە دراین و لەوە دەچوو فیشەك و تەقەمەنی کەممان پێبوو. پێشەوا هێمنی رەوانەی لای من کرد بەڵکو بیرێك لە وەزعەکە بکەمەوە. منیش یەکسەر داوای تفەنگێکم لە پێشمەرگەیەك کردو ئەمری هەڵگیرساندنی ئاگرم داو لوولەی تفەنگم سوور کردەوەو خستمە نێو دوو گاشە بەردان و بام دا. پاشان ساردم کردەوەو دامەوە دەست پێشمەرگەکەو گوتم هەر چەند دەقیقەیەك گوللەیەك بتەقێنە. ئیدی گوللە بەدەورو بەرماندا دەخولایەوەو هەر سەربازێکی بهاتبا پێشەوە دەیپێکا. بەم حاڵە ماوەیەکی چاك بە فیشەکێکی کەم بەرگریمان کرد تاهێزێك بەهانامانەوە هاتن .. پاشان رووی لە مامۆستا هێمن کردو گوتی: وانەبوو هێمن ؟ مامۆستا هەژار پێکەنی‌و گوتی: جا ئەگەر ئازای دەستی بۆ لەسنگ نادەی.. بەخودا دەبێ ئێوارە نان و ئاو بخۆی..

تا ئەو کاتەیش، هەستم دەکرد هێمن لە رووی حزبایەتی‌یەوە، پەیوەندی نیە..چونکە زۆر کەمم لێ دەبیست. کەچی لە هاوینی ساڵی ١٩٦٩دا هەرچی چاپەمەنی‌و بڵاوکراوەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هەن، پێی دەگەیشتن و جارێکیان لە بیرەوەری دامەزراندنیدا پۆست کارتێکی جێژنانەم لێ وەرگرت کە بۆ خۆمیان ناردبوو. هەروەها ئەندامانی سەرکردایەتی حزب هاتوچۆیان دەکردو جگە لە کاك ئەمیری قازی کە بە مانگ و دوو مانگ لە چاپخانە دەمایەوە مامۆستا عبدالله حسن زادەو مەلا رسول و هی تریش سەریان دەدا.

**ساڵی ١٩٧٠، لە ئەنجامی وتوێژێکی سێ چوار مانگی‌یەوە، رێککەوتننامەی ١١ی ئادار مۆرکرا. ئەوەندەی نەبرد ئێزگە لە کارکەوت و کارگێرانی هەریەکە کەوتە شارێك، پاشان چاپچانەیش وەکو ئێزگە چۆل کرا. هەژار کەوتە بەغداو لە یەکێتی‌ی نووسەران و کۆری زانیاری دەوریان دایێ. ئیدی ئاشیانەی هێمن تێکچوو، لە نێوان هەولێرو سلێمانی‌و بەغداو حاجی ئۆمەراندا پیاسەی دەکردسەری دۆست و ناسیاوانی دەداو ناوە ناوە تووشی گێچەڵ و سەر ئێشەی ئەنتیکەو سەیریش دەبوو. مامۆستا فەرەنسۆ حەریری کە ئەو کاتە قایمقامی چۆمان بوو، لەگەلاڵە دادەنیشت ، دەگێڕێتەوەو دەڵێ:**

**«نۆبەتداری بەر دەرگا هات‌و گوتی: مامۆستا هێمن هاتووە، حەز دەکا بێتە لات. گوتم بابفەرموێ.. هاتە ژوورەوەو دانیشت و گوتی: ئەرێ چ حاجی‌و ماجی نەهاتوونەتە لات، هەواڵی باوکت بۆ بێنن؟ سەیرم بە قسەکەی هات ئەنجا سەر بردەکەی گێرایەوە: من وا لە هەولێرەوە دێم.. بەقەمارەیەك هاتم سێ چوار حاجی‌و لادێی‌ی ئەم ناوەشی سوار کردبوو. کەیشتینە نزیك شەقڵاوە پاکەتی جگەرەم دەرهێناو فەرمووم لە هاو سەفەرەکانم کرد. کەچی کەسیان دەستیان درێژ نەکردو زۆر بە تووری‌یەوە تەماشایان کردم.. ئاگرم لە جگەرە بەرداو بیرم هاتەوە کە بەڵێ رەمەزانەو مامە حاجی بەرۆژوون.. کەیشتینە نزیك گەلی عەلی بەگ ، پاکێتم دەرکردو ئەمجارە بەدزی ئەوان، جگەرەیەکم داگیرساند. حاجی کەوتنە چاو زەق کردنەوەو جنێو حەواڵە کردن..**

خۆمن بەرۆژوو نیم.. گوێمنەدانێو وسەر خۆم نەهێنا. لەبەر زێوەی جندیان جگەرەی سێیەمم ئاگرداو رووم لە نەفەرەکان کردو گوتم: دەڵێی من ناناسن؟ تێکرا دیقەتیان دامێو گوتیان: ناوەڵڵا ناتناسین! چوزانین چ زڕتە بۆزێکی خوانەناسی بەم سەرو ریشی وا سپی بەرۆژوو نی! گوتم: جا مامە حاجینە بەقوربانتان بم، خۆمن رۆژو وەکو لەسەر نیە! چاویـان لێ سوورکـردەوەو گوتیـان: بۆ کوێـری؟ یا سەقەتی؟ گوتم: نابابە.. نەکوێرم و نەسەقەت. من فەلەم و باوکی فەرمنسـۆ حەریریم.. ئەومندەم گوت و ئیدی هەر ومختـەبـوو حاجی دەست و پێم ماچ بکەن. گەڵێ تەریق بوونـەوەو خەجـاڵەتی خۆیـان دەربـڕی.. هەر بابابوو پاکێتی شیرینیو پاقلاوەی بەربانگی دەشکاندو فەرمووی لێ دەکردم و بەزۆر جگەرەیان بۆ دادەگیرساندم. جا ئەوە هاتـووم، نەبادا مامە حاجییەکان بەر لەمن بێنە لات و پاکانەی خۆیان بکەن کە موزاحیمی باوکت بوونە!! دامانە قاقای پێکەنین و گوتم:ماموستا خوانەتکرێ..بیست ساڵیش دەبێ باوکم نەماوە».

سالانی دوواتـر، بەهـۆی مەشغـەڵەتـەوە، هێمنم بەدەگمەن دەبینی. کەسـاڵی ١٩٧٤یـاسای ئۆتۆنۆمی لەلایەن دەوڵەتەوە دەرچوو، هێمن ئەوکاتە لە بەغدا بوو.

پاشـان کە شۆرش هەرەسی هێناو دەوڵەت رایگەیاند کە دەبێ کورد ئالای سپی هەڵگرن، مێژوو نووسێك لە زمانی هێمنەوە دەنـووسێو دەڵێ: جاسێ ملێون کورد ئەو هەموو پەرۆ سپییە لەکوێ بێنن و بەرزی کەنەوە؟! دیارە ژیانی ئاوارەیی بەغدای لاحەستەم بووە، خۆی باسی ئەوکاتە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: «ئێستا لە شارێکی دوور ولات بەتاقی تەنێ لە ژوورێکی رەق و رووت دانیشتـووم، هەمـوو سامانم تەختێك و دەستێك نوین و دوو دەست بەرگی کۆن و نوێو چەند کراسی چلکن و چەمەدانێك و ساکێکی دەستیو چەند جلد کتیب و کوڵێك کاغەزی بلاوەو ئەسپێ لە گیرفانمدا سەوزەڵەتان عەرز دەکا».

بەلام سەرەرای ئەو ژیـانە تاڵەو گوزەرانە تەنگدەستانە،یاخی نابێولەو رێگەیەی گرتوویەتیو باوەری پێی هێناوە لاناداو لەو کوردایەتییەی خۆی بۆ خۆی هەڵبژاردووە وەرە بەرنادا و ئەژنۆ ناداتەوە. لەم بارەیەوە «هلالی هەمەدانی» دەڵێ:

**لذت دیـوانگی درسنـگ طفـلان خوردن است**
**حیف مجنون‌راز اوقاتی کەدر صحرا گذشت(٣)**

هێمنیش هەر لەسـەر هەمـان شێـوە دەنـووسێ:«زگتـان پێم نەسووتێ، ئەو ژیانەم بۆ خۆم هەڵبژاردووە دەنا دۆستیوام هەن ئەگەر حەز بکەم پارووی لەزاری خۆیان دەر دێنن و لەزاری منی دەنێن». رۆژێك لە رۆژانیش، بەچاوی کەس داناداتەوەو گلە لە کەس ناکـاو ناڵێ من لەسەر کوردایەتی ئاوارەم و دەبێ کورد هەرچی سەروەت و سامانی هەیانە بەمنی ببەخشن و هەرچی کچ وکەنیزەکی جوان هەن خزمەتی من بکەن و هەرچی ئەسپ و تاژی بەزۆك هەن بۆ من راوی کەروێشك بکەن:

«دەمەوێ شتێك بڵێم، بە پێچەوانەی زۆر هونەرمەندی کورد من لە نەتـەوەکـەی خۆم رازیم، کەس تا ئێستا بێ حورمەتی پێ نەکردووم، داوای دراوو ماڵیشم لەکەس نەکردووە تا بزانم دەم داتێ یانـا؟ لەلێ قەومـانیشـدا نانیـان داومێورایان گرتووم، شیعرم تەنیا بۆ دەربڕینی ئیحساسی خۆم داناوە هیچ هەقم نیە منەتیان بەسەردا بکەم. ئەوان پێیان ناخۆش بێ یاخۆش من کە شیعرم بۆ هات ناتوانم نەیڵێم».

ساڵی ١٩٧٧ لە سەردانی شاری هەولێردا یەکترمان بینیەوە.. ئەو کاتـە پەیـوەنـدیی لەگەڵ گۆڤارو رۆژنامە کوردییەکانی بەغـدا بەتـین بوو. گەلێ بەرهـەمی بەپێـزو نایـابی تێـدا بلاودەکـردنـەوە. لەپـاڵ ئەو بەرهەمانەیش «تاریك و روون»و «تـوحفـەی موزەفـەرییـە»و پاشان «ناڵەی جودایی» کەوتنە دەست خوێنـەران و زیـاتر شارەزای بەهرەو داهێنانی هێمن بوون. لە هەمـان کاتـدا ئامـادەی کۆرو کۆبوونەوەو دیدارو میهرەجانی شیعرو ئەدەبیاتیش دەبوو. هەر کۆرێکی ئەوی تێدا بوایە، دەبووژایەوە مریدو دۆست و دەروێشی تازەی بۆ پەیدا دەکرد. بەتـایبـەت دەستـەی کور و کچی خوێنـدکـارو ئەو نووسەرو شاعیرانەی تازە دەستیان دەدایە قەڵەم وبە مامۆستاو رابەرو نوێخواز سەیری هێمنیان دەکردو کەڵکیان لە ئەزموون و تاقیکردنەوەی وەردەگرت. جاقۆناغی سەرهەڵدانی بەتەوژمی هێـمـن لە کوردستـانی عیراقـدا لێرەوە دەست پێ دەکـا.. مەعلوومیشـە یەکێکی وەکـو ئەو بەم گەرمیو گوریـەوە بێتـە مەیـدان و بکـەوێتـە ژێر رووناکیی چاپەمەنیو راگەیاندن، ناحەزونەیاریشی بۆ پەیدا دەبن و تەقەی لێدەکەن.

**هەژار لە چلەی ماتەمینی سەججادی‌دا دەنووسێ: «لە سایەی چەند خێرومەندێك، بەگێرەگێرپێش نوێژی‌یەکی لە کونە گورگێکا دەس کەوت کە ناونرابوو مزگەوت. حوجرەیەکیشی بۆ جێخەوی مەلا هەبوو، سەد خۆزگە بە حوجرەی نالی. من ناوم نابوو کونە رەش. بەرۆژ دەبوو چرا هەڵ کا، بەشەو چۆنی تێدا هەڵ کا؟**

ئاوارەیە، غەوارەیە، گوناهی هەرە گەورەشی کورد بوونیەتی. ساڵەهای ساڵ رۆژو شەوی و کات و ساتی لەو حوجرەدا لەسەر حەسیر ببووە سیپاڵ. جا مەگین چلۆنکایی با دەنا هەرگیز ئەو زیندانەی جێ نەدەهێشت، هێشتاش هەر لەوە دەترسا کوردی نامەرد کەماڵم هەقە زۆریش بوون، تۆمەتی ئێرانی بوونی بەملدادەن. لە پاش گرتن و جزیادان بۆ ئەودیو سنووری رادەن،ئەو نانەو شکەشی بچێ کە ئێستا بێ منەت دەیخوا..

لەو ژیانە پڕ لە ژانەدا تەمەنی گەیی‌یە حەفتا ساڵی.. ئەو هیچ لە دەست نەهاتوانەی هەر ئیراد گرتن دەزانن و هەرگیز لە هونەر ناروانن، کردبوویانە ئامانجی تەوس و توانج و زەدیان لێ دەدۆزیەوەو لەیەکتریان دەقۆزیەوە: مەلا دەس رژدو چنۆکە، ترسنۆکە، گۆشەگیرە، لەم ناوە هەر خۆی لەبیرە. سەر بۆ حوکمات دەنەوێنێ، لە [ ........ ] چۆن قەبووڵ دەکا بەشداربێ‌و لەناو کۆمەڵ لەکەداربێ؟».

ئێرانی بوونی هێمن، وەکو مەسەلەی سەججادی چەقۆیەك بوو هەردەم وەبان سەریەوە . بەئاشکراو بەنهێنی کەسانێك بەغیلی یان پێ دەبرد، قسەی ساردیان پێ دەگوت و لە پاش ملەدا حیکایەتی رووشکێنیان بۆ دەهۆنیەوەو درۆیان بۆ هەڵدەبەست. دەکۆشان بەڵکو تۆزقاڵێك لە نرخ و قیمەتی کەم بکەنەوە. یەکێك دەیگوت: ئەسڵەن هێمن شاعیرنیە.. یەکێکی دیکە دەینووسی: هێمن زمانی سازمانی ئەمنیەتی ئێرانی هێناوەتە عیراق!! تەنانەت بابایەکی کوردی ئێرانی وەك خۆی دەربەدەرو ئاوارەو بێ‌نان و بژیو، کوردەکەی خۆمان ئاسا، هێمنی دابووە بەرتیری ئێرەیی‌و چاوپێ هەڵنەهاتن. (٤).

لەسەفەری دووەمیدا ساڵی ١٩٧٩ هاتە هەولێرو خواحافیزی‌و ماڵ ئاوایی لە دۆست برادەران کردو گەڕایەوە بەغدا کە لە وێوە بەیەکجاری بگەڕێتەوە ئەودیو. هێشتا شا لە حوکم بوو، بەڵام دووا رۆژی بوو. چەند رۆژێك و هەواڵم پێ‌گەیشت کە بەرێگەی گەڕانەوەدا تووشی مل ئێشە دێ‌و ئێستاکی وا لەلایەکێ لە نەخۆشخانەکانی بەغدایە. وەك قەدر زانینی دۆستایەتی، چوومە بەغداو سەردانی نەخۆشخانەکەم کرد. خۆی لەنهۆمی دووەمدا بوو، هەر چەندەی وادەی سەردانیش نەبوو، بەڵام کە گوتم دەچمە خزمەت هێمن، ئەوانەی بەردەرگا رێگەیان دامێ‌و بەرێزەوە فەرموویان لێکردم. سەرقاڵی نووسین بوو، حیکایەتێکی فۆلکلۆری‌ی ئەدەبی گەلانی دەنووسیەوە، هێندێکی بۆ خوێندمەوەو دووای دووسێ رۆژان لەرۆژنامەی «هاوکاری»دا بڵاوکرایەوە. کە چاوی پێم کەوت گوتی: خۆزگە بەر لە دوو سەعاتان دەهاتێ. دەستەیەك کیژو کوری بەشی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا لێرەبوون، یەکێ چەپکێ گوڵی هێنابوو، ئەوی دیکە دیاری‌و شیرینی و یەکێ کامێراو وێنەیان دەگرت. فلانەکەس «وەکو گوتم ئێرانی‌یە» هاتە ژووری‌و چاوی بەم بەزمەکەوت، خۆی بۆ نەگیراو گوتی: هێمن، دەزانی خەریکە شێت دەبی! ئێرە هەنگاوی یەکەمەو رەنگە بتگوازنەوە شێتخانە!!

دیاربوو قسەی ئەو فلانەکەسە کاری تێ‌کردبوو. بۆ دڵدانەوە گوتم: ئەی تۆ هیچت نەگوت؟ گوتی: براله ئەوە نەك هەر ئێستا، بگرە لەسەردەمی کۆماریشدا دوژمنایەتی من و کاك هەژاری دەکرد، تا لە دەستی بهاتبا خراپەی دەرهەق دەکردین.

لە جێگەیەکی دیکەشدا، رای خۆم سەبارەت بەدەوری هێمن لە بڵاوکردنەوەی هەندێ ئوسووڵی نووسین کاریدا دەربڕیوە. پێم وایە ئەم زاتە فەزڵی زۆرەو هەر نووسینێکی ئەو شاکارێکی ئەدەبی‌یەو دەبێتە سەر مەشقی گەلێ لە نووسەران.

رەنگە مەسەلە پەیوەندی‌ی بە سەرچاوەی رووناکبیریی هێمنەوە هەبێ‌و ئەگەر رۆژێ لە رۆژان، بەختی کورد هێنای‌و بارودۆخێکی گونجاوو لەباری بۆ هەڵکەوت و قەوارەی نەتەوایەتی تەواوی بەش و پارچەکانی گرتەوە، ئەوە بێگومان لە چازانیدا خەڵکی کارامەمان دەبن و لە خۆبایی نەبێ دەکرێ بێژین کوردیش شتە.. هەر پارچەیەکی دەیگری دەیان ساڵە دراوسێ‌و تێکەڵاوی قەومی رەگەز جیاو شارستانیەت تایبەتە. زمانی ئەو قەومانە تاکە رێگە بووینە بۆ گەیشتنە ئەدەبیاتی گەلان، ئەوە جگە لە ئەدەبی خودی ئەو قەومانەکە بەناچاری کوردی برایان فێرەزمانی خۆیان کردووە. بۆ ئەوەی لە کاروانی

پێشکەوتن و شارستانیەت دووا نەکەون، نەیانهێشتووە بەزمانە شرەکەی خۆیان بخوێنن و (!) لەجیاتی ئەوە ئەلف و بێی خۆیان ئەزبەر کردوون. خۆشتان دەزانن کورد ژیرو زرنگە، بەفێربوون نەوەستاوەو کتێبی پێ نووسیوەو شیعری پێ هەڵبەستووەو فەرهەنگ و قامووسیشی بۆ داناوە.

جا کە هێمن وتارو پەخشان و شیعری بڵاودەکردنەوە، خوێنەری ئێرە لێیان ورد دەبوونەوە، وەك جیهانێکی تازە بدۆزێتەوە. زاراوەی ڕەسەن و کوردیی بەسووك و ئاسان واتا دەربڕین، بێ ئەوەی ووشە داتاشێ‌و بەزمانێکی دیکە بیر بکاتەوەو بەسەر خوێنەری ساغ بکاتەوە.

**د. عبدالرحمن قاسملو لەبارەی زمانی هێمن دەڵێ:**

«زمانی هێمن زمانی کوردی پەتی‌و جوانە. نەپرە لەوشەی بێگانەو نە وشەی دەستکردی تێدایە. زمانەکەی زمانی خەڵکی کوردستانە،بەڵام هێمن کە خۆی خەڵکی موکریانە تەعەسوبی بەکار نەهێناوە، بەزاراوەی موکریانی شیعر نالێ بەتایبەتی لەم چەند ساڵی دووایی‌دا زمانی هێمن نموونەی بەرزی زمانی ئەدەبی کوردی‌یەو بێ گومان لەپێك هێنانی زمانی پەسندکراو «ستاندارد»ی کوردی تەئسیری هەبووە».

گەلێ جاران مەسەلەی زمان هاتۆتە کایەوەو باس لەوە کراوە، ئایا بۆچی زاراوەی فلانە ناوچە خۆیان پاراستووەو ڕەسەنایەتی‌یان پێوە دیارە؟ من بۆ خۆم پێم وایە شارستانیەت بە شێوەیەکی «سەلبی» کار لە زمان دەکا. بەتایبەت بۆ قەومێکی بێ دەفتەرو بێ دەوڵەت و بێ کۆڕی زمان. شاروشارۆچکە دروستکردن و پەیدابوونی ئامێرو کەرەستەی ڕاگەیاندن و لەناو چوونی کۆمەڵگەی جوتێری و کشاوەرزی لە خۆیانەوە هۆی لەناوبردن و لاوازبوونی زاراوەن و ئەو ناوچانەی هێشتا تەوژمی پێشکەوتنیان نەگەیشتووەتێ، قەوارەی زمانەکەی خۆیان لە دەست نەداوەو دەستیان لێ هەڵنەگرتووە، بەپێچەوانەی شارەکان کە پێویستی‌یان بەهەندێ زاراوە نەماوەو لەژیانی ڕۆژانەی دانیشتوواندا بەکار ناهێندرێن.

جارێکی دیکەش گوتوومەو وا دووبارەی دەکەمەوە .. شاعیری بلیمەت و چازان لە پاڵ شیعرە تەڕو ناسك و هەست بزوێنەکانیدا، خۆش مەشرەب و نوکتە حازرو دەم بە پێکەنینیشە.. بابەتەکانی لەبارەی غەیرە شیعرەوە دەیاننووسێ،پارچەیەکی ئەدەبی‌و شاکارێکن و هەر زمینەتە بیانخوێنینەوە.

لە پێشەکی دیوانی «ناڵەی جودایی»دا مامۆستا محمدی مەلا کەریم کە سەر پەرشتکاری دیوانەکەیە، دێپاچەی بۆ نووسیوەو دەڵێ:

«بەر لەهەرچی، حەز ئەکەم ئەوەی چەند جار بەهێمن خۆیم وتووە بە ئێوەشی بڵێم: لەناو ئەوانەدا کە پەخشانیش و شیعریش ئەنووسن و من هەردوو جۆرە بەرهەمەکەیانم خوێندووەتەوە، لە عەرەبدا نەزار قەببانی و لە کورددا هێمن من پەخشانیانم لە شیعریان لا دڵگیرترە. ئاواتم ئەوە بوو کاری سەرەکی هێمن پەخشان نووسین بوایە لە جیاتی شیعر وتن».

من لەبۆ چوونەکەی کاکە حەمە کە زۆر ڕاستە، زێترم بە هێمن خۆی گوتووە.. ئەو کاتە «ناڵەی جودایی» لە ژێر چاپدابوو، هەر بۆ ئەمەکی برادەرایەتی وێنەیەکی هێمنم بەمەرەکەفی ڕەش کێشاو لە سەرووی بەرگی یەکەمی دیوانەکە جێگەی خۆی کردەوە. گوتوومە شاعیر ئەگەر نووسینەکانی وەکو شیعرەکانی نەبن و پەخشانی ڕەوان نەبێ‌و لەهەموو بابەتەکاندا وەستای شارەزا نەبێ، وا هەست دەکەم شاعیری‌یەکەی ناتەواوە! بۆ نموونە ناوی شاعیرێکی عەرەبم بۆ هێنایەوە کە لەسەرحسێبی حزبایەتی‌و بارودۆخی سیاسی، نێوی دەرکردو کەسانێك بڕوانامەی دکتۆراو پرۆفیسوری‌یان لە شیعرەکانی ئەوەوە وەرگرتووە و شیعرەکانی کراونەتە گەلێ زمانی دنیا. کەچی باوەڕ ناکەم پێنج کەس هەبن لاپەڕەیەك شیعری ئەویان ئەزبەربێ! نووسینی هاکەزایی ئەوم وەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامە خوێندووەتەوە، لە دێڕی سێیەمدا بێزاربوومە.. لە چاوپێکەوتنی ڕادیۆو تەلەفزیۆندا تام و چێژم لە قسەکانی وەرنەگرتووەو پاش دوو دەقیقان وەرز بوومە، ئەوەی ئەو دەیزانێ هەر تەنیا شیعرە! زۆرجار یش ئەم قسەیەم لای هەندێ برادەر درکاندووە، ئەسڵەن گاڵتەیان پێ هاتووە: چۆن لە دڵت دێ، شاعیرێکی پایە بەرزی وەکو ئەو بشکێنی؟!

کەچی هێمن لە «ڕاوە تاژی»دا، نووسینی گەیاندووتە لووتکەی ڕەوانبێژی‌و داهێنان ماڵی نەرمێ‌و ئاگردانی کوێر نەبێتەوە، ئەو هەموو زانیاری‌یانەی دەربارەی تاژی لەکوێ هێناوە؟ ئاخر ئەم هەموو زاراوانەی بۆ تاژی بەکاربردوون گاڵتەیان پێ ناکرێ..

بەئالقەیەکیش نەوەستاوە دووانی نووسیون کە لە پەنای هەر دێڕێکیدا دەیان مانای پێکاوە و تاکورد ماوە دەمێنێ و فەرهەنگ ڕێکخەرانی خۆمان سوودی لێ وەردەگرن.

**ڕەنگە نەوەی ئێرەی تازە پێگەییوی دووای ڕۆیشتنەوەی هێمن، شتێکی ئەوتــۆی دەربــارە نەزانن، با بە قەڵەمی خۆیەوە، خۆتان پێ بناسێنێ:**

«**باوکم ناوی سەید حەسەنی شێخە لیسلامی موکری بوو. لەتۆرەی مەلا جامی چۆری بوو کەسێ سەد ساڵ لەوەی پێش هاتۆتە سابلاخ و بنەماڵێکی گەورەی لەو مەڵبەندە پێک هێناوە. دایکم ناوی زەینەب و کچی شێخی بورهان بوو کە ئێستــا بنەماڵەیەکی گەورەی موکریانن. بەهاری ساڵی ۱۳۰۰ی هەتاوی ۱۹۲۱ی زایینی بەشەوی جێژنی بەراتێ لە گونــدی لاچــین‌نێزیکی سابلاخ لە دایک بووم. مێژۆکم لە مەمکی دایکم نەکردووەو فرچکم بەشیری دایەن گرتووە**».

لە کۆتاییدا، هیوادارم ئەم باسەم درێژەی هەبێو مۆڵەتم ببێ جارێکی دیکــەش بگــەرێمەوە سەری. چونکە هێمنی لووتکەو داهــێنــەرو باس و خواسی ژیــانیو بەرهــەمــەکــانی، زۆر هەڵدەگــرن.. غەرقی رەحمــەتی خوا بێ و جێگــەی ناوەنــدی بەهەشت بێ.. ئامین

---

پەراوێز

۱- جگە لەو پزیشکانەیش، کاک دکتۆر محمود دەسبی بەتاڵ بووایە، ئێــواران دەچــووە ئەوێو تادرانکی شەو نەخــۆشی دەبینــین و چارەسەری دەکردن.

۲- ئێزگــەیــەکیتایبەت لەلایەن دەوڵەتەوە دژی ئێزگەی شۆرش تەرخان کرابوو (تەشویش). تا بەرنامەکانی ئێزگەی شۆرش تەواو دەبوو. ئەو ئێزگە تەنیا یەک گۆرانی رۆژئاوایی دەخستە سەرو گۆرانی بێز دەیان جار دەیگوت« کیسمی هانی هانی». خەڵکی بەو تەشویشەیان دەگوت «هانی هانی».

۳- مانــا کوردیــیەکەی ئەم بەیتە شیعرە ئەمەیە: خۆشی و تام و جێژی شێتی لەوە دایە منداڵ و مەزن بکەونە دووات و بەردت بهاوێژنێ..

مەجنوونەکەی لەیلا کەی شێتە کە هەموو تەمەنی خۆی لە چۆڵ و بیاباندا بەسەربردو بەردێکی تێ نەگیرا؟!

٤- ئەم قسانەو هەندێکیش زیاتر، هێمن خۆی بۆمی گێراوەتەوەو لە کاسێتێکدا بە دەنگی خۆی تۆمارکراوەو شەریتەکەم هەیە.

**فەرهەنگۆک**

**ئێراد گرتن = رەخنەگرتن**
**پاروو = تیکە**
**پەسن = مەتح، پێ هەڵگوتن**
**جێژنی بەراتێ = رسق و رۆژی بەش کردن:**
**(نیوەی مانگی شابانێ شەوی جێژنی بەراتێ)**
**(لە خودای دەکەم تەڵەبێ بەشکو چاو جوانم داتێ)**
**(فۆلکلۆر)**

**چەمەدان =جانتا، باول**
**زەدە = عەیب گرتن لە کوتاڵ و ماڵی کریاری**
**ساک = تووەرەکە، خورج ، جانتای دەست**
**سیپاڵ = بەری ساکارو کەم بەر، کۆنەپەرۆی دراو**
**شەمچە = شقارتە، کبریت**
**فرچک = تێ هەڵکەوتنی بێچوولە گوانی دایک بۆ مژین**
**مەگین = مەگەر**
**مێژۆک = بەرخێک گوانی هەموو پەزێک بمژێ.**

**بۆ ئەم باسە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:**


۱- «تاریک و روون» کوڵبژێرێک لە شیعری هێمن - لە چاپدانەوەی سەیید یان مەهاباد. نەمێژووی لەسەرەو نەنرخ:

**۲- دیوانی «ناڵەی جودایی» هێمن - چاپخانەی علاء - بەغدا ۱۹۷۸**

**۳- « مەنبانە بۆرینە» هەژار - چاپی یەکەم ۱۳٦۹ ه ش - تەهران**

**٤- ژمارەکانی گۆڤاری «سروە» ئینتیشاراتی سەلاحەددینی ئەیوبی**



# عەلی فەتتاح دزەیی شاعیر و تێکۆشەر

● د. عزالدین مستەفا رەسوڵ ●

**ئەم عەلی فەتــاح دزەیی‌یــەی ئەمڕۆ بۆ کۆتەڵی چلەی کۆبووینەتەوە ئەستێرەیەکی پرشنگدار بوو لە ئاسمانی کوردەواری‌دا، بێدەنگ هات و درەوشایەوەو ئاوابوو، بەڵام هەر درەوشەی ئەو لەجێی تیشکی ڕۆژ چەند درەختێکی چاند کە هەر سایەدارو بەردار دەبن.**

**کە ئەمـڕۆ لیژنەی ماتەم بەناوی سەرۆکی یەکێتی نووسەرانەوە ڕێی ئاخافتن بە دۆستێکی دێرینی کاکە عەلی فەتتاح دەدەن، کە لەپایەی بەرهەم و ئیبداعی ئەوو لە هەندێ یادگاری دوور وولاتی‌و خوێندنی ئەو بدوێت ـ ئەوا دەڵێین کاکە عەلی ـ لەرێی تێکۆشانی سیاسی‌یەوە هاتە ناو ژیانی خەڵکەوە ـ کورە ئاغا و لایەنی جوتیارانی گرت. قوتابی بوو، لەریزی تێکۆشاندا یەکەم سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی هەولێر بوو، باجی تێکۆشانی گرتن و لەوولات ڕێگەی‌خوێندنی نەدا بوو لەبەر ئەوە رووی کردە شام، مەڵبەندی یەککرتن و پێکەوە ژیانی چەند ساڵەمان.**

**ڕەنگە برایانی‌تر ـ باسی زۆر لایەنی تری ژیانی ئەم ئینسانە [illegible] بێوەیە. دڵسۆزە بکەن، بەڵام دەبێ من لە دەرگای ئەو یادگارانەوە بچمە ناوجیهانە ڕەنگینەکەی ئەوەوە، کە [illegible] سەردەمەی پەرەپێدانی تێکۆشان بوو، لایەنێکی تری هەرەتی دەستدانەنووسین و ئیبداع بوو.**

کەلە سوریای ئەوسای دیموکراتی دا ڕێگەی هەمووشت هەبوو ڕێگـەی کورد نەبێت. بەنهێنی یەکـەم ڕێکخـراوی قوتابیانی کوردی (زانستگای شام) مان دروست کرد، کاکە عەلی مان بە سەرۆك هەڵبژارد. ساڵێك پێکەوە ئەو سەرۆك و من سکرتێری ئەو یەکێتی‌یـە ـ مایـەی سوودبینـین بوو لە هێمنی و تەجروبەی تێکۆشانی. بەڵێ ـ عەلی فەتتاح دۆستی فەللاحەکانی دووسەرە بوو، بەڵام خێڵی دزەیی خوشدەویست نەیدەویست لە ڕەفتارو نەریت و بریـاریـان لابـدا. هەر ئەمــەش لە ژیـانی سیاسی‌و خێزانی‌ی ئەودا ـ کاری‌کردە سەر نەخشەی دوواڕۆژ کێشانی.

هەر لە زووەوە ئاڵۆدەی شیــعــری گۆران بوو. زۆربــەی شیعرەکانی گۆرانی لەبەربوو. ئەگەر تێکۆشانی سیاسی چەند شاعـیری سەر بە قوتـابخـانـەی گۆرانی هێنـابێتـە کۆڕی ئیبداعەوە، ئەوا بیری سیاسی‌و کارتێکردنی گەورەی گۆران عەلی فەتتـاحیـان کرد بە شاعـیرێکی نیشتمـانپـەروەرو دەربـڕی عاتیفـەیـەکی ناسـك. کە لە پاڵ بەهـرەی شیعـردا نموونەی خوێندەوارێکی سەر بە خوێندنەوەو ڕۆشنبیری‌بوو، ئەوا بەکانی پتەو و دەوڵەمەندی شیعری کلاسیکیی کوردی ـ ئەو بەهرەیەی قووڵ و بەتین کرد.

هەر ئەم لایـەنەش بەدی‌یە سەر نووسینی چەند نامیلکەو ووتاری بەنرخ دەربارەی ئەحمەدی خانی‌و ئەحمەدیی شێخی نۆدێ‌و کۆمـەڵێك مەســەلەی شیعری کوردی کە هەندێکیان هێشتا ڕووناکی‌یان نەدیوە.

کە باسی چاپنەکراوی بەرهەمەکانی کاکە عەلی فەتتاح‌ماوەیەم دەکەین ـ دەبێ بۆ چەند پارچە شیعرێ بگەڕێین کە نەچوونەتە ناو دیوانەکەیەوە. مەرگی ئەفسەرانی هار [illegible] سەرەوی ڕوژبە پارچەی ڕەنگینی (تاران)ی پێ نووسی ـ کە ئەویش کرا بە عەرەبی.

ئەو ماوەی چەند مانگەی لە ژوورێکدا دەژیاین، دووا تاوی پێش چاونووسالدنمان شیعری گۆران خوێندنەوەمبوو. بەلا کەنـاوی (هێلین)ی کچـە مەسیحـی خاوەن ماڵمـان لـ قەسیدەیەکدا دێت، دەبێ بۆچ کاکە عەلی ـ پارچەی دووەمی (هێلین وەرە)ی تۆمـار نەکـردبێ. ڕەنگـە ونبوون ئەو پارچە ناسکەی لە کیس دابێ کە هەر ئەو دەیخوێندەوە: هێلین وەرە من یەکسەرە پشەوەرەی گۆرانم دەخوێندەوەو ئەویش دەیوت ڕاست دەکەی، ئاگام لە خۆم نەبووە کە هێلینم لابووە بە (پشە)، یابە پێچەوانەوە.

ئەمــڕۆ لە کۆمــەڵ و سەردەمێکـدا دەژین، کە پاش هێـچ



لەنــاو جەرگــەی تێكــۆشــانی نیشتمــانیو سیــاسی دابــوو، ئەوســەردەمــەش كە قورســایــی خستــە سەر خوێنــدن و خۆپێگــەیــانــدن و هەموو سەردەمەكانی دووای ئەوەش هەر كورێكی دڵســۆزی گەلەكەی خۆی بوو. بەپێی توانا گەلێكی بەخشی. لەگەڵ زۆربەی رۆشنبیرانی كورد دا ـ ماوەیەك لە چیا سەركەشەكانی كوردستان بوو ئاوارەییو دوورخستنەوەی دی. بەڵام لە سەنگــەری گەل و خۆشــویستنی گەل لای نەداو لە هەموو لایەنێكەوە ـ لاپەڕەی گەشی بۆ ژیانی خۆیو یادگاری پڕشانازیی بۆ خێڵ و كەس و كارو دۆستەكانی بەجێهێشت.

كە لەچلەی ماتەمی ئەو دۆستە دێرینەدا فرمێسك دەرێژین، هەردەبێ بەناوی یەكێتی نووسەرانی كوردەوە ـ پەیمانی لەبیر نەچوونەوەی ئەو كوردە مەردە بدەین و بەڵێنی ـ دەرخستنی گەوهــەری بڵاو نەكـراوەیو لێكـدانەوەی كۆشش و بەرهەمی بەنرخی بدەین. كەمنیش لەگەڵ هەموو هاوڕێو دۆستانی ئەودا ماتــەم دایگــرتــووین و دەبێ پرســەمان لێ بكرێت، هەروەها **یەكێتی نووســەرانی كوردیش ـ بە كۆچی یەكێكی تر لە شاعیرە دیارەكانی كاروانی گۆران ـ قافیەی ماتەم بۆ دێری شاعیران دەخاتە كار ئەوا هەر نەریتی كوردایەتی زمانی پرســەمان دەخاتە كارو بەناوی ئەو یەكێتییەوە رووی پرســەمــان دەكــەینە خێزان و بنەماڵەو عەشرەتەكەی و بەراستی كاكە عەلی فەتتاح دزەیی ـ لەكیس كورد چوو.. نەمرێت و با هەر لەیادمان بێت.**

شاعــیرێــك ناتــوانــین ـ كۆمەڵێ یادگار دەربارەی شیعرەكانی بنــووســین ـ ئەگینــا یادگــاری ئەو رۆژانــەو (ن..)ی كچــە ئەرستــواكــراتیو (امــل) ـ ی كۆلیجی ئەدەبیــات و پارچەی نیشــارەت بۆ كردووی (یاحیاتی)ی ناو دیوانەكەی هەر یەكە چیرۆكــی شیرازەی كەرەســـەی پارچــە شیعــرێكی ناسكی، شاعیرێكی خاوەن هەستی نەرم و قووڵن، كە هەژاریو نەبوونی رێگەیان لێ نەگرتبوو ـ وەك كەسانی تر ـ بەڵكو ئەو پابەندیی یەی بەنەریتی خێڵەكەیەوە دەبنە دووا فەسڵ یا دووا دێری ئەو چیرۆكانە.

بە هەمــوو جۆر ـ عەلی فەتتاح دزەیی، ئەوسەردەمەش كە

## روون كردنەوە

دەستــەی نووســەرانی كاروانی داوا لە نووسەران دەكات لە كاتی بابەت نووسیندا پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكەن:

١ـ بابەتەكان بە خەتێكی خۆش و لە سەر یەك ڕووی لاپەڕە بنوسرێن

٢ـ لە كاتی نووسین‌دا خەت بەجێ بهێڵە.

٣ـ بابەتی وەرگێڕدراو لە زمانی ئەصلییەوە پەسەند دەكرێ

٤ـ بابەتی وەرگێڕدراو لە زمانی عەرەبی پەسەند ناكرێ مەگەر زۆر دەگمەن بێت وەكەم كەس ئەو سەرچاوەی دیبێت.

٥ـ لە هەڵسەنگاندنی بابەت، بایەخ بە بەهای داهێنان دەدرێت

٦ـ كاروان پتــر دەرگــا لە بابەتی لێكۆڵینەوە ورخنە و بابەتی دانسقە دەكاتەوە

٧ـ هیــوادارین ئەدیب و رۆشنبیرانی كوردستان بە بابەتە بە پێزەكانیان گۆڤاری كاروان بەسەربكەنەوە

**دەستەی نووسەران**

### ڕۆڵی شارەزایانی لیژنە پزیشکی‌یەکان

# لەسەلماندنی بڕیاردانی دادگای تاوانە گەورەکاندا

ماف پەروەر
رشدی محمد خضر

**ئەوەی دەمێکە لەلام مەبەستەو ماوەیەکی زۆرە بۆتە خولیایەکی مەزن لە هۆش و هەستم دا ئەوەیە کە هەڵی ئەوەم بۆ برەخسێ لاپەرەی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردی‌یەکان برازێنمەوە بە بابەتی یاسایی‌و یەکالاکردنەوەی بەندەکانی کەپێم وایە ئەم گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی‌یانە تا ئێستا لە ڕووی ئەم بابەتانەوە هەژاری‌و نەداری پێوە دیارە.. ڕەنگە تا ئێستاکەش میللەتەکەمان بە تەواوی شارەزایی نەبێ لەسەر ئەم لایەنە گرنگەی ژیان کە پەیوەندی‌ی ڕاستەوخۆی بە جوڵانەوەی مرۆڤ هەیە لە ژیانی ڕۆژانە.. ! دەشبێ زۆربەی زۆری نەتەوەکەمان نەک هەر شارەزایی لەم بابەتەوە نی‌یە، بەڵکو نە ئاگاداری‌یان لە بەندەکانی یاسا هەیەو نە بای تۆزقاڵێک لێ‌ی دەزانن (مەبەستم خەڵکە ئاسایی‌یەکەیە)..**

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستی‌یەکی هەرەگرنگ و هۆیەکی هەرە سەرەکی‌یە کە کۆمەڵی کوردەواری لەسەریەتی لە یاساو بەندەکانی بگاو یەکالای بکاتەوە، چونکە یەکێکە لەو ڕێگا ڕاست و دروستانەی کە لە مەسەلەی تاوان و تاوانکاری دووری دەخاتەوە... بەڕای من پەنجەی درێغی لەم ڕووەوە بۆ ئەو هاوڕێ‌یانەی دەرچووانی کۆلێجی یاسا درێژ دەکرێ، چونکە ئەگەر ئەمان لاپەرەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان بە نوسینی کوردی لەم بابەتەوە برازێننەوەو کۆری هەمە جۆر ببەستن وا دەزانم مەسەلەکە ئاوا لەلایەن خەڵکەوە بەشاراوەیی نامێنێتەوە.. تەنها چەند کەسانێک نەبێ کە ناوە ناوە دەرگا لەم بوارە دەکەنەوەو شت لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی‌یەکان دا دەنوسن کە ئەمانیش بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵک بە

پەروشەوە دەیخوێننەوەو ئەمانەش لە دوا ڕۆژدا دەبن بە مۆم و کتێبخانەی کوردی پێ ڕوشەن دەبێتەوە... لەبیریشتان نەچێ فەرهەنگنامەی کتێبخانەی کوردی لە بابەتی یاسایی دەتوانم بڵێم « ووجاغ کوێرە».

نابێ هەوڵ و کۆششی هەردوو مامـۆسـتـا«دکتـۆر سعـدی بەرزنجی و دکتـۆر نوری تاڵەبـانی»لەبیربکرێ کە ئەمانە ماوەیـەکی زۆرە بە نوسینی بابـەتی یاسـاییـیـەوە خەریکن بەتـایبەت « دکتۆر سعدی بەرزنجی» لە ڕووی پراکتیکاوە لە یاسـاو دەوری یاسا دەورێکی گرنگی گێراوە ئەویش بە چاپ کردنی دوو کتێبی قەشەنگ، هەروەها« دکتۆر نوری تاڵەبانی» یش بە دانـانی فەرهـەنگێکی یاسـاییـیەوە کە چەندین ساڵە خەریکی‌یـەتی‌و ڕەنگە بەم زوانە بکەوێتە بەرچاوی خوێنەران بەشـداری‌یـەکی بێ پایـانی لەم بوارەوە کردووە. لە ڕووی یاسـاییـیـەوە گەلێ کتێب بە غەیری زمانی کوردی دەرچووەو بڵاوکـراوەتـەوە، بەڵام ئەگەر ئێمەمانان بمانەوێ ئەم کتێبانە بخەینە سەر زمانە شیرینەکەمان یانی وەری بگێرین تووشی گەلێ هیـلاکـەت و گێرمـەو کێشە دەبین لە سەرووی هەموویانەوە مەسەلەی هەندێ زاراوەی یاسایی کە ڕەنگە لە زمانی کوردی‌دا زۆر بە زەحمەت دروست ببوبێ، لەوکاتەدا ناچار دەبین کە هانا بەرەو زاراوەی داتـاشراو ببەین.. بۆیە من بەش بە حاڵی خۆم هەمیشـە هەوڵ دەدەم ئەو نوسینە یاسایی‌یانەی کە دەمەوێ بیـان نووسم و لە گۆڤـارو ڕۆژنـامە کوردی‌یەکان دا بڵاویان بکەمەوە مۆرکێکی کوردانە بە خۆیانەوە بگرن تا لە دوا ڕۆژێکی نزیك ببێتە بناغەیەك بۆ نوسینی بەرهەمی یاسایی بە زمانە شیرینەکەمان..

لێرەدا ئەوەی مەبـەستمـە لەم نوسینـە بیخـەمە ڕوو دەوری پزیشـك و شارەزایـانـە لە گۆڕینی بڕیـارەکـانی دادگـاکان بەتایبەتی (دادگای تاوانە گەورەکان ـ محكمة الجنايات ) کە پەیوەندی‌یەکی ڕاستەوخۆی بە خەڵکەوە هەیە.. لە هەمان کات لەم نوسینەم دا دەمەوێ بڵێم:ـ ئایا کارتێ‌کردنی ڕاپۆرتی ئەو لێژنانە چ کارێك دەکاتە سەر گۆڕینی بڕیاری دادگاکان و چ گ‌ڕینێك دەبەخشێ لە نواندنی تاوانی تاوانباران دا..؟ بۆ زیاتر ڕوون کردنـەوەو بەڵگـەی دروست بە پێـویستم زانی بۆ ئەم مەبەستە دوو نموونەی بڕیاری دادگای پیاچوونەوە لە عیراق دا بخەمە ڕوو، هەڵبەت جیاوازی‌یەکی تەواو دەبینی لە نێوانی ئەم دوو بڕیارە...

**«گۆڤاری العدالة» نموونەی یەکەم:ـ**

لە بڕیـاردانێکی کۆتـایی کە «دادگای پیاچوونەوەی عیراقی ـ محكمة تمیز» لە ڕێکەوتی ١٧ـ١٢ـ١٩٧٧ دا بە ژمارەی (٢٢٠) دەری کردووە ئەوەیـە کە پارێزەری تاوانبارێك داوا لە دادگا دەکـات تاوانبارەکەی لە کاتی هەڵسان بە نواندنی تاوانەکەی تووشی نەخـۆشی هۆشـو بیربووە جا بۆ سەلماندنی ئەم لایەنە پێـویستـە بدرێ بە لیـژنەی پزیشکی‌ی بۆ ئەوەی ڕاپۆرتێکی دەربارە بنوسرێ‌و لە کاتێکدا ئەگەر ڕاپۆرتەکە ئەوەی دەرخست کە ڕاستـە تاوانبار لە حالەتێکی خۆ لە بیرو چوونەوە بە هۆی نەخۆشی هۆش و بیر ئەم تاوانەی کردووە.. ئەبێتە هۆی ئاسان کردنـەوەی سزای تاوانبـارەکـە ئیتـر لێرەدا دادگای ناوبراو یەکسەر ئەم داوایە بەلاوە دەنێت و دەڵێ:ـ

«ئەمە شتێکی ڕاست نی‌یەو مەبەست لەم داخوازی‌یە ئەوەیە کە کۆسپ بخاتە ڕێگای کۆتایی هێنانی بڕیاری دادگا... دادگای ناوبراویش تێبینی خۆی دەنوسێت و دەڵێ:ـ

«ئەم تاوانبارەی کە تاوانەکەی کردووە بەو پەری ڕێك و پێکی و لەسەر خۆیی‌یەوە تاوانەکەی کردووە و مرۆڤێکی تەواو ئاسایی بووە و ئینجـا بڕیـاری کۆتـایی ئەدات، کە ئەو تاوانبـارە لە تاوانەکەی‌دا تاوانبارەو دەبێ بە پێی بڕیاری دادگا سزا بدرێ...

**«گۆڤاری العدالة» نموونەی دووەم:ـ**

لە بڕیـارێکی تری هەمـان دادگـادا بە ژمـارەی (٣٣٤٠) لە ڕێکەوتی (٣ـ١٠ـ١٩٧٤) دا بڕیارێکی کە لەلایەن دادگایەکی (تـاوانـە گەورەکـان ـ محكمة الجنايات) دەرچووە و دادگای پیـاچـوونـەوەی عیراقی دوای سەیـر کردنی بڕیار دەدات و دەنـوسێت بەر لەوەی ئەم بڕیارە بنێرن بۆ لامان دەبوایە ئەم تاوانبـارە ڕەوانـەی لیـژنەی پزیشکایەتی بکرایەو ئەم لیژنەیە ڕاپۆرتی خۆی دەربارەی بنوسیایە کە ئایا ئەو تاوانبارە لە کاتی تاوانەکەیدا تووشی هیچ جۆرە نەخۆشی‌یەکی هۆش و بیر بووەو ئینجـا تێبینی خۆی دەنـوسێتـەوەو ڕەوانـەی دادگای تاوانە گەورەکانی دەکاتەوەو داوا دەکات ئەم بڕیارە ڕاست بکرێتەوە...

دادگـای پیـاچـوونەوە دەری کردوون جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیان دا هەیە... هەر لەم روانگەیەوە بوو بە پێویستم زانی کەچاوێك بە هەندێ لە بەندەکانی (یاسای جۆنیەتی دادبینی سزایی - قانـون اصـول المحـاکمـات الجـزائیة) بخشێنم و بەتایبەتی لە بەندەکانی (١٦٦،٦٩)دا کە مافی دادگا دەدات تاوانبار بۆ لیژنەی پزیشکایەتی بنێرن و ئەوان راپۆرتی خۆیان دەربارەی تاوانبار بنوسن (بەلام ئەم مافە بە شێوەیەکی فەرمان و داخوازی لەم دوو بەندەدا نییە، بەڵکو مافێکی هەلبژاردنە) ئەمـەش ئەمێنێتـەوە سەر بڕوای ئەو دادگـایە بەرامبەر بەم تاوانەو تاوانبارەکەی.

جا ئەوەی لێرەدا سەرنـج راکێشـە ئەوەیـە کە دادگای تاوانە گەورەکان رێگایەکی نەخشە کێشراوی تەواوی نەگرتووەو هەتا دادگای پیاوچوونەوەش، چونکە وەك روونمان کردەوە لە هەردوو بڕیارەکەدا جیاوازییەك دەبینرێ کە یەك پێچەوانەی ئەوی ترە...

بەلام ئەوەی من لێرەدا دەمـەوێ بیڵێم، ئەوەیـە کە پێـویستە دادگـای تاوانـە گەورەکـان یەکسەر تاوانبار رەوانەی لیژنەی پزیشکـایەتی بکەن بۆ ئەوەی بڕیارو راپۆرتی تەواوی خۆیان دەربارەی ئەم تاوانبارە رابگەیەنن، بەم جۆرە دادگا دەتوانێ هەمـوو پەلپ و بیانویەکی پارێزەری تاوانبار ببڕێت هەتا هی تاوانبـاریش، ئەمـە لەلایـەك لەلایـەکی تریشـەوە ئەندامانی دەستەی دادگاکەش لە کاتی بڕیاردانیان بە ویژدانەوە بڕیار دەدەن و بەبێ ئەوەی تووشی ئازاری ویژدانی ببن و خەڵکیش بەرێزو شانازیو دڵنیاییەوە باسی ئەم دەستەیەو ئەم دادگایەو بڕیارەکانی دەکات و باس لەوە دەکەن کە بەراستی ئەم دادگایە یاسـاییـانـە جوولاوەتـەوەو بڕیـارەکـانی لە جێگای خۆیدا بووە..جا لە کاتێکدا ئەگەر دادگای پیاچوونەوە ئەم بڕیارەشی پەسنـد نەکـرد، بەهیچ جۆرێك ئەم دادگایەی کە بڕیارەکەی دەرکـردووە هیچ گوناهێکی نابێو دووبارەی ناکاتەوە.. دەبێ ئەوەش بڵێـین کە (دادگـای پیـاوچـوونەوە - محكمة التميز) گەورەترین دادگایە لە وولات داو بۆی هەیە هەموو بڕیارێکی دادگـاکـانـی تر بگـەرێنێتـەوە و بۆشی هەیـە دانی بنێ بە بڕیارەکانداو بەهۆی سەلماندن و بەڵگەی گونجاوی یاساو بەندەکانییەوە..

لەهـەمان کاتێشدا ئەم دادگایە هەندێ بەڵگەنامەی تر بەکار ئەهـێـنـێ کە خۆی بەراستی دەزانێت بە تایبـەتی لەکـاتی پیـاچـوونەوەدا، بۆیە من جارێکی تریش دەڵێم وای بەراست دەزانم کە دادگـاکـان تاوانبـار بنـێرن بۆ لیـژنەی ناوبراو تا راپۆرتەکانیان بە گونجاوی بسەلمێنن.

کەوا دەڵێم مەبـەستم ئەوە نـیـە ئەو تاوانبارە لە تاوانەکەی رزگاری ببێ، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە وەك مرۆڤێکی ئەو کۆمەڵە سەیر بکرێو هەموو حەقێکی یاسایی خۆی بدرێتێ تا خۆی بگاتە ئەو راستییە کە تاوانبارە یان تاوانبار نییە، ئەم نەرمییەش لە یاسادا هەیە.

کاتێـك کە دادگـاکـان باوەریـان بەراپۆرتی ئەم لیژنانە هێناو تاوانبـار تاوانـەکەی بەسەر سەپێنرا ئەوە بۆ کۆمەڵیش روون دەبێتەوەو ، دەبێ خۆمان لەم جۆرە کەسانە بپارێزین.

رەنگـە ئەگەر نەخۆشیەکانی ئەم تاوانبارە لەلایەن ئەم لیژنەیە زانـرا هەوڵی چاك کردنـەوەشی بۆ بدرێ وتا ببێتەوە مرۆڤێکی ئاساییو رزگاری ببێت ولە ناو کۆمەڵ دا جارێکی تر دەوری پیرۆزی مرۆڤـانـەی خۆی ببـینـێ.. زۆر جاریش ئەم سزاو بەندکردنەس نابێت بەهۆی ئەوەی کە جارێکی تر ئەو تاوانبارانە بیر لە تاوان کردن نەکەنەوە.. ئەم جۆرە کەسانە لەبەر ئەوەی مێشك وبیریان نەخۆشە پێویستییان بە چارەسەکردن هەیەو رەنگە کۆمەڵیش رزگاری نەبێ لێیان..

ئەمانە زۆر بە زەحمەت لەم بیرکردنەوە ناپەسندانە رزگارییان دەبێ. چونکـە لەراستیدا وەك نەخۆشییەکی کوشندە تووشی هاتوون بەلاشیانەوە گرنگ نییە کە چەند ساڵێك لە بەندیخانە بمێننەوە.. ئەم جۆرە کەسانەش زیاتر ئەو گەنجانەن کە هەست بە تاوانـەکـانـیـان ناکـەن و بێ ئیش وکـارن و هیـچ لێپـرسراوێتییـەکی خێـزانییـان لە ئەستـۆدانییـەو بیر لە دوا رۆژێکی پرشنگداری خۆیان ناکەنەوە.. جا لە بەرئەمە هەر سزادان چارەسـەر نییـە بۆ ئەم تاوانبـارانـە بەڵکـو لایەنی پزیشکیو رۆشنبیرکردنیان دەورێکی گرنگ دەگێڕێ..





# بەلەك | مێكوك

# MAIKUK

ناوەزانستی یەكەی GLycyrrhiza glabra

بەعەرەبی (سوس = عرق السوس) بە ئینگلیزی

Iiquorice - Licorice

وەرگێڕان و ئامادە كردنی

كەمال جەلال غەریب

رووەكـێكی گیـایی دارینی (مخشـوشب) تەمـەن درێـژی دەشتـەكیـیـە، رەگـەكـەی درێژەو بە قوڵایی زەویدا دەچێتە خوارەوە، رەگە شیرینەكەی دەهاڕرێت وبۆ مەبەستی پزیشكی بەكـار دێت و شەربـەتێكی بەنـاوبـانگی لێ دەردەهێنـرێت، نزیكەی (٢٠) جۆر بەلەك لەناوچەی دەریای ناوەراست و ئاسیا وئوستورالیاو جیهانی تازەدا هەیە، تەنها یەك جۆری لە عیراقدا ناسراوە. (مانای glycy rrhiza بەگریكی - رەگە شیرینە - دەگرێتەوە).

رەگـەكـەی یان رووەكەكە خۆی بە عەرەبی پێی دەوترێت (عرق السوس) یان (عرق دارهرم) یان (أصل السوس) بەلەكی ئاسـایی (G. glabra) ، زۆربـەی ئەو بەلەكـەیە كە لە مەیانی بازرگـانیدا بەكار دێت، زۆربەی ئەو بەلەكەی كە دەنێرێت بۆ بەریتانیا لە ئیسپانیاوەیە، بەلام لە ئەمەریكا بە بەلەكی رووسی ناسراوە، وا دیـارە كە بەكـار هێـنـانـی سەرەكـی بەلەك لە پیشەسازیی پوختە كردنی توتندا tobacco یە و بەكار هێنانی ناوەنجی یان دووەمینی، لەم رۆژانەدا لە مەیانی پزیشكێیتدایە.

لە ئەمەریكادا بەرهەم هێنانی پلاستیك وتەبەقە فایبەری Fibre پەستێنـراو، بە بەرهـەمی بەلەكـەوە بەستراوە، پسپۆر جیلیت Gillett وای پێشنیـار كردووە كە دەبێت هەوڵێكی زۆر بدرێت، بۆ ئەوەی بزانـرێت لە كێڵگـە كانـدا، كە ئایـا بەلەك گیایەكی زیانبەخشە بەكشت وكاڵ یان سەرچاوەیەكی باشە بۆ نایترۆجین، هەروەها وتوویەتی كە ئەگەر هاتو رەگەزێكی تازە یان گەشە پێدراو لە بەلەك دۆزرایەوە، كە بشێت بۆ خواردن، مانای ئەوەیە كە بەنرخترین رووەكی خۆراكیمان لە جیهاندا بە دەست كەوتووە.

بەلەك لە جۆری G. glabra گیایەكی تەمەن درێژی قیتە نزیكەی (٣٠-١٠٠)سـم بەرز دەبـێـتـەوە، لووی لیـنجی پێـوەیـە riscidglands ، گەڵاكەی ئاوێتەیە لە شێوەی پەردایە، نزیكەی

(١٠ـ٢٥سم) درێژه، گەڵاکەی لە (٤ـ٨) جووت پەلك پێکهاتووه.

لە رووی خوارەوەی گەڵاکەیدا لوو هەیە، پەرەی گوڵەکەی corolla شینی مەیلەو پەمبەیی یان ئەرخەوانی‌یە، تووەکەی نیمچە خرە، لە قەدپاڵی چیاکان و شیوو دۆڵەکاندا، لە خاکێکی شێداردا، بە درێژایی رۆخی کێڵگەکان، لە کەناری چەمو چغور دەکان و وجۆگەکان لە دەشتە بەرزەکاندا، لە باخچە سێبەرەکاندا، لە ژێر درەختی دارستانەکاندا، لە بەرزایی (١٢٠٠ـ١٩٠٠) مەتردا دەروێت. لەچیاکاندا لە نێوان حوزەیران وئەیلولدا و لە دەشتەکاندا لە نێوان نیسان ومایس یان (ئەیلول وتشرینی یەکەمدا) گوڵ دەکات و بەر دەگرێت، لە عێراقدا لە ناوچە دارستانەکانی خواروو ناوچەی زورگەکان و دەشتە قورو لیتەیی‌یەکان و بیابانەکاندا دەروێت، بە تایبەتی لەناوچەی دارستانەکانی ژورووداو، لە دەرەوەی وڵاتدا: لە خۆرهەڵاتی ئەوروپاو (ساردینیا Sardinia وئیتالیاو وسیسلی و یوغسلافیا وئەلبانیا ویۆنان وبولگاریا ورۆمانیاو وروسیاو فەرەنساو کریت و رۆدس و قوبرس و سوریاو لوبنان وفەلەستین وئوردون وتورکیاو قەفقاس و ئەفغانستان و سیبریاو هیندستان و باکوری ئەفەریقا (لیبیا وجەزائر) دا دەروێت.

**بەلەکی ئاسایی:**ـ رەگی ژێر زەوی ئەم رووەکە (بنەبەلەك = عرق السوس liquorice root مادەیەکی شەکرینی sugary ی تیادایە، بۆن و تامێکی تایبەتی دەدات بە بەلەکەکە.

رەگەکەی هەڵدەکەنرێت و دەنێررێت بۆ بازار بۆ نموونە: بۆ کارگەی بەلەك یان شەربەت لە باشووری بەسرە، هەروەها دەکرێتە شەربەتی کۆکا وپیپسی کۆلاو بۆ بە دەست هێنانی پوختەی ئاوگەکەی، رەگەکان دەچنرێن و لە ئاودا دەکوڵێنرێن، ئینجا ئاوگەکە دەپاڵێورێت و دەهەڵمێنرێت بۆ ئەو پلەیەی کە ئارەزووی دەکرێت، بە زۆری بەلەك لە مەیانی دەرمانسازیی druggists وحەلوادا confectionery بەکار دێت و، لەمەیی سوکەڵەدا وەکو بیرە brewer و لە دروست کردنی خەپڵە توتنی پەستێنراودا(قرص تبغ مضغوط)Plug to bacco بەڵام لە زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی خۆماندا بەلەك بۆ سوتاندن بەکار دێت. پسپۆر وات Watt لە (١٨٩٠)دا وتوویەتی کە بەلەك لە

زۆر کۆنەوە لە هیندستاندا بەکار هێنراوە، هەر چەندە کەکەم بووە لەو وڵاتەدا، بەڵام گرنگی‌یەکی هەبووە لە مەیانی پزیشکیدا بۆ چارەکردنی سووتانەوەی میکرۆبی (الالتهابات المکروبیة inflamatory infections وکۆکە coughs و دەنگ نووسان واتە دەنگ گریی (بحة الصوت hoarseness و بۆ تام و بۆنخۆشکردنی دەرمان، رەگەکەی لە بۆیە کردندا بەکار هێنراوە. لە ئەفغانستاندا تەختەکەی (دارەکەی) لە چاپ کردنی printing (باسمەی) قوماشی لۆکەدا بەکار دێت، هەروەها لە ئێراندا وەکوو سووتەمەنیەك، لە دروست کردنی شووشەدا بەکار هێنراوە. لە عێراقدا شکۆفەی گوڵەکەی نزیکەی ١٠ـ١٥سم درێژ دەبێت، لە ناوچەی چەم وچغور دەکاندا لە دەشتی قورولیتەدا دەروێت، لە دهۆك و سەلاحەدین و شەقلاوەو کەرکوك و چەمچەماڵ و سلێمانیو عەین سفنی Ain sifni وموسڵ وئاکرێو جەبەل حەمرین Jabal Hamrin وسنجار Sangar وخانەقین Khanagin .. هتد.

ئاووگی[٢] بەلەك بە دەرمانێکی ئارامدەر «مسکن» demulcent و بەڵغەم فرێدەر (منخم = expectorant وکارکەرێکی بۆنخۆشکەر Flavouring رەچاو دەکرێت. هاراوەی رەگی بەلەك لە گەلێك دەرمانی پزیشکیدا بەکار دێت. پوختەکەی وەکوو دەرمانێکی رەوانکەری (مسهل ـ Laxative سووکەڵە بەکار دێت، هەروەها یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی دەرمانی کۆکە ـ Cough Syrups و لە بزینەی Lozenges (هەر حەلوایەك یان نوقڵێك دەرمانی تیادابێت) حەبی قورگ. هەروەها دەکرێت بە بەرگی گولاجی دەرمانی ترشی یان ئەو دەرمانانەی کە دڵ لێیان تێك هەڵدێت (قرف nauseous ) وەکوو دەرمانی سینەمەکی (سینا Senna ) وتاڵی شاریی (صبر سقطري aloes ) وکلۆریدی ئەلەمنیۆم وسینگا Senega وبەنج hyoscyamus تەربەنتین Turpentine ... هتد، هەروەها بۆ لابردنی ئازار وبێ تاقەتی discomfort وئەو نیشانانەی تر کە لە ئەنجامی چوونەگەدەی هەندێك مادەی توونەوە acrid دەردەکەون.

پوختەی بەلەك باشترە لە دەرمانە قلیەیی‌یەکان بۆ لابردنی، کاری وروژاندن لەلایەن مادە ترشەکانەوە، هەروەها لەلایەن پزیشکە میللی‌یەکانەوە بە شێوەی دەرمانی بەهێزکەر (مقوی

tonic ) وئارامدەر لە سووتانەوەی ڕێبازەکانی هەناسەداندا Catarrh بەکـار دێـت. ئەو بەلەکـەی کە بۆ مەبـەسـتـی دەرمانسازیی بەکار دێت نابێت کەمتر لە ٢٠٪ لە مادەی تواوەی تیادا بێت، تۆزی بەلەك لە بەلەکی پاك کراو واتە توێکڵی داماڵراو ئامـادە دەکـرێت، ڕەنگـەکـەشی مەیلەو زەردە، هۆی تامـە شیرینەکەی بەلەك دەگەڕێتەوە بۆ مادەی گلایسیر هیزین glycyrrhizin کە بە ڕێـژەی ٢ـ١٤٪ لە جۆرە جیـاوازەکـانی بەلەکدا هەیە، هەروەها جگەلەوە، ئەم مادانەشی تیادایە:ـ

گلوکۆز glucose ٣ر٨٪

سوکەرۆز Sucrose ٤ر٢ـ٥ر٦٪

نیشاستە starch ٣٠٪

ئەسپراجین aspragine

ڕێسین resin ٢ـ٤٪

ڕۆنێکی پەرشەوە بووی زەرد.

گلایکۆساید glycoside ی ئەنثۆزانثین antho xanthin

کە دەبێتە هۆی ڕەنگە زەردەکەی بەلەك، مادەی گلایسیر هیزین کە لە بەلەکدا هەیە (٥٠) جار شیرین ترە وەك لە شەکری قامیش.

هەروەها پوختەی بەلەك بە باشی لە پیشەسازییدا بەکار دێت، بۆ ئەم مەبەستەش ڕەگەکانی دەجـنرێن و دەکرێن بە هەویر Pulp ئینجا بە هۆی هەڵمی ئاوی کەم پەستانەوە پوختە دەکرێت، دوایئـەوە پوختـەکە دەکرێتە عەماری تایبەتییەوە، تڵپەکەی دەنیشێت و ئاوگە ڕوونەکەی لە بۆشاییدا (نەبوونی هەوادا Vacuum خەسـت دەکرێتەوەو دەکرێت بە هەویرێکی توندو بە شێوەی چیلکە stick یان بلۆك blocks لە قاڵبدا دادەڕێژرێت.

بەم جۆرە ئاووگەکە بە شێنەیی بە شێوەی تۆپەڵی قاوەیی تۆخ ڕەق دەبێتەوە، ئەم پوختەیە لە پیشەسازیی بەرهەمەکانی توتندا tobacco وەکوو جگەرە، بەشێوەی مادەی دژی شێ‌ڕ بۆ نخۆش کردن و شیرین کردن بەکار دێت. بەلەکی ئیسپانی، لەمەیانی بازرگـانیـدا بەناو بانگە، چونکە بۆنەکەی خۆشە، لە هەندێك ماڵانـی عیراقـدا بەلەك پارچـەکێکی لێ دروست دەکـرێت وبەشێوەیەکی خۆماڵی بۆ چارەکردنی کۆکەو سەرمابوون بەکار دێـت تڵپـەکـەی بۆ جاری دووەم بەگـیراوەیـەکی ڕوون لە (هایدرۆکسیدی سۆدیۆم) پوختە دەکرێتەوەو بۆ دروست کردنی کەف (رغـوة Foam ) ئاگـر کوژانـدنەوە بەکار دێت، هەروەها کرۆکەکەی یان هەویرە پاشماوەکەی Pulp بە ئاوشی دەکرێتەوە (تحلیـل مائي hydrolysis ) وەدەبێت بە شەکـرێکی ترشاو بۆ ئامادە کردنی ئەلکهول هەروەها لە دروست کردنی هەوێن yeast و ڕوانـدنی قارچـك و دابـڕ کردنی (عزل insulation ) تەختەو فایبەردا Fibre دا.

گەڵای بەلەك لەگـەڵ پەیندا Compost بۆ بەپیت کردنی زەوی بەکار دێت، چونکە مادەی نایترۆجینی زۆر تیادایە. نوێنمەکی Poultice گەڵای بەلەك دەنرێت لە شوێنی داپڵۆخانی (سفع = سمط Scald ) پێست بە ئاوی گەرم، بە تایبەتی پێستی سەر، هەروەها بۆ لابردنی بۆنی Foulper spiration بن باخەڵ armpits هەروەها دەڵێن کە تۆوی بە لەکیش هەر سوودی پزیشکی هەیە ص ٢٦٠ ـ ٢٦١

ئەمـەش بەرگی دەرمانی (سوس = SUS ) واتە بەلەك بەشێوەی حەب، کە پوختەی وشکی بەلەکی تیا دایە و بەرێکەی مژیین بۆ چارەکرنی کۆکەو سوتانەوەی ئاڵووەکان بەکار دێت ولە دەرمانخانەکان دا هەیەو وێنەی ڕووکی لابەلەکی تیادا پیشان دراوە.


## سەرچاوەکان :

١ـ الموسوعة النباتیة العراقیة FIORA OF IRAQ ص ٢٥٩ ـ ٢٦٠

٢ـ الثروة النباتیة في العراق/ مدیریة النبات/ وزارة الاصلاح الزراعي/ ١٩٧٦/

کەلەپوور

# بەراووردێ لەنێوان چەند دەقێکی لاوکی دەروێشی عەبدیدا

نووسینی ئیبراهیم احمد شوان

**ئەوەی ڕاستی بێ تائێستا فۆلکلۆر ناسان و نووسەران توانیویانە چەردەیەکی چاك لە دەقەکانی فۆلکلۆری کوردی بخەنە ژێر دەستی خوێنەران و لەوون بوون ڕزگاریان بکەن و زەمینەیەکی گونجاوو لەبار بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری سازبکەن ، بەڵام هێشتا ئەوانەی کە خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەو دەقانەن بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن و زۆربەی دەقەکان بە خاوی ماونەتەوەو چاوەنۆڕی دەستو پەنجەی شارەزایانن .**

**ئێمەش لەم ڕووانگەیەی کە بتوانین خزمەتێکی بچووك پێشکەشی ئەدەبی فۆلکلۆری بکەین ئەم کارە ئەنجام دەدەین .**

کارەکەش بریتییە لە بەراوورد کردنی چەند دەقێکی فۆلکلۆری کوردی لەژێر ناونیشانی (دەروێشی عەبدی)دا ، دەقەکانیش لەم سەرچاوانە دانە : یەکەمیان لە کتێبی (لاوك)و[1] دووەمیان لە کتێبی (سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقیێ)[2] و سێیەمیان لە کتێبی (ئەفسانە . . لاوك . . گورانی لە فۆلکلۆری کوردیدا)[3] چوارەمیان لە کتێبی (کۆمەڵێك لاوك و حەیران)[4] هەمان دەق لە کتێبی زمان و ئەدەبی کوردیی پۆلی چوارەمی ئامادەیی گشتی بڵاوکراوەتەوە کە دەقاو دەق لە کتێبەکەی محەمەدی مەلا کەریم وەرگیراوە بۆیە ئەم دوو سەرچاوەیە بەیەکێ دادەنێین ، پێنجەمین دەقیش دەستنووسەکەی لای خۆمانە[5] .

دەقەکانیش بە شێوەیەکی گشتی لەسەر یەك بابەت دەڕۆن و هەمان ئەنجامی تراژیدیمان دەدەنێ ، بابەتەکەش دڵداریی نێوان (دەروێشی عەبدی و عەدلە خاتوونی) کچی زۆر تەمر پاشای سەرۆك عەشیرەتی ملییە .

جا بۆ ئەوەی زیاتر بەراووردەکەمان بۆ ڕوون بێتەوە ئەوا دەقە دەستنووسەکەی لای خۆمانتان بۆ تۆمار دەکەین بۆ دەقەکانی تریش خوێنەر خۆی دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر سەرچاوەکانیان کەلە پەراوێزدا ئاماژەیان بۆ کراوە .

## دەروێشی عەبدی

– **عەدلە خاتوونی دگۆ :** دلێ منێ دویت قومەکی ئاڤ ئەڕێتۆ ، منی ڕابم هەنگینی دەستێ خۆ ل دەروێشی عەبدی هەل دگرم هەتا ئەوێ ڕۆژێ زۆر تەمر پاشایێ ملی ددەنە دارەکی لداری جەلیتۆ ، هەتاکو خرنگینی بێلا ، دەنگی یاسینی لسەر قەبری منی دیتۆ ، ئەوجا نالە نالی عاشق و مەعشوقا لەگۆما منی دوور ببێتۆ . دەروێشۆ ،

**عەدلە خاتوونی دگۆ :**

منی تەی بمالم نەی بمیرم ، ئەمان خودانی حەفت برایان و پسماما وەکی شیرم ، منی ڕۆژی سێ جاران کوڕە دەروێشی خۆ نەبینم ل گەڕێ دیلانی لعاوی گووەندی مەیتی هەر حەفت برایان و دوازدە پسمامان ل زیارەتی بەری مالی بدەستی خو وەشیرم .

**دەروێشی دگۆ :**

ئەی نێ خودێ وو ، منی لتو دویت دین و ئیمان ، لدوایی ژنەکی جوان ، ماینەکابەز . تفەنگەکا بلیدان ، تاژیەکا بکوژ ، کۆنەکی ڕەشی حەلەبی ، کوتکەکا

لداری دار بناڤیٚ ، بەری کۆنیٚ بدەمەسیڤ ، پشتی کونی بدەمە لیٚری وی هەتاویٚ .

**عەدلە خاتوونی دگۆ :** وەکی دەرۆیش کورە لاوکی منی لە تیری بنی بەریٚی ، لگەل کۆمەکی سواری گیٚچیانو ملیان دگەریٚتەوە لراویٚ ، سینگی خۆ بکەمە سینەکا زیٚرو فەخفوری ، جۆت مەمکیٚ خۆ بکەمە فنجانی قاویٚ ، بگرم جەلەویٚ ئەسپی دەرویٚشی عەبدی ، لە رووییٚ راستی بدەمی جوتەکا راموسانی ، لرووییٚ چۆپی‌لیٚ بکەم سلاویٚ ، لرووییٚ راستی بدەمی دوو راموسانی لباڤی هەرامە خودانی وی سراویٚ ، نەمینم خودبوو ، شەوگیری شەو بوو ، سواری عەدیبوو ، میوانو داخوازی وی بەژنی بوو .

**عەدلە خاتوونی دگۆ :**

دلی منی عەجزەو مەلوولە دخوازی قومەکی ئاوی نوریتۆ ، وەکی دەرویٚشی کورە لاوەکی منی لە تیری بنی بەریٚی لگەل کۆمەکی سواری گیٚچیانو ملیانو گەرگەریا دگەریتۆ ، وەکی دەچتە ناو کەچکی زینانو خەلتا ، سەریٚ خۆ دانیٚبە سەر رانی وا ئەوی رۆژی مردنا بیرامن تیتۆ ، دەلۆیلۆ – دەلۆیلۆ – دەلۆیلۆ .

خۆ مەمکی عەدلەخاتوونی نەبووە هەنجیری ژەنگاری ، پرتەقالی دیاربەکری ، هەناری شارەبانی ، هیٚواران‌و سبەینان کورە لاوەکی منی دخوا بیٚ‌ناوکو بیٚ دوندکو دەرویٚشو ، دەلۆیلۆ – دەلۆیلۆ – دەلۆیلۆ .

**عەدلە خاتوونی دگۆ :**

نەی گیٚچیمە ، نەی ملیمە ، عەدلە خاتوونی کەچکی مستەفا پاشاییٚ هەکاریمە[٦] ، بکراسی کتانی ێن مەگروومی حەلەبیمە ، بقۆندرەکا دەگٚ دەگی ، ب عەبایەکا شان بەسورمە ، بِ سۆلکەکا بەغدایمە .

**عەدلی خاتوونی دگۆ :**

ئەگەر منی نەدەنە دەرویٚشی عەبدی ، دەچمە ناو عیٚلو عیٚلە ساتی دبیٚژم ئەزی دەزگیرانی دەرویٚشی عەبدیمە ، دەلۆیلۆ دەلۆیلۆ – دەلۆیلۆ .

**بەلیٚ عەدلە خاتوونی دگۆ :**

ناڤی عەشیرەتی مەی هەکاریە ، عەشرەتی پسمامی مەی ملیە ، عەشرەتی خالی منی گیٚچوانیە ، سەری چەند سالاً منو دەرویٚشی کورە لاوکی خۆ هەوینیا ، خۆ لسەر شەریعەتی ئیسلامی وی گریتە ، ئەزی سویندەکی گەلی مەزنی وی خواردیە ، مالیو میری لخو حەرام کردیە ، پاشی پەژنی کورە لاوکی خۆ دەرویٚشی عەبدیە ، بەلیٚ خودیٚ خرا بکا مالیٚ بابیٚ منی ، منی نەدانە دەرویٚشی عەبدیە ، دیارە کەس لدەردی دلداریو عەشقی منو کورە لاڤکی منی نەفکریە .

**عەدلە خاتوونی دگۆ :**

ناڤی جوانیٚ کورە لاوکی منی تیارە ، کورۆ لاوکو لتیارا مەبە سوارە ، جوانیەکا گەلەکا نەفامەو نەزانە ، گەلەکا ترشو تالە ، ئەگەر بیٚتو لنیوەکا سەری مەیدانی بکەویە خوارە ، شەرمەو عەیبەو مخابنە ، کەچی گوندی مەو زینانو خەلتا د بیٚژن کورە لاوکی تەی تونکی یەزیدیانەو نەی سوارە .

**عەدلە خاتوونی دگۆ :**

سەری منی گەلەکی دیٚشی ، دلی منی رەقە وەکی بزماری پەرچە ، حەتەبی سولی تەی دەوارە .

**عەدلە خاتوونی دگۆ :**

ئەورۆ مالی دەرویٚشی عەبدی لیٚ دەنا دەروا سەر بەرەو خوارە ، دەچووە حاویا مەلا محەمەدی ، چەما گورزۆیی جێی شیٚرانو پلینگانو دەغلو دارە ، منی رابم چاڤیٚ خۆ لسەر داری دوربینی بینمو بشەتینمو بلەقینم ، لەفەکی سواری کیکیانو ملیان دارامینمو بگەرینم ، ئەمان گەلەکی حەیفو مخابنی منی دمینی ئەوروکە سیٚ رۆژە دەنگی کورە لاوکی منی لناو تیپەکی سواران نابیٚو نەی دیارە .

**عەدلی دگۆ :**

داوەتەکی دگەرا لگەرپی دیلانی حاوی گووەندی عوبی شابیٚ ، منی رابم بچمە دەستی دەرویٚشی عەبدی ، هەتا خەلكو عالەمی گوندی مەی بلا بیٚژن : بەژنی عەدلی چەند شیرنە لگەل بەژنی دەرویٚشی عەبدی لیٚك تیٚ .

دگوکورۆ دەرویٚشۆ ، ئەتوو وەرە راموسە سەری روومەتا سورا گول گولی ، خوشتر لخورمابیٚ بەغدابیٚ ، لکشمشا مووسلیٚ ، للیمۆیا مەندلییٚ ، لهەنجیرا ژەنگاریٚ ، لترێیا باکورمانیٚ ، لهەناریٚ تەهرانیٚ ، هەربیٚ‌ناوکو بیٚ دەندکۆ .

## سەربوردەی لاوکەکە

وادەگیٚرنەوە دەرویٚشی عەبدی کورە ئاغایەك دەبیٚو باوکی ئەوی (عەبدی) دەبیٚ ، رۆژیٚك دوو میوانی دیٚ ، هەردووکیان لە نیٚوان خۆیاندا چرپەیەك دەکەن ، ئەویش پیٚیان دەلیٚ : جوان‌نیە میوان بەدزی قسان بکەن . پیٚم بلیٚن : چیتان گوت ؟ گوتیان : هیچ . گوتی : نابیٚ ، هەر دەبیٚ پیٚم بلیٚن . گوتیان : وەللا هیچمان نەگوت . دەرویٚشیش خەنجەرەکەی دەرهیٚناو گوتی : وەللاهی ئەگەر پیٚم نەلیٚن هەردووکتان بەم خەنجەرە لەت‌وپەت دەکەم .

ئەوجا یەکیٚکیان گوتی : وەللا چیت لیٚ بشارمەوە کچە پاشایەك هەیە ناوی (عەدلە خاتوون)ە ، هەر قابیل بە تووی دەبینین ، جا گوتمان بەخوا حەیفە عەدلە خاتوون نەدەنە تۆ ، چونکە شایانتە .

ئەوسا دەرویٚش بەتەواوی ئەدرەسەکەی لیٚیان وەرگرت‌و هەنجەتیٚکی بە دایكو باوکی گرت‌و خوی لیٚیان توورە کرد ، جلیٚکی شرو ووری لەبەرکردو بەرەو وولاًتی (عەدلە) بەریٚ کەوت‌و لە دیوەخان دابەزی . لە دوای ئەوەی دیوەخان چۆل‌بوو ، پاشا لیٚی پرسی : چ کاریٚکت هەیە ؟

گوتی : لە عەشیرەتی خۆم زویٚر بوومەو هانام هیٚناوەتە بەرتانو کاریٚکم پیٚ بکەن . پاشا گوتی : چ دەزانی ؟ گوتی : دەزانم قاوەی لیٚبنیٚم . پاشا گوتی : کەواتە دەتکەمە قاوەچی دیوەخانو ئەگەر قاوەت باش لیٚنا دەتکەمە قاوەچی مالیٚ . کە بەیانی داهات قاوەیەکی وای بۆ پاشا لیٚنا سەری سورما ، چونکە پیٚشتر هیچ قاوەی وای نەدیبوو . لەبەر ئەوە بریاری‌دا کە بیبیٚتە قاوەچی مالیٚ . بەم جورە گەیشتە مەبەستی خۆی .

لە وکاتەدا وا باوبوو ، عەشیرەتەکان هێرشیان دەبردە سەر یەکترو تالآنیان دەهێنا ، بۆیە عەشیرەتی (عەدلە خاتوون) چوونە تالآن کردنی عەشیرەتێکی ترو کەس لە گوندی نەمابو تەنیا چەند پیرێك‌و دەروێشی عەبدی .
هەر هێندەیان زانی تاقە سوارێك هێرشیان هێنایە سەر باوکی عەدلەو هەمو شتێکیان بە تالآن برد . لەبەر ئەوە عەدلە کردیە هەراو ئەو چەند کەسەی مابوون ئامادەی کردن بۆ شەر ، هەروەها داوای لە دەروێشیش کرد ئەگەر بتوانێ بەشداری بکات . ئەویش گوتی : باشە ماینێکم بۆ بێنە . عەدلەش ماینە کەوێتەکەی باوکی بۆ هێناو ئەو گورزە قورسەشی پێ نیشان‌دا کە کەس نەی دەتوانی هەڵی بگرێت . دەروێشیش ماینەکەی لە دەست عەدلە وەرگرت‌و کەسواری بوو سەرە سمکەکی لەمەمکی عەدلەدا . عەدلەش سەری سورماو لە دڵی خۆیدا گوتی : ئەم کورە شتێك هەیە ئەگەر نا چۆن زانی کرد وا بکات ؟
ئەوجا دەروێش چوو گورزەکەی بڵند کردو گوتی : وەڵلاهی سووکە بەلآم قەیدی ناکات ، رمەکەشی بردو رۆیشت‌و گەیشتە تالآن کەرەکان . لەوێ کارێکی وەهای پێکردن کە با بە دەواری شڕی نەکردبێ (عەدلەش لەسەر بانی بە دووربین سەیری شەڕەکەی دەکرد) هەتا توانی هەموو تالآنەکە بگێڕێتەوەو گەرایەوە گوندی‌و لەپێش دیوەخان رمەکەی چەقاندو چوو لە دیوەخان دانیشت .
کەسوارەکانی خۆیان هاتنەوە ، باسی ئەو هێرشەی دوژمنیان بۆکردن کە چۆن هەموو ماڵیان بەتالآن بردن ، کەچی بەئازایەتی خۆیان توانییان هەموویان لێ بگێڕنەوە ، هەرکەس دەیگوت : بەهێزو بازووی من گەڕاوەتەوە ، بەلآم دەروێش هەڵی دایەو گوتی : خۆ دیارە کاری کێیە . بووە مشتومڕیان . لەو کاتەدا عەدلە خاتوون هات‌و گوتی : پێویست ناکات کەس خۆی هەڵبکێشێ ، ئەوەی کردی هەر دەروێش کردی . خۆم بە دووربین سەیرم دەکرد کە چ کارێکی بەو سوارانە کرد ، نیشانەیەکی دیش هەیە کە کردەی ئەوە ، ئەو رمەی چەقاندوویەتی مەردبن بڕۆن هەڵی‌کێشن . ئیدی هەرچی دەچوو نەی دەتوانی هەڵی‌کێشێ ، تا بە ناچاری دانیان پێدانا کە ئەوەی کردی هەر دەروێش بوو .
لەو رۆژەوە (عەدلە) دڵی بە (دەروێش) داچوو ، گڕی دڵداری لە نێوانیاندا گڕی سەندو کوژانەوەی بۆ نەبوو ، بەتایبەتی هەرکە دەروێش سەر بوردەی خۆی بۆ گێڕابەوە . ئەوجا هەریەکە لاووکیان بەوی تردا دەگوت ، بەتایبەتی دەروێش خۆی پێ نەدەگیراو هەتا وای لێ‌هات خەڵك هەموو پێیان زانی ، تا براکانیشی ، بەلآم دەروێش هێندە بێ‌باك بوو هیچ گوێی لێ نەبوو .

رۆژێك برایەکانی عەدلەو ئامۆزایەکانی تەگبیریان لێکرد کە بە فێڵی ڕاو بیبەنە دەشتێ‌و لەوێ بیکوژن . عەدلە کە بەمەی زانی ، یەکسەر بە دەروێشی ڕاگەیاند ، بەلآم دەروێش لەبەر بێ‌باکی خۆی گوێی پێ‌نەدا .
رۆژێك پێیان گوت : دەمانەوێ بچینە ڕاو ئەویش لەگەڵیان چوو ، هەرکەڕاوی خۆیان کرد بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ دانیشتن ، لەوکاتەی دەروێش دانیشتبوو ، هەموو هێرشیان بردە سەری‌و کوشتیان .
عەدلەش لەسەربانی بە دووربین سەیری دەکردو زانی کەوا کوشتیان ، بۆیە دەستی بە گریان کردو لاوکی بە سۆزی بەسەردا هەڵ دەگوت .

**بەراووردی نێوان دەقەکان**

ئەگەر سەیری ئەم چەند لاوکە بکەین دەبینین لەرووی بابەتەوە هەموویان باسی دڵداری (دەروێشی عەبدی‌و عەدلە خاتوون) دەکەن‌و لە ئەنجامیشدا بەیەك ناگەن .

لە هەموو دەقەکاندا لێکچوون‌و جیاوازی بەرچاو دەکەوێت ، ئێستاش وا لەلاپەڕەکانی داهاتوودا ئەم لێکچوون‌و جیاوازیانە دەخەینە بەرچاو .

**لێکچوونی دەقەکان**

**١) لینویتی شکان بە ئاوی فورات :**

– (دلێ منێ دویت قومەکی ئاڤ فەریتێ) دەستنووس .
– (دلێ منێ دوێت قومەکێ ئاوێ لئاوێ فەریتێ) کۆمەڵێك لاوك‌و حەیران ، ل ١١ ، دێڕی ٨ .
– (بەلێ هاوینە دلێ من دێرانی دڤێ قومەکا ئاڤێ ژ ئاڤا فریتێ) لاوك ، ل ٢٢ ، دیڕی ٩–١٠ .
– (دلێ منی دخوازی قومەکی ئاوی لئاوێ کانیێ ئەوی سەریتێ) ئەفسانە ، لاوك . . گۆرانی ، ل ٧٣ ، دیڕی ٥ .
تەنیا جیاوازی لە جیاتی (فریتێ) بووەتە (سەریتێ) .
– لە دەقە درێژەکەی نوردووخانی جەلیل‌دا ئەم ئاو خواردنەوەیە لە زێی فورات نییە .

**٢) پاڵەوانەکانی دەقەکان :**

ناوی پاڵەوانی دەقەکان لە هەموویاندا یەکەو چ جیاوازییەکی ئەوتۆ نابینرێ ، ناوی کچەکە لە هەمواندا (عەدلە ، عەدلە خاتوون ، عەدلێ ، عەدوولێ)یە ، کە هەر مەبەستی یەك ناوە ، ناوی دڵدارەکەش (دەروێشی عەبدی ، دەورێشی عەڤدی)یە ، کە هەر یەکن ، ناوی باوکی عەدلەش لە هەموو سەرچاوەکاندا (زۆر تەمر پاشا)ی ملییە ، تەنیا لە دەستنووسەکەدا جارێك (زۆر تەمر پاشا) یەو جارێك (مستەفا پاشا) ، کە بێگومان ناوی دووەم هەڵەیە .

**٣) ئایینی دەروێشی عەبدی :**

لە هەموو سەرچاوەکان یەزیدیە :
– (عەدلە دگۆ وەنییە عەگیدێ سندیان لاوکێ یەزیدی من کوژرایە) . ئەفسانە . . لاوك . . گۆرانی ، ل ٧٨ .
– (عەدلێ دگۆ : حاشا دکەم لدینێ محەمەدی ساف یەزیدیمە) . کۆمەڵێك لاوك‌و حەیران ، ل ١٢ .
– (دەورێش گۆ : ئابۆ ، ئەرێ ، برا ئەز ئێزدیمە) . سترانێ زارگوتنێ کوردایە تاریقیێ ، ل ٣٦٤ .
– (ئێزدی لە لە ناوچوونی دەروێشی عەڤدی لە بنەماڵەی زۆر تەمر پاشا دڵگیر نەبوونە چونکو دەستیان – بە ئەنقەست – لە کوشتنێ دەروێشدا نەبووە) [٧] .

گۆڤاری كاروان . ژماره (٦٧) ، خلدریٚ سلێمان ، ل ٣٦ .
– (عەدله دگۆ : كەچی گوندیٚ مەو زینانو خەلتا دبێژن كوڕه لاوكی تەی توونكی بەزیدیانەو نەیسواره) . دەستنووس .
– لەكتێبی (لاوك) دا ئەم باسەی تێدا نییه .
٤) داخوازییەكانی دەروێشی عەبدی له خودا) : ئەو شتانەی دەروێشی عەبدی له خوای گەرەكه له دەقەكاندا بەیەك دەچن .
– (دەروێشی دگۆ : ئەی لیٚ خودیٚ وو ، منی لتوو دویت دینو ئیمان ، لدوایی ژنەكی جوان ، ماینەكا ببەز ، تفەنگەكا بلێدان ، تاژیەكا بكوژ[8] ، كونەكی ڕەشی حەلەبی ، كوتكەكا لداری دار بناویٚ) . دەستنووس .
– (منی نامەویٚ مالەكی تێری تەژی ، منی دمەویٚ ئەوەل دینو ئیمان ، ژنەكی جوان ، ماینەكی ببەز ، جۆته تاجیەكی بكوژ ، كۆنەكی ڕەشی عەلەبی ، مێكوتەكی لداری دار بناویٚ) . كۆمەڵێك لاوكو حەیران ، ل ١٠ .
– (بەلیٚ من مالەكه زۆر لەته نافی ، ئەول دینو ئیمان ، جەلەبەكی دەویٚ ، تەولەكه ئەسپان ، ماینەكه ببەز ، دوو تاژی بكوژ ، بەلیٚ تفەنگەكه لێدەر ، كۆمەكا ڕەشیرەبی ، مێكوتەكا داریٚ فیٚ بنافیٚ) لاوك ، ل ٢١ .
– (عەدلیٚ هاواری خودیٚ دكەم ، خودیٚ ب منی مالەكا زۆری دنیٚ لتوو ناویٚ ، لتوو دویٚ دینو ئیمان ، ژنەكا جوان ، بەژنو بالای عەدله خان ، ماینەك دزیٚ ..كۆنەك ڕەشی عارەبی ، مێكوتەك بەینوون (لداری بناویٚ) . ئەفسانه . . لاوك . . گۆرانی ، ل ٧٤–٧٥ .
– له كتێبەكەی ئوردووخانی جەلیلدا ئەم داخوازیانه نینه .

### ٥) لەو شەڕەی دەروێشی عەبدی بەشداری تێدا كردووه :

– لەدەستنووسەكەدا شەڕێكه له نێوان عەشیرەتی باوكی عەدله (ملی) و عەشیرەتێكی دی بەناوی (گیسان)ه ، عەشیرەتی (ملی و كیكی) كوردنو (گیسان) عەرەبه[9]
– له كتێبی كۆمەڵێك لاوكو حەیراندا باسی شەڕێك دەكات له نێوان عەشیرەتی عەدله (ملی) و عەشیرەتی (عەدوانان) ، واتا : دوژمنەكانو ناوی نابات .
– له كتێبی لاوكدا شەڕەكه له نێوان (ملی)ی عەشیرەتی عەدلەیه لەگەڵ عەشیرەتی (گیسان)ی دوژمندا .
– له كتێبی ئەفسانه . . لاوك . . . گۆرانیدا شەڕەكه له نێوان عەشیرەتی (ملی) كه زۆر تەمر پاشا سەرۆكی بووه لەگەڵ – عەشیرەتی (عەدیانو جێسیان) كه قەفاری عەجیل سەرۆكیان بووه ، لێرەشدا (جێسیانو گیسان) هەمان عەشیرەتن .
– لەكتێبی سترانیٚ زارگوتنا كوردانا تاریقێیدا شەڕەكه له نێوان عەشیرەتی كیكیو ملی ــ سەرۆكیان زۆر تەمر پاشایه لەگەڵ عەشیرەتی گێسا كه سەرۆكی عەجیل براهیم بووه . لێرەشدا (گیسانو گێسا) یەك عەشیرەتن .

### ٦) چەند وەسفێكی عەدله خاتوون :

كه عەدله خاتوون به دەروێشدا هەڵدەلیٚ ، لەم ڕستانەدا لێكچوون هەیه له نێوان دەقەكاندا :
– (عەدله خاتوونی دگۆ : . . . سینگیٚ خۆ بكەمه سینەكا زێڕو فەخفووری ، جۆت مەمكیٚ خۆ بكەمه فنجانی قاویٚ ، لڕوویی ڕاستی بدەمیٚ جووتەك ڕاموسانیٚ ، لڕوویی چۆیی لیٚ بكەم سلاویٚ) . دەستنووس .
(عەدلیٚ دگۆ : منیٚ ڕابم سینگیٚ خۆ بكەمه سنی ، مەمكیٚ خۆ بكەمه فنجانیٚ قاویٚ . . . هتد) . كۆمەڵێك لاوكو حەیران ، ل ١٠–١١ .
– (سینگا خۆ بكەمه سێنی ، مەمكیٚ خۆ بكەمه فنجانیٚ قاوی : . . . هتد) لاوك ، ل ٢٢ .
– (سینگیٚ خۆم لبۆ توو دەكەمه سینی مەجلیسان ، هەردوو مەمكی خۆ لۆ دەكەمه فنجانی زێڕی گومگومەی قاویٚ . . هتد) ئەفسانه . . لاوك . . . گۆرانی ، ل ٧٥ .
– له كتێبی سترانیٚ زارگۆتنا كوردایه تاریقێی) دا باسی ئەم شتانه ناكات تەنیا باسی ئەوه دەكات كه (عەدۆلیٚ) له دیوەخانی باوكی قاوەی بۆ پاڵەوانان گێڕاوه .

### ٧) هەڵدانی ڕەشماڵەكەی دەروێشی عەبدی :

لێرەدا دەروێشی عەبدی كه ڕەشماڵەكەی هەڵدەدا ڕووی له شاخ دەكاتو پشتی له تیشكی ڕۆژ دەكات :
– (بەری كۆنی بدەمه سیفیٚ ، پشتی كۆنی بدەمه لێری وی هەتاویٚ) دەستنووس .
– (منیٚ ڕابم بەری كۆنی بدەمه چیاییٚ قەرەچ داغیٚ ، پشتی كۆنی بدەمه گەزەنگیتەی هەتاویٚ) كۆمەڵێك لاوكو حەیران ، ل ١٠ .
– (بەلیٚ ویٚ كۆنیٚ ژێرا بەمه سەر چیاییٚ قەرەج داغیٚ ، كەلیٚ نەمروودی ، بەریٚ كۆنیٚ بدەمه نیسیٚ نساریٚ ، پشتیٚ كۆنیٚ بدەمه تیرێژەكا تافی) لاوك ، ل ٢١ .
– (ئەویٚ كۆنم هەر بدابوایه لبن چیاییٚ عەبدول عەزیزی ، ڕووی كۆنێم بدابوایه دۆریٚ نەمروودیٚ ، پشتیٚ كۆنێم بدابوایه شاری دیاربەكرو . . هتد) . ئەفسانه . . لاوك . . گۆرانی ، ل ٧٥ .
– له كتێبەكەی ئوردووخانی جەلیلدا باسی دەوار هەڵدانی بەم جۆره تێدا نییه .

### ٨) كه عەدله خاتوون وەسفی ڕوومەتی خۆی دەكات :

له هەموو سەرچاوەكاندا وەسفەكه لێك دەكەنەوەو هاوبەشی هەیه :
– (دگۆ كوڕۆ دەروێشو ، ئەتوو وەره ڕاموسه سەری ڕوومەتا سوڕا گولگولی ، خوشتر لخورمایی بەغدایی ، لكشمشا موسلیٚ ، لیمۆیا مەندەلیێی ، لهەنجیرا ژەنگاریٚ ، لترێیا باكورمانیٚ ، لهەناریٚ تەهرانیٚ ، هەرییٚناوكو لیٚ دەندكۆ) . دەستنووس .
– (عەدلیٚ دگو : كوڕۆ دەروێشۆ ، ئەتوو وەره ڕاموسه سەریٚ ڕوومەتا سوڕا گولگولیٚ ، خۆشتره لتەمریٚ بەغدایی لكشمشا موسلیٚ . . لهەناریٚ شەقلاویٚ . . هتد) . كۆمەڵێك لاوكو حەیران ، ل ١٥ .
– (ماچی عەدلەخان شیرینتره هەنجیری باشقەلان ، ترێی باكورمان ، پەنیریٚ لزۆزان ، لخورمایی بیٚناوكو) ئەفسانه . . لاوك . . گۆرانی ، ل ٧٦ . ١
– هەرچەنده له كتێبەكەی ئوردووخانی جەلیلدا باسی وەسفی ئەم ماچه ناكات

بەڵام هەندێك لەم ووشانەی تێدایە وەکو :
(ترێی دەشتا بێلەجووکۆ . هناریٚ شیرنۆ بیٚ دەندکۆ) سترانیٚ زارگوتنا کوردایە تاریقیٚ ، ل ٣٧٢ .
– لە کتێبی لاوکدا ئەم وەسفانەی تێدا نییەو زۆر کورتە .

**٩) ئەنجامی لاوکەکە :**

ئەنجامی ئەم لاوکە لە هەموویاندا تراژیدییەو بە لە ناو چوونی دەروێشی عەبدیو نەگەیشتنی بە عەدلە خاتوون کۆتایی دێت .

**جیاوازی دەقەکان**

ئەم دەقانەی باسمان کردن لایەنی لێکچوونیان زیاترە لە جیاوازی ، وامان بە چاك زانی جیاوازییەکانیش بخەینە بەرچاو ، هەرچەندە ئەگەر هەموو جیاوازییەکان بەووردو درشتییەوە دەربخەین ئەوا هەویرەکەی زۆری ئاو دەویٚ ، بۆیە وامان بەچاك زانی جیاوازییە زەقەکان پەنجەیان بۆ رابکێشریٚو ئەوانی تریش چاویان لیٚ بپۆشریٚ ، چونکە ئەو دەقەی کە لە کتێبەکەی ئوردووخانی جەلیل‌دا هەیە جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ دەقەکانی ترداو چەردەیەکی زۆری داگرتووە لە کتێبەکەدا ، ئێستاش‌وا لە خوارەوە یەکە یەکە بە جیاوازییەکانتان شاد دەکەین :

**١) سەربوردەی لاوکەکە :**

– لە دەستنووسەکەدا بەم شێوەیە (دەروێش کورە ئاغەیەو دە‌ﺟ.. دیوەخانی باوکی عەدلە دەبێتە قاوەچیی ماڵەوەو حەز لە عەدلە دەکاو لە ...ڕێکدا ئازایەتی دەنوێنیٚو دڵداریی لەگەڵ عەدلە ئاشکرا دەبیٚو براو ئامۆز..کانی بە فێلٚ دەیبەنە ڕاو دەیکوژن) .
– لە کتێبی کۆمەڵێك لاوك‌و حەیراندا بەم جۆرەیە : (دەروێش کورە وەجاغ زادەکی یەزیدیەو ناوبانگی عەدلەی بیستووەو لە باوکی ..ر دەبیٚو دەچێتە لای تەمر پاشاو دەبێتە قاوەچیی ئەو ، لەوکاتەدا پاشایەك داوای باج لە تەمر پاشا دەکاو پیاوەکانی پاشاش دەڵێن : توانای شەڕمان نییە ، بەڵام دەروێش سوارەکان لە خۆی کۆ دەکاتەوەو بەسەریاندا زاڵ دەبێت‌و دڵداریی لەگەڵ عەدلەدا گرێ دەسێنیٚو براو ئامۆزایەکانی لە ناوی دەبەن) .
– لە کتێبی لاوکدا سەربوردەی نییە
– لە کتێبەکەی ئەسعەد عەدۆدا هەمان سەربوردەی کتێبەکەی محەمەدی مەلا کەریمە ، بەڵام کاك ئەسعەد ناوی پاشاکەی داوای باجی کردووە بە (قەفاری عجیل) ناوبردووە ، شەڕ دەستی پێکردو دەروێش دوو سەد کەسی لێیان کوشت ، لە ئەنجامدا دەروێشیش دەکوژریٚ .
– لە کتێبەکەی ئوردووخانی جەلیل‌دا سەربوردەکە بەم جۆرەیە :
(عەفدیی باوکی دەروێش شوانی زور تەمر پاشا بووە ، لە شەڕێکدا لەگەڵ عەشیرەتی گێسا کە عەرەب بوونە سەد پیاوی لێیان کوشتووەو ئینجا زۆر تەمر پاشا ژنی بۆ هێناوەو خوا دەروێشی پیٚ بەخشیوە ، کە دەروێش گەورە بوو زۆر تەمر پاشا باوکی دەرکرد ، کە عەجیل ابراهیم داوای باجی لە زۆر تەمر پاشا کرد بە

ناچاری ناردییە شوێن دەروێش‌و ئەویش لەبەر خاتری عەدلە خاتوون چووە شەڕەکەو لە پێناویدا سەری نایەوە .

**٢) لەناو چوونی دەروێشی عەبدی :**

– لە دەستنووسەکەو کتێبەکەی محەمەدی مەلا کەریم (کۆمەڵێك لاوك‌و حەیران)دا دەروێشی عەبدی بەدەستی براو ئامۆزای عەدلە خاتوون لەناو چووە ، بەڵام لە کتێبەکەی جەلال مەلا حەسەن خۆشناودا (لاوك) باسی ئەمە ناکات ، کەچی بە پێچەوانەی ئەمانەوە لە کتێبەکەی ئەسعەد عەدۆ (ئەفسانە . . لاوك . . گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردی‌دا) و کتێبەکەی ئوردووخانی جەلیل (سترانیٚ زارگۆتنا کوردایە تاریقیٚ)دا کەس‌و کاری عەدلە خاتوون دوورن لەم تاوانەو ئەسپەکەی لە شەڕی (گیسان)دا قاچی دەکەوێتە کونە جورج‌و مشك‌و بەر دەبێتەوەو سواری دوژمن گەمارۆی دەدەن‌و دەیکوژن .

**٣) باسی بارکردنی ماڵی دەروێشی عەبدی :**

– (عەدلە خاتوونی دگۆ : ئەورۆ ماڵی دەروێشی عەبدی لیٚ دەنا دەروا سەر بەرەو خوارە ، دەچوە حاوییا مەلا محەمەدی چەما گوررزۆنیٚ . . هتد) دەستنووس .
– (عەدلیٚ دگۆ : ئەورۆ ماڵیٚ دەروێشی عەبدی لێی دەنا . . هتد) کۆمەڵێك لاوك‌و حەیران ، ل ١٤ .
– (لە کتێبی لاوك‌و کتێبی ئەفسانە . . لاوك . . گۆرانی دا ئەم بارکردنە بەرچاو ناکەوێت ، هەروەها لە دەقەکەی ئوردووخانی جەلیلیشدا نییە ، تەنیا لە پەراوێزدا باسی بارکردنی ماڵی (عەفدی)ی باوکی دەروێش دەکات) سترانیٚ زارگۆتنا کوردایە تاریقیٚ ، ل ٤٨٩ .

**٤) ناوی هەسپەکەی دەروێشی عەبدی :**

– لە دەستنووسەکەدا ناوی (تیار)ە .
– لە کتێبی (کۆمەڵێك لاوك‌و حەیران)دا ناوی (جەدلان)ە .
– لە کتێبی (ئەفسانە . . لاوك . . گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردی)دا ناوی (هدمان)ە .
– لە کتێبی (سترانیٚ زارگۆتنا کوردانە تاریقیٚ)دا (هدمان)ە
– لە کتێبی (لاوك) دا ناوی نییە .

**٥) کەس‌و کارو ئامۆزاکانی عەدلە خاتوون :**

– (ئەمان خودانی حەفت برایانو دوازدە پسماما وەکی شێرم) دەستنووس .
– (ئەمان ساحێبی حەفت برایانو دوازدە پسماما وەکی شێرم) کۆمەڵێك لاوك‌و حەیران ، ل ١١ تەنیا لەم دووانەدا لە یەك دەچن ، بەڵام لەمانەی خوارەوەدا جیانە :
– لە کتێبی (لاوك) دا بەرچاو ناکەوێت
– (ئەگەر رۆژیٚ سیٚ جاران . . بابیٚ خۆ ئەیووبی براو هەرچەند برایان بە دەستیٚ خۆ شیری) ئەفسانە . . لاوك . . گۆرانی ، ل ٧٨ ، لێرەدا ژمارەی برایەکان دیار ناکاو بیٚ ئامۆزایە .

- لە دێبی (ستڕانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقێ) دا باسی براو ئامۆزای تێدا نییە ، بەڵکو ناوی برایەکانی دەروێشی عەبدی دەهێنێ : (توو بدە من عەلیو بۆزانە ، توو بدە من سەعدوونێ برانە) ل ٣٥٨ ، تەنیا لەم سەرچاوەیەدا ناوی برایەکانی دەروێشی عەبدی دەهێنێ و لە سەرچاوەکانیدیدا ئەم ناوانە ناهێنێ .

٦) لە کتێبی (ستڕانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقێ) دا چەند ڕووداوێکی تێدایە کە لە کتێبەکانی تردا بەرچاو ناکەوێت ، بە کورتی ئەمانەن :

أ - نامەی (عەجیل ابراهیم)ی سەرۆکی گیسان بۆ زوڕ تەمر - پاشای سەرۆکی کیکان و ملان : هەر کە نامەکەی دەگاتێ شەپرزە دەبێ ، لەوکاتەدا (عەدۆلێ) دێتە دیوەخانو بەباوکی دەڵێ : بابە ئەتوو نازانی دەروێشی عەبدی بەقەد (١٥٠٠) سوارەو لە ناویان دەبات ل ٣٥٥ .

ب - نامەی عەدۆلی بۆ دەروێشی عەبدی : ئینجا زۆر تەمر پاشا بە عەدۆلی دەڵێ کە نامەیەکی بۆ بنووسێ تاوەکوو بە هانایان بێت ل ٣٥٦ .

جـ - هاتنی دەروێشی عەبری بۆ دیوەخانی زۆر تەمر پاشا : هەرکە دەروێش نامەکەی دەگاتێ ، ئۆقرەی لێ هەڵدەگیرێو داوا لە دایکو باوکی دەکات کە برایەکانیشی لەگەڵ بنێرن ل ٣٥٦-٣٥٧

د - لێرەدا وا بەدیار دەکەوێ کاتێ خۆی باوکی دەروێشی شوانی زۆر تەمر پاشا بووەو لە شەڕێکدا دەورێکی باشی بینیوەو لە ئەنجامدا بە دزی دەرهێناوەو دەری کردووە ، بۆیە باوکی دەروێش ڕای لەم چوونەی نییە ، بەڵام دەروێش لەگەڵ برایەکانی دەچێ بۆ دیوەخانی زۆر تەمر پاشا ل ٣٥٨-٣٥٩ .

هـ - عەدۆلێ کە قاوەی دەگێرێ : هەرکە دەروێش گەیشتە دیوەخان ، عەدۆلێ سینەك قاوەی گێڕاو بەلای پاڵەوانەکاندا چوو کەس لێی وەرنەگرت ، چونکە ئەوەی وەری بگرتایە دەبایە بچێتە مەیدانی شەڕ ، کەچی عدۆلێ چووە بەر دەم دەرویش‌و دەروێشیش دەستی بۆ فنجان بردو فڕی کرد . ل ٣٥٩-٣٦١ .

و - ڕژانی دلۆپێ قاوە بەسەر چمکی عەبای دەروێشدا : کە عەدولێ قاوەی دەگێڕا ، دلۆپە قاوەیەکی لێ ڕژاو کەوتە سەرعەبای دەروێشی عەبدی‌و بۆ پاککردنەوەی عەدۆلێ حەفت قالب سابوون لە حەفت شاران دەکڕێ‌و هەتا ئاوێ ڕووبار چلك دەکات عەبایەکە دەشواو بەڵام هەر ماکەکەی پێوە دەمێنێتەوە . ل ٣٨٢ .

ز - چوونی دەروێش بە دوای دوژمندا : دەروێش سواری ئەسپەکەی دەبێ‌و دەیەوێ بزانێ ژمارەی دوژمن چەندەو لە کوێنە ؟ لە ڕێگا تووشی پیرێك دەبێ‌و لە ئەنجامدا باپیرە دەزانێ مەبەستی دەروێش چییەو پێی دەڵێ : کوڕم تۆ لە پێناوی زۆر تەمر پاشا خۆت بە کوشت مەدە ، چونکە کاتی خۆی باوکتی دەرکردووە ، بەڵام دەروێش گوێ : باپیرە من نەمەکی زۆر تەمر - پاشام کردووەو لێی پەشێمان نیمە . ل ٣٦٤ .

٧) هەتا ئێرە لە ناوەرۆکی لاوکەکەمان پشکنی‌و وێکچوون‌و جیاوازییەکانمان دەست نیشان کردن ، بەڵام دەربارەی ڕوخساری لاوکەکە هێشتا هیچمان نیشان نەداوە .

## ڕوخساری لاوکەکە

هەر چەندە لاوکەکە لە سەرەتادا بە شێوەی کرمانجی سەروو گوتراوە (چونکە شوێنەکەی ئەوێ بووە) بەڵام لە هەر ناوچەیەکی کوردستاندا گوترابێ کەم‌و زورێك ووشەی ئەو ناوچەیەی تێکەوتووە ، تەنیا لە کتێبەکەی ئوردووخانی جەلیلدا لاوکەکە زۆر درێژەو بە شێوەی کوردی سۆڤیەت نووسراوەو زۆر ووشەی وای تێدایە کە نەخوێندەواری کورد بگرە زۆربەی خوێندەوارینی هەر تێی ناگەن ، کەچی لە شێوەکانی تردا هەرچەندە جیاوازە بەڵام تواناى تێگەیشتنی لێبەدی دەکرێت ، وە ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر ووشەکاندا هاتووە ئاسان‌و سەرەکی نینە ، زۆربەی دەنگی (ڤ) لە کرمانجی سەروو بووەتە (و) لە خواروو ، وەکو ئەم نموونانەی خوارەوە (داربناڤ ، ئاڤ ، ناڤ ، لناڤ ، ل ، ب) بوونەتە (دار بناو ، ئاو ، ناو ، لەناو ، لە ، بە) .

### پەراوێزەکان

(١) جەلال مەلا حەسەن خۆشناو . لاوك ، ل ٢١-٢٢

(٢) ئوردووخانی جەلیل ، ستڕانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقێ ، ل ٣٥٣ - ٣٨٢ .

(٣) ئەسعەد عەدۆ ، ئەفسانە . . لاوك . . گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا ل ٧١-٨٠ .

(٤) محەممەدی مەلا کەریم ، کۆمەڵێك لاوك‌و حەیران ، ل ٩ - ١٥

(٥) ئەم دەستنووسەم لە حەوێزی جوکل ئاغا وەرگرت لە ١٩٨٥

(٦) ئەمە بە پێچەوانەی هەموو سەرچاوەکانە ، چونکە عەدلە کچی زوڕتەمر - پاشای ملیە .

(٧) خدرێ سلێمان کە ڕەدی کتێبەکەی ئەسعەد عەدۆ دەداتەوە . ناوی کتێبەکەی تۆمار نەکردووەو تەنیا لە پەراوێزیشدا هێمای بۆ ناکات ، جا نازانم سووچی خۆیەتی یان لە بیرکراوە ؟ ئەمەش ناوی کتێبەکەیە : ئەفسانە . . لاوك . . گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا چاپخانەی ڕۆشنبیری‌و لاوان ، چاپی یەکەم ، هەولێر ١٩٨٧

(٨) لێرەدا بە ئاشکرایی بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە (بەز ، بکوژ) ناوی بکەرن‌و ووشەی ڕەسەنن ، وە ئەو نووسەرانەی کە (بنووس)یان لە جیاتی (نووسەر) بەکار هێناوە ڕاستیان پێکاوەو بە هەڵەدا نەچوونە ، چونکە دەق فولکلوری هەنجەنی کەس ناهێڵێ .

(٩) ئوردووخانی جەلیل ، ستڕانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقێ ، ل ٤٨٧ .


### سەرچاوەکان

(١) دەستنووسەکەی لای خۆمان

(٢) محەممەدی مەلا کەریم ، کۆمەڵێك لاوك‌و حەیران ، چاپخانەی شەفیق . بەغدا ١٩٦٨ز .

(٣) ئوردوخانێ جەلیل . ستڕانێ زارگوتنا کوردایە تاریقێ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد . بەغدا ١٩٧٧ز

(٤) جەلال مەلا حەسەن خۆشناو ، لاوك چاپخانەی ئەسعەد . بەغدا ١٩٩٠ ز .

(٥) ئەسعەد عەدۆ . ئەفسانە . . لاوك . . گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا . چاپخانەی ڕۆشنبیری‌و لاوان هەولێر ١٩٨٧ز .

(٦) خدرێ سلێمان «لاوکێ بەهارا خەتاری‌و ڕوونکردنەوەیەك» . گۆڤاری کاروان . ژمارە ٦٧ ساڵی ١٩٨٨ .

